## ئێرنست هێمنگوای

# ماڵئاوایی لە چەک



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

زنجیرەی رۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی خانزاد، هەولێر

س. پ. ژمارە: ١

www.araspublisher.com

## ئێرنست هێمنگوای

# ماڵئاوایی لە چەک

## عەبدولخالق ئەحمەد عەزیز

لە ئینگلیزییەوە کردوویەتی بەکوردی



ناوی کتێب: ماڵئاوایی لە چەک- ڕۆمان
نووسینی: ئێرنست هێمنگوای
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: عەبدولخالق ئەحمەد عەزیز
پێداچوونەوە و بەراوردکردنی: ئازاد حەمە شەریف
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ١١٨
پیت لێدان: ئاراس ئەکرەم
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
دەرهێنانی بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
نووسینی بەرگ: خۆشنووس محەمەد زادە
هەڵەگری: دلاوەر صادق ئەمین + شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمان مەحموود
تیرێژ: ١٦٠٠
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٢
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (١١)ی ساڵی ٢٠٠٢ی دراوەتێ

ئەم ڕۆمانە لەم دەقە ئینگلیزییەوە کراوە بەکوردی:
ERNEST HEMINGWAY
**A FAREWELL TO ARMS**
CHARLES SCRIBNER'S SONS, 1969.
NEWYORK

## 1

لە ئاخیروئۆخری هاوینی ئەو ساڵەدا، لە خانووی گوندێ دەژیاین کە بەرامبەر ئەو ڕووبار و دەشتەی بن چیایەکە بوو، دەوئاوی ڕووبارەکە پڕ پلووکە بەرد و خڕکە بەرد بوو کە لەبەر تیشکی ڕۆژ سپی و وشک هەڵگەڕابوون، ڕووبارەکە ڕوون و تیژڕەو بوو، لە جۆگەکان شین دەچۆوە. لەشکر لە نزیک خانووەکەوە ڕەت بوون، لە ڕێگاکە بەرەو خوار چوون، تۆزی ژێر پێیان بڵند دەبووەوە و دەنیشتەوە سەر پەلکی دارەکان. قەدی دارەکان یەکجار تۆزاوی بوون و ئەمساڵ پەلکەکانیان زوو هەڵوەراند و ئێمەش پێڕەوی لەشکرمان دەبینی بەو ڕێگایە ڕەت دەبوو. ئەو تۆزەی لەژێر پێیان بڵند دەبوو دەنیشتە سەر پەلکی دارەکان و بەشنەی با دەلەرانەوە و هەڵدەوەرین. پاش ڕەتبوونیان ڕێگا چۆلوهۆل بوو و سپی دەچۆوە، لە گەڵا بترازێ چی دی لێ نەبوو.

ئەو دەشتە پڕ بەروبووم بوو، چەندین ڕەزی مێوی لێ بوو، لە پشت دەشتەکە چیای ڕووتەن و قاوەیی قیت ببوونەوە، لەو چیایانەدا شەڕ هەڵگیرسابوو و شەوان بریسکەی تۆپەکانمان دەدیت، لەناو تاریکی شەودا دەتگوت هەورەتریشقەی هاوینەیە، بەڵام شەوەکان فێنک بوون هیچ نیشانەی تۆف و ڕەشەبای لێ بەدی نەدەکرا.

جار وابوو لە تاریکیدا گوێمان لە خشەی پێی سەربازەکان دەبوو کە لە نزیک پەنجەرەوە ڕەت دەبوون و تراکتۆریش تۆپەکانیان بەدوای خۆیان ڕادەکێشا، بەشەو هاتوچۆیەکی گەرم هەبوو و چەند هێستریک بەڕێگادا دەچوون و سندووقی چەک و جبەخانەیان لێ بارکرابوو. ئۆتومبیلە بۆرەکان سەربازەکانیان هەڵگرتبوو ئۆتومبیلە بارکراوە بەخیوەت داپۆشراوەکانیش بەهێواشی بەڕێگا جەنجاڵەکەدا ڕەت دەبوون. تۆپی گەورەشیان تیادا هەبوو بەتراکتۆر ڕادەکێشران. لوولە درێژەکانی تۆپەکانیش بەلقی سەوز داپۆشرابوون. لقەدار بەپەلکەوە لەگەڵ دارمێو بەسەر تراکتۆرەکان دادرابوون، لەلای باکورەوەش، لەو بەرەوە دۆڵێک دەبینرا و دارستانێکی شابەڕوو لەوێ بوو، لە پشت ئەوێوە چیایەکی تر لەو بەری ڕووبارەکەوە دیار بوو.

شەڕ لەسەرگرتنی ئەم چیایەش کرابوو، بەڵام هیچ بەهیچ نەکرابوو. پایزێ لەگەڵ باران بارین گەڵای دارستانی شابەڕووەکە هەڵوەری و لقەکان ڕووت ببوونەوە، قەدیشیان ڕەش داگەڕابوون، ڕەزەکانیش بێ هێز ببوون و لقەکانیان ڕووت ببوونەوە، سەرتاپای گوندەکە بەو پایزە تەڕ و قوڕاوی و بێ گیان مایەوە. سەر ڕووبارەکە تەم دایگرتبوو و پەڵە هەوریش سەر چیاکانی گرتبووە باوەشی خۆی، ماشینەکانیش قوڕاویان بەسەر ڕێگاکەدا پەرت دەکرد و سەربازەکانیش لەشیان هەتا تەوقی سەریان قوڕاوی بوو و بگرە تفەنگەکانیشیان تەڕ ببوون.

هەر یەکێکیان دوو فیشەکدانیان لە پێشەوەی قایشەکانی خۆیان بەستبوو، ئەم ڕەختە بۆرەیان فیشەکدانی قورسی عەیار (٦،٥) ملمی تێدابوو. ئەمانە لەژێر





چاکەتەکانیان دەرپۆقیبوون. جا هەرکە بەسەر ڕێگاکەدا دەڕۆیشتن دەتگوت منداڵی شەش مانگییە و لەسکیاندایە.

ئۆتومبیلێکی بۆری بچووک بەتیژ تێپەڕی. ئەفسەرێ لەپێشەوە لەگەڵ لێخوڕەکە و هی تریش لە دواوە بوون. ئەم ئۆتومبیلە لە ئۆتومبیلێکی گەورە پتر قوڕاوی پەرت دەکرد. یەکێ لە ئەفسەرەکانی دواوە کە لە نێوان دوو جەنەراڵان دانیشتبوو زۆر بچووک و قوتەخنە بوو. لە تواناندا نەبوو ڕووی ببینی، تەنیا سەری کاسکێتەکە و پشتە باریکەکەی دیاربوو. ئەگەر ئۆتومبیلێ بەو خێرایەیە ڕەت ببایە. ئەوا ڕەنگ بوو پادشای لەناو بوایە. کە لە ئۆدین دەژیا و نزیکەی هەموو ڕۆژ دەهاتە ئێرە تا لە نزیکەوە ئاگاداری ڕووداوەکان بێ، کە بەرەو خراپی دەچوو، لە سەرەتای زستانەوە بارانێکی زۆر باری و نەخۆشی کولێرای لەگەڵ خۆی هێنا. پاش ئەوەی تەنیا حەوت هەزار سەربازی بەمەرگ شاد کرد قەلاچۆ کرا.

## 2

ساڵی ئایندە سەرکەوتنمان زۆر بوو، چیایەکەی ئەو دیوی دۆڵ و لاپاڵی گردەکە، کە دارستانی شابەڕووی لێ ڕوابوو، داگیرکرا، لەو دیو دەشتەکەی بانەکەی باشووریش سەرکەوتن بەدەست هێنرابوو. لە مانگی ئابدا لە ڕووبارەکە پەڕینەوە لە خانوویێک لە گۆریزیا ئۆقرەمان گرت، کە کانییەک و چەند درەختی سێبەردار دەوری باخچەکەی دابوو، لایەکی دیوارەکە ڕووەکی (وێستیریای) ئەرخەوانی بەسەر هەڵگەڕابوو. شەڕ لە چیاکانی دیکەش هەڵگیرسابوو، کە هەر میلێک لەوێوە دوور دەبوو. ئەوێ شارێکی خۆش بوو خانووەکەی ئێمەش زۆر چاک بوو. ڕووبارەکە بەتەنیشتمان تێپەڕ دەبوو، شارەکە زۆر بەجوانی داگیرکرابوو، بەڵام نەتوانرا چیاکانی دواوە داگیر بکرێ. من زۆر دڵخۆش بووم بەوەی نەمساوییەکان هەندێ جار ئارەزووی گەڕانەوەیان بۆ شار هەبوو، ئەگەر شەڕ کۆتایی بێ!، چونکە بەهیچ جۆرێ شارەکانیان بۆردوومان نەکرد تا کاولی بکەن، بەڵام تەنیا هەندێ جێگایان بۆ مەبەستی سەربازی خۆیان دەکوتایەوە.

خەڵک لە شارەکەدا دەژیان چەند نەخۆشخانە و چایخانە و تۆپی تیابوو لەلایەکی شەقامەکاندا بەقیتی داندرابوون. دوو سۆزانیخانەشی تیابوو یەکیان بۆ ئەفسەران ئەوی تریش بۆ سەربازان. لەگەڵ کۆتایی هاوین، شەوە فێنک و چیاکانی ئەو دیو شارەکە، پردە ئاسنینەکەی شەمەندەفەر کە جێی گوللەتۆپەکانی پێوە بوو، وێڕای تۆنێلەکەی تەک ڕووبارەکە کە لەئەنجامی شەڕێک تەپابوو، درەختەکانی دەوری گۆڕەپانەکە و ڕێگا درێژە بەدرەخت داپۆشراوەکە کە بەرەو گۆڕەپانەکە دەچوو، ئەمانە و کچانی شار و، تێپەڕبوونی پادشاش بەئۆتومبیلەکەی کە جار بەجار ڕوومان دەدیت بەخۆ و لاشە بچووکە مل درێژەکەی و ڕیشە خۆڵەمێشییە بزنانییەکەی. ئەم هەمووانە و دەرکەوتنی ناو ژووری خانووەکان کە بەبۆردوومان لادیواریان ڕووخابوو و پارچە لەبخ و

پەلە بەردی لەناو باخچە و سەر جادەکانت دەدیت. بەڕێوەچوونی هەموو شتێ بەرێکوپێکی لە (کارسۆ) وای لەو پایزە کرد کە بەتەواوی لەگەڵ پایزی پاردا کە لە گوند دەژیاین جیاوازی هەبێ. هەروەها شەڕیش سارد ببووەوە.

دارستانی داربەڕووەکانی سەر چیاکەی پشت شارەکە فەوتا، ئەو هاوینەی هاتینە شارەکە دارستانەکە سەوز بوو، بەڵام ئێستا لە کۆلکەدار و قەدە شکاوەکان و زەوییەکی هەڵدڕاو بەولاوە هیچی تر نەبوو. لە ڕۆژێکی کۆتایی پایزدا کە چووبوومە دارستانی بەڕووەکەوە، هەور سەر چیاکەی گرت، زۆر بەتیژی هات، خۆر ڕەنگی بووە زەردێکی تەڵخ. دوای ئەمە هەموو شتێ بۆر داگەڕا، هەور ئاسمانی داپۆشی لە چیاکان وەرهات و کوتوپڕ تووشی بەڵا هاتین بەڵای بەفر داکشا، زەوییە ڕووتەی داپۆشی کۆلکەدارەکان سەریان قیت دەرچووبوو، لەسەر تۆپەکانیش کەوتبوو. چەند ڕێچکەیەک لەناو بەفرەکەدا هەبوون بەرەو ئاودەسەکانی پشت سەنگەرەکان چووبوون.

جارێکی تر، کە دابەزیمە شار، تەماشای بەفر بارینم کرد، لە پەنجەرەی سۆزانیی ئەفسەرەکانەوە سەیری دەرەوەم دەکرد، کە لەگەڵ برادەرێکم دانیشتبووم، دوو پێک ئارەق و قاپێ (ئاستیمان) لەبەردەم بوو، لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەم دەکرد، بەفر هێواش و کلۆ کلۆ دەباری، ئیتر زانیمان هەموو شتێ بەگوێرەی ئەوێ ساڵێ بەسەرچوو.

چیاکانی سەرەوەی ڕووبارەکە دەستیان بەسەردا نەگیرا، هیچ چیایێ لە دواوەی ڕووبارەکەوە داگیر نەکرا. هەمووی بۆ ساڵی داهاتوو بەجێهێڵران. هاوڕێکەم چاوی بەقەشەی خۆمان کەوت، بەبەر پەنجەرەکەوە لەسەر شەقامەکەدا، زۆر بەوردی بەناو بەفراودا دەڕۆیی. هاوڕێکەم تەقەی لە پەنجەرەوە هێنا تا سەرنجی بۆ لامان ڕابکێشێ. قەشە سەری هەڵبڕی، چاوی بەئێمە کەوت، بزەیەکی هاتێ؛ هاوڕێیەکەم هێمایەکی بۆ کرد تا بێتە ژوورەوە. قەشە سەری لەقاند و لە ڕۆیین بەردەوام بوو. ئەوێ شەوێ هەڕشتەمان هەبوو، هەمووومان پێکەوە بۆی دانیشتین، هەر یەکێکمان زۆر بەپەلە و بەتامەزرۆیی هەڕشتەکەمان دەخوارد، بەچەنگاڵ بەرزمان دەکردەوە تا داو داوە بەم لاو بەولای چەنگاڵەکەوە دادەهاتە خوار و پاشان بۆ ناو دەممان شۆڕمان دەکردەوە، یاخود بەرە بەرە بەرزمان دەکردەوە و لەناو دەمماندا دەمانمژی، هەر کەسە بۆ خۆی مەی لە کەمۆڵە کالۆنییە بەگیا داپۆشراوەکە تێ دەکرد، کە لە ناو جۆلانەیەکی کانزایی دەهەژایەوە. هەریەکەمان بەپەنجەی دۆشاومژە کەمۆڵەکەمان دادەهێنایەوە. مەیەکە، سوور و بێگەرد و نازدار بوو کە ڕوودەکرا ناو پەرداخەکەوە، بەهەمان دەست پەرداخەکەمان هەڵدەگرت. پاش نانخواردن کاپتن پەلاری لەقەشە گرتن، کاپتنی هاوڕێم ڕووی لە قەشە کرد، قەشە جاحێڵ بوو و زوو شەرم دایدەگرت، وەکو ئێمە جلی سەربازی کردبووە بەر، بەڵام خاچێکی سووری تۆخی مەخمەڵی لە سەرەوەی گیرفانی چاکەتە بۆرەکەی بوو، کاپتن، لەبەر خاتری من، هەرچەندە جێی گومانیشە، بەئیتاڵییەکی لەنگە دوا تا بەتەواوی تێبگەم و هیچم لە دەست نەچێ.





کاپتن: «قەشە ئیمڕۆ لەگەڵ کچان بوو.»

وای گوت و سەیری من و قەشەی دەکرد. قەشە شەرم دایگرت، بزەیەکی هاتێ و سوور هەڵگەڕا و سەری خۆی لەقاند. ئەم کاپتنە زۆر جاران پەلاری لەقەشە دەدا.

کاپتن لێی پرسی: «وا نییە؟ قەشە ئەمڕۆ لەگەڵ کچان نەبووی؟»

قەشە: «نەخێر.»

ئەفسەرەکانی تریش هەوەستیان بەگاڵتە دەهات. کاپتن بەردەوام بوو گوتی:

«قەشە، خوا هەڵناگرێ، لەگەڵ کچان نەبوو، هەرگیز لەگەڵ کچان نییە!.»

بۆ منی ڕوون کردەوە، پەرداخەکەمی برد و پڕی کرد و تەماشای نێو چاوی دەکردم، بەڵام چاوی لە قەشەش هەڵنەگرت.

–«قەشە هەموو ئێوارەیێ یەک بەپێنجانە.»

هەموو ئەوانەی لەسەر مێزەکە بوون پێکەنین.

– «تۆ تێگەیشتی؟ قەشە هەموو شەوێ یەک بەپێنجانە.» هێمایەکی کرد و بەدەنگی بەرز پێکەنی و قەشەش ئەمەی بەنوکتە وەرگرت.

مێجەر: «پاپا حەز دەکا نەمساوییەکان لەشەڕ سەرکەون، ئەو (فرانس جۆزیفی) خۆشدەوێ. ناحەقی ناگرم پارەی لەوێوە بۆ دێ من خوانەناسم.»

ئەفسەرێ لە قەشەی پرسی:

«ئەرێ تۆ کتێبی (بەرازی ڕەشت) خوێندۆتەوە؟ دانەیەکت بۆ دێنم. ئەم کتێبە بوو باوەڕی لەق کردم.» قەشە وەڵامی دایەوە گوتی:

«ئەمە کتێبێکی پیس و پڕوپووچە. تۆ لە ڕاستیدا حەز لەو کتێبە ناکەی.»

ئەفسەرەکە گوتی:

«زۆر بەسوودە... دەربارەی باسوخواسی قەشەکانە. دەکەوێتە بەردڵت.»

زەردەخەنەیەکم بۆ قەشە کرد ئەویش لە بەرامبەر ڕووناکی مۆمەکانەوە زەردەخەنەیەکی بۆ کردمەوە و گوتی: «تۆش نایخوێنیتەوە.»

ئەفسەرەکە گوتی: «بۆتی پەیدا دەکەم.»

مێجەر گوتی: «هەموو خاوەنبیرەکان خوانەناسن. هەرچەندەش من بڕوام بە(فڕی ماسون)ەوە نییە.»

ئەفسەرەکە گوتی:

«من بڕوام بە(فڕی ماسون)ەوە هەیە. ڕێکخراوێکی مەزنە.» لەو کاتەوە یەکێ هاتە ژوورێ. هەر کە دەرگایەکە کرایەوە بینیم بەفر دەبارێ.

گوتم: «بەفریش واهات ئیتر هێرش ناکرێ.»

مێجەر: «هەڵبەت هێرش نابێ. پێویستە تۆ مۆڵەت وەرگری و بچیتە ڕۆما، ناپۆلی،

سقلیە....»

ئەفسەرەکە: «پێویستە سەرێ لە (ئەمفیلی) بدەی. چەند کارتێکت پێ دەدەم. بۆ ماڵەوەمانی ببەی. کە لە (ئەمفیلی)ن. وەکو کوڕی خۆیان خۆشیان دەوێی.»

– «پێویستە بچیتە (پالیرمۆ).»

– «دەبێ بچیتە (کاپری).»

قەشە گوتی: «حەز دەکەم ئەبروزی ببینی و سەرێ لە ماڵەوەمان بدەی کە لە (کاپراکوتا)ن.»

– «گوێ بگرن. باسی (ئەبروزی) دەکا، ئەوێ بەفری لێرە زیاترە. ئەو نایەوێ جووتیاران ببینێ. وازبێنن بابچێتە ناو جەرگەی ڕۆشنبیری و شارستانییەت.»

– «دەبێ لەزەت لە کیژی شۆخ وەرگرێ. من ناونیشانی هەندێ جێگەی (ناپولی)ت دەدەمێ. کچی جوان و جاحێل. لەگەڵ دایکیان ها، ها، ها...»

کاپتن دەستی خۆی پان کردەوە، پەنجەی گەورەی لەسەرەوە بوو، پەنجەکانی تری پەرت کردن هەروەک بتەوێ سێبەری وێنەیێ دروست بکەی. سێبەری دەستی لەسەر دیوارەکەوە بەدیارکەوت. ئەمجارەش بەئیتاڵییەکی لەنگە دەستی بەقسە کرد، گوتی: «تۆ وەکو ئەمە دەڕۆیت.»

دەستی بۆ پەنجەی گەورە درێژ کرد.

«وەکو ئەمەش دەگەڕێیتەوە.»

پەنجە تووتەی خۆی گرت هەموویان پێکەنین.

کاپتن گوتی: «سەیرکە.» دەستی خۆی دیسان پان کردەوە. ئەمجارەش ڕووناکی مۆمەکە سێبەری دەستی لەسەر دیوارەکەوە دروست کردەوە. پەنجەی گەورەی قیت کردەوە. دەستی پێکردەوە ئینجا ناوی چوار پەنجەکەی تری برد و گوتی:

«سۆتۆتێنیتە، تێنیتە، کاپتینۆ، ماگیورۆ، تێنیتە کولونالۆ. تۆ وەکو سۆتۆتێنیتە دەڕۆیت وەکو تێنیتە کولونیلۆش دەگەڕێیتەوە»(١).

هەموویان پێکەنین. کاپتن زۆر بەزمی سەرکەوتووی بەپەنجەکانی ساز دەکرد. سەیری قەشەی کرد و هاواری کرد (هەموو شەوێ یەک بەپێنجانە) دیسان هەموویان پێکەنین.

مێجەر: «پێویستە هەر ئێستا مۆڵەت وەرگری.»

ئەفسەرەکە: «زۆر حەزم دەکرد لەگەڵت بهاتبام و هەندێ شتم نیشان دابای.»

– « کە گەڕایتەوە ئامێرێکی قەوانمان بۆ بێنە.»

(١) ناوی پەنجەکان بەم شێوەیە یەک لەدوای یەک «پەنجەی گەورە، دۆشاومژە، بالابەرزە، براتووتە، تووتە.» ئەم ناوانەم نەکرد بەکوردی چونکە چێژی ئەم یارییە لەناوە ئیتاڵییەکەیەتی واتە تۆ ئێستا ئەفسەری (تێنیتە)ی تا دەگەڕێنەوە دەبیت بەکولونیل.»





– «قەوانی خۆشترین ئۆپرا بێنە.»

«کارسۆ بێنە.»

– «نا کارسۆ مەهێنە. ئەو دەنەڕێنێت.»

– «تۆش حەز ناکەی وەکو ئەو بنەڕێنی.»

– «ئەو دەنەڕێنی پێم گوتی ئەو دەنەڕێنی.»

لەناو قاژ و قیژی ئەوانەوە بوو قەشە گوتی: «حەز دەکەم بچیە ئەبروزی. لەوێ نێچیری باش هەیە. خەڵکەکەت دەکەوێتە بەر دڵ. هەرچەندە ساردە بەڵام سووەکەی ساف و وشکە. دەتوانی لەگەڵ ماڵەوەمان بمێنیتەوە. باوکم ڕاوکەرێکی بەناوبانگە.»

کاپتن: «بابڕۆین. بەرلەوەی سۆزانیخانەکان داخرێن.»

بەقەشەم گوت: «شەو شاد.»

گوتی: «شەو شادتر.»

## 3

کاتێ گەڕامەوە بەرەی جەنگ هەر لە شارەکە بووین. ژمارەی تۆپەکانی دەوروبەری شار لە جاران پتر ببوون، بەهاریش داهاتبوو. ڕەزەکان سەوز بوون و لقی دارمێوەکانیش پۆقژەیان دابوو، درەختەکانی ئەملاو ئەولای ڕێگاش گەڵای بچووکیان دابوو، کزەبایەکیش لەدەریاوە دەهات. شارەکە و گرد و قەڵا کۆنەکەی سەرەوەم بینی لەناو باوەشی ئەو ڕیزە گرد و چیاکەی ئەو دیو دابوو؛ چیاکان بۆر دەچوونەوە و پەڵەیەکی سەوز لە لاپاڵیان دیاربوو. ژمارەی تۆپەکان لەشارەکەدا لە جاران پتر ببوون، چەند نەخۆشخانەی تازەشی تیا دروست کرابوو. لە شەقامەکاندا تووشی سەربازی بەریتانی، جارجارەش ئافرەتی بەریتانی دەبووین. چەند خانووێکی تریش بەر ئاگری تۆپ کەوتبوون. ئەوێ ڕۆژێ دنیا گەرم بوو، هەر دەتگوت بەهارە، منیش بەکۆڵانێ کە هەردوولای دارودرەخت بوو، شۆڕ بوومەوە، دیوارەکە بەهەتاو گەرم داگەڕابوو. بۆم دەرکەوت کە ئێستاش هەر لەهەمان خانوودا دەژین، هەموو شتێ چۆن لەو کاتەوە بەجێم هێشت وەکو خۆی بێ دەسکاری ماوەتەوە. دەرگاکە لەسەر پشت بوو. سەربازێکم بینی لەسەر ئەسکەملی دەرەوە لە بەربەرۆشک دانیشتبوو، ئوتومبیلێکی فریاگوزاری لەلای دەرگای تەنیشت و بەر دەرگاوە ڕاوەستابوو.

کاتێ چوومە ژوورەوە بۆنی کاشییە مەرمەڕییەکانی نەخۆشخانە هات، هەموو شتێ چۆن بوو هەر وا مابوو. تەنیا ئەوە نەبێ ئێمە وا لە بەهاراین. لە دەروازەی ژوورە گەورەکەوە سەیری ژوورەوەم کرد.

مێجەرم بینی لەسەر مێزەکەی دانیشتبوو، پەنجەرەی ژوورەکە کرابووەوە، تیشکی

هەتاوی پێدا دەهاتە ژوورەوە. ئەو منی نەبینی، منیش دوودڵ بووم کە ئایا بچمە ژوورەوە ڕاپۆرتی پێشکەش بکەم وەیا بۆ قاتی دووەم سەرکەوم و خۆم بشۆم و جلەکانم ڕێکخەم... لە دواییدا بڕیارم دا وەسەرکەوم. ئەو ژوورەی من و ڕینالدی تیایدا دەژیاین بەسەر دەوراوپشتی دەشتەکەیدا دەڕوانی. پەنجەرەکەی کرابوونەوە، تەختەکەم ڕێکوپێک بوو بەپەتو داپۆشرابوو، شتەکانم بەدیوارەکەوە هەڵواسرابوون و دەمامکە گازەکەم لەناو تەنەکەیەکی لاکێشەییدا بوو، تاسە کڵاوەکەم هەر بەسەر هەمان سنگۆلکەوەوە بوو، باولی جلکان و پۆتینە زستانییەکەم لەدامێنی تەختەکەم بوون، پۆتینەکەم لەبەر بۆیاخەکەی دەدرەوشایەوە لەسەر باولەکە دانرابوون. تفەنگە دوورپێکەرە نەمساوییەکەشم بەلوولە مەیلەو شینە هەشت لایەکە و قۆنداخە دەرپەڕیوە ڕێکوپێکە لەدارگوێز دروستکراوەکەی بەسەرەوەی هەردوو تەختەکەوە بەدیوارەکەوە وەکرابوون. دێتە بیرم دووربینەکەش لەناو باولە کلیلدراوەکەدا بوو. ڕینالدی لەسەر تەختەکەی تر خەوتبوو، کە گوێی لەدەنگی پێم بوو خەبەری بووەوە، هەستایەوە و گوتی:

«چاوو[(١)]، چۆنت ڕابوارد؟»

– «یەگجار خۆش»

تەوقەمان کرد و دەستی لەمل کردم و ماچی کردم.

گوتم: «ئۆف»

گوتی: «تۆ دژونی پێویستە خۆت بشۆی. بۆ کوێ چووی؟ چیت کرد؟ هەر یەکسەر هەموو شتێکم بۆ بگێڕەوە.»

– «چوومە هەموو شوێنێ میلانۆ، فلورەنس، ڕۆما، ناپۆلی، فیلاسان، گیوڤانی، مێسینا، تۆڕمینا...»

«وەکو خشتە لەبەرت کردووە، ئەرێ جەربەزەییت کرد؟»

– «بەڵێ»

– «لە کوێ؟»

– «لە میلانۆ، مرتری، ڕۆما، ناپۆلی...»

– «بەس، بەڕاستی پێم بڵێ کامیان لە هەموویان باشتر بوو.»

– «ئەوەی میلانۆ.»

– «چونکە ئەوە بەرایی بوو. ئەوت لە کوێ بینی؟ لە کۆڤا؟ بۆ کوێ چوون؟ هەستتان بەچی کرد؟ هەموو شتێکم پێ بڵێ. هەموو شەوێ لەگەڵی مایتەوە؟»

– «بەڵێ.»

(١) چاوو: وشەیەکی ئیتاڵییە واتە ڕۆژباش. لە ئینگلیزییەکە وا نووسراوە بۆیە نەمکردووە بەکوردی.





– «ئەمانە هیچ نین. لێرە کچی جوانمان هەنە. کچی جوان کە پێشتر نەهاتوونە بەرەی جەنگەوە.»

– «نازدارە!»

– «بڕوام پێ ناکەی؟ هەر بەم پاش نیوەڕۆیە دەچین. ئەوجا دەبینی لەشاردا کچی ئینگلیزی جوانمان هەیە. ئێستا من کەوتوومەتە داوی ئەوینی بارکلییەوە. دەتبەم بۆ سەردانیان. لەوانەشە بارکلی بخوازم.»

– «پێویستە خۆم بشۆم و ڕاپۆرتەکەم بنووسم. ئێستا کەس لە ئیشدا نییە؟»

– «لەو کاتەوە کە تۆ ڕۆیشتی هیچ شتێکی وامان نەبووە، تەنیا سەرمابردی، دەست و پێ شەقبوون لەساردی، زەرتک، سۆزەنەک، برینی لە خۆوە، دەردەباریکە و وشکە برینی ناو گەڵان. لە هەموو هەفتەیەکیشدا یەکێ بەتلیشەبەرد هەر بریندار بووە، کەمێ برینداری شڕیشمان هەبووە. وە لە هەفتەی داهاتوودا شەڕ دەست پێدەکاتەوە، لەوانەیە دەست پێبکاتەوە. وا دەڵێن. ئایا خوازبێنم بۆ بارکلی پاش شەڕ بەچاک دەزانی؟»

ئاوم لە تەشت دەکرد و گوتم:

– «زۆر چاک.»

ڕینالدی گوتی: «ئەمشەو دەبێ هەموو شتێکت پێ ڕابگەیێنم. ئێستا دەچم سەرخەوێ دەشکێنم تا بۆ بارکلی تاسولووس بم.»

منیش کورتەک و کراسەکەمم لەبەرکردەوە، بەئاوی ساردی ناو تەشتەکە خۆم شوشت. کاتێ خۆم بەخاولی وشک کردەوە، چاوێکم بەژوورەکە خشان، لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم کرد، سەیری ڕینالدیشم کرد، ئەو لەسەر شوێنەکەی خۆی پاڵکەوتبوو. چاوی خۆی لێکنابوون، زۆر جوان دەهاتە بەرچاو، هاوتەمەنم بوو، لە (ئەمالفی)یەوە هاتبوو حەزی لە نژادری دەکرد، زۆر برادەری یەکتری بووین. لەو کاتەی سەیرم دەکرد چاوی خۆی هەڵێنا.

«پارەت هەیە؟.»

«بەڵێ.»

«پەنجا لیرم بەقەرز بدێ.»

دەستی خۆمم وشک کردەوە، جیزدانە بچووکەکەم لە گیرفانی کورتەکەکەم دەرهێنا، کە بەدیوارەکەوە هەڵواسرابوو. ڕینالدی بێ ئەوەی لە جێگەی خۆی هەڵبستێتەوە لێی وەرگرتم، لە گیرفانی پانتۆڵی دانا، بزەیەکی هاتێ گوتی:

– «دەبێ وا بۆ بارکلی دەربخەم کە خاوەن پارە و تێرم، تۆ گەورەترین و باشترین برادەری و پەناگەی دارایی منی.»

گوتم: «بڕۆ جەهەنەم!.»

ئەوێ شەوێ، لەگەڵ هاوڕێیان کە نانمان دەخوارد، لەتەک قەشە دانیشتبووم، ئەو زۆر

نائومێد بوو لە پڕ هەستی بەئازار کرد. دڵ بریندار بوو، بەوەی نەچووبوومە ئەبروزی. بۆ باوکی نووسیبوو کە من دەچمە ئەوێ باوکیشی تەدارەکی پێشوازیکردنمی ئامادە کردبوو. منیش بەقەدەر ئەوەوە پەشیمانی دایگرتم وە خۆشم تێنەگەیشتم بۆ نەچووم. خۆم نەمویست بچم وە هەوڵم دا ئەوە ڕوون بکەمەوە، لەبەر ئیشێک دەبوایە ئیشی تر بکەم لە کۆتاییدا هاتە ڕایێ و لێم تێگەیشت کە بەڕاستی ویستوومە بچم، بەوە هەموو شتێ گەڕاوە باری جارانی. زۆرم خواردبووەوە پاشان قاوە و (ستریگا)م خواردەوە. بەسەرخۆشی ئەوەم ڕوون کردەوە کە چۆن ئەو شتانە ئەنجام نادەین، کە خۆمان دەمانەوێ. هەرگیز ئەو شتانە ناکەین.

هەردووکمان قسەمان دەکرد، ئەوانی تریش کەوتبوونە مشت و مڕەوە. پڕ بەدڵ ویستم بچمە (ئەبروزی)، من نەچوومە هیچ شوێنێ لەو شوێنانەی شەختە شەقامەکانی وەک ئاسن ڕەق کردبوو، ئەو شوێنانەی کە سارد و بێگەرد و هەوا وشک بوون و بەفریش وشک و پرووشەیی بوو شوێن پێی کەروێشکانی لەسەر دەبینرا. جووتیارەکانیش شەپقەکانیان لەسەر دەکردەوە و بەنازناوی (لۆرد) ڕێزیان لێ دەنای و نێچیری باشی لێ دەستگیر دەکرا. من نەچوومە هیچ شوێنێ لەو شوێنانە، بەڵکو چوومەتە خانە و مەیخانە بەدووکەڵ قانگدراوەکان؛ کە ژوورەکان لە پێش چاوت دەسووڕان، دەبووایە تەماشای دیوارەکەت بکردبایە تا ڕاتگرتبایە. شەوان بەسەرخۆشی لەنێو جێگا دەبووین و دەتزانی هەموو شتێک لەبەردەستایە. ئەو جۆشە نامۆیەیی کاتی واگاهاتنەوە بێ ئەوەی بزانێ کێت لەگەڵدا بووە، ئەم دونیایە ناڕاستەی کە لەناو تاریکیدا بەجۆرێ دڵبزوێنە کە بەبێ ئەوەی بزانیت و گوێی پێ بدەی بخرێتە باوەشی شەوانە و، ناچار دەبووی جارێکی دی سەرلەنوێ خۆت لەوە دڵنیا بکەیت کە ئەوە هەموو شتێکە لەو ژیانە و هەر گوێش بەهیچ نەدەیت. کوتوپڕ گرینگیت بەزۆر شت دەدا، بەنووستن، خەبەربوونەوە، لەگەڵ ئەم کردەوەیە، هەندێ جار بەیانیان، ئەو هەمووەی لەوێ بوونە ئۆغریان کردووە. هەموو شتێ توندوتیژ و ڕەق و ئاشکرایە، جار بەجار مشتومڕ لەسەر نرخ دەقەوما، هەندێ جاریش هێشتا خۆشی و خۆشەویستی و فێنکاتی و چاشت و فرەوینی تیابوو، هەندێ جاریش خۆشی نەدەما وا بەختیار دەبووی بچیتە سەر شەقامەکان. بەڵام هەردەم ڕۆژێکی تر دەستی پێدەکردەوە پاشان شەوی تری بەدواوە هەر دەهات.

ویستم دەربارەی شەو قسە بکەم و جیاوازی نێوان شەو و ڕۆژ دیاربخەم. ئەوە بڵێم چۆن شەو لە ڕۆژ چاکترە، هەرچەندە ڕۆژ لەشەو زۆر بێگەرد و سارترە. بەڵام نەمتوانی ئەوە بدرکێنم. هەروەکو ئێستاش ناتوانم باسی بکەم. بەڵام خۆ گەر تۆش شەوگاری وات بەسەر بردبێ تۆ دەزانی. ئەو شتی وای نەدیوە. بەڵام ئەو تێگەیشت کە لەڕاستیدا ویستوومە بچمە ئەبروزی، بەڵام نەچووم. ئێمە برادەری یەکتری بووین، لە زۆر شت زەوقمان وەکویەک لەگەڵێ شتیش لەیەکتری جیاین، ئەو هەردەم دەیزانی من چ نازانم





و، هەرکاتێ فێری بووم، توانای لە بیرکردنم هەیە. بەڵام ئەوەی نەمدەزانی پاشان فێری دەبووم. تا ئەو کاتە، کە هەموومان نانمان خوارد، جەمە نانەکە دوایی هات مشت و مڕ بەردەوام بوو، ئێمە هەردووکمان لەقسە وەستاین.

کاپتن هاواری کرد:

«قەشە بێ کەیفە، قەشە بێ کچ بێ کەیفە.»

قەشە: «بەکەیفم.»

کاپتن: «قەشە بێ کەیفە. قەشە دەیەوێ نەمساوییەکان سەرکەون.»

خەڵکەکە گوێیان بۆ کاپتن ڕادێرابوو.

قەشە سەری خۆی لەقاند و گوتی: «نەخێر»

– «قەشە دەیەوێ ئێمە هەرگیز هێرش نەکەین. ناتەوێ ئێمە هەرگیز هەڵمەت بەین؟ وانییە؟»

– «نەخێر، مادام شەڕ هەیە بەپێویستی دەزانم هەڵمەت بەین.»

– «دەبێ هێرش بەین، هەر هێرش دەبەین.»

قەشە سەری خۆی لەقاند.

کاپتن گوتی: «لێی گەڕێ، قسەکانی لە جێن.»

– «هەر چۆنێ بێ ئەو هیچی پێ ناکرێ.»

ئەمەی گوت و هەموو هەستانە سەر پێ و مێزەکەیان بەجێهێشت.

## 4

تۆپی ناو باخچەی تەنیشتمان بەیانی واگای هێنام و، تیشکی ڕۆژم بینی لە پەنجەرەوە دەهاتە ژوورەوە. چوومە بەر پەنجەرەوە تەماشای دەرەوەم کرد. ڕێچکە چەوڕێژەکراوەکە شێدار بوو گیاش بەخوناو تەڕ ببوو. تۆپەکە دووجار لرمەی هات، لەگەڵ هەر لرمەیێ هەوایەکی بەهێز هەڵی کرد و پەنجەرەکەی هەژاند و بەشی پێشەوەی بێجامەکەی پێکدادایەوە. تۆپەکانم لێ دیار نەبوون. بەڵام گوللەتۆپەکان ڕاستەوخۆ بەسەر سەرمان تێدەپەڕین. بوونیان لەوێ شتێکی ناڕەحەت بوو، بەڵام بەوە دڵمان خۆش بوو کە لە چەشنی زۆر گەورە نەبوون. کە سەیری دەرەوەم کرد، لەناو باخچەکە گوێم لەهاژەی ترێلەیەک بوو بەڕێگەکەدا دەڕۆیی، جلەکانم کردەبەر، دابەزیمە خوارەوە. هەندێ قاوەم لەناندین خواردەوە و چوومە گەراج. دە ئوتومبیل لەژێر پەسارگە درێژەکە ڕیز ببوون. ئەوانە ئوتومبیلی فریاگوزاری نەفرەجای لمووز پانی ڕەنگ بۆر بوون وەکو ماشینی بارهەڵگر دروست کرابوون. فیتەرەکان لە گۆڕەپانی گەراجەکە خەریکی چاککردنەوەی یەکێکیان بوون. سێی تریش لەسەر چیاکاندا لە نزیک بنکەی تیمارگەری بوون. لە

فیتەرێکم پرسی:

– «ئەرێ ئەوان قەت تۆپخانەکانمانیان کوتاوەتەوە؟»

– «نەخێر سینیۆر تێنیتە، ئەو گردە بچکۆڵەیە ئەوانی پاراستووە.»

– «ئیشتان چۆنە؟»

– «زۆر خراپ نییە. ئەم ئوتومبیلە باش نییە. بەڵام ئەوانی تر ئیش دەکەن.»

فیتەرەکە لەکار وەستا و زەردەخەنەیەکی هاتێ و گوتی:

«مۆڵەتت وەرگرتبوو؟»

– «بەڵێ.»

دەستی بەبەدلەکەیەوە سڕییەوە و گرژییەوە و گوتی:

« کاتێکی خۆشت ڕابوارد؟»

ئەوانی تریش گرژینەوە.

گوتم: «باش بوو. ئەرێ ئەم ئوتومبیلە چییەتی؟»

– «باش نییە، کونێکی دەگری، کونێکی تری تێ دەبێ؟»(1)

– «ئێستا چییەتی؟»

– «پێویستی بەڕینگی(2) تازەیە.»

بەجێیم هێشتن کار بکەن. ئوتومبیلەکە ڕووتکراو و بەتاڵ دیاربوو، مەکینەکەی کرابووەوە و پارچەکانی لەسەر دەزگای(3) ئیشکردن پەرتوبڵاو ببوونەوە، چوومە گەراجەکە، لەژێر پەسارگەکە یەکەیەکە سەیری ئوتومبیلەکانم کرد. تا ڕادەیێ چاک بوون، هەندێکیان تازە شوشترابوون، ئەوانی تریش تۆزاوی بوون، بەوردی چاوم بەتایەکانیان خشاند. تا بزانم چ جێیی دڕاوە یان بەرد هەڵی زڕاندووە. هەموو شتێ ڕێکوپێک بوو. ئەوەم بۆ دەرکەوت، کە لە لێرە بم یان لێرە نەبم هیچ جیاوازی نییە. بیرم لەدۆخی ئوتومبیلەکان و دەستکەوتنی پێداویستییەکانیان و ڕێکوپێکی گواستنەوەی برینداروەکان لەبنکەکانی بەرایییەوە بۆ بنکەکانی دواوە و دوای ئەمەش دابەشکردنیان بەسەر نەخۆشخانە دیارکراوەکانیان لەسەر ڕاپۆرتەکانیانم دەکردەوە. ئەمانە تا ڕادەیەکی زۆر لە ئەستۆی مندا بوون. ئاشکرایە بوون و نەبوونم هیچ گیروگرفتی پەیدا نەدەکرد. لە وەستای فیتەرەکانم پرسی:

«چی وای تێدا نەما تووشی دەردەسەریمان بکات؟»

(١) لە ئینگلیزییەکە دەڵێ شتی لەدوای شت پێویستە.

(٢) ڕینگ: مەبەست (ئەلقەیە) نەک Wheel.

(٣) دەزگا: مێزی ئیش کردن.





– «نەخێر، سینیۆر تێنیتە.»

– «وێستگای گازۆلین لە کوێیە؟»

– «هەر لەشوێن خۆیەتی.»

گەڕامەوە خانووەکە، فنجانێکی تر قاوەم لەسەر مێزی نانخواردن خواردەوە. ڕەنگی قاوەکە قاوەیییەکی کاڵ بوو. بەشیری پەیت شیرین کرابوو. لەودیو پەنجەرەکەوە بەیانییەکی خۆشی بەهاری بوو. سەرایی بۆنێکی وشک بەبەر کەپوومدا هات، ئەمەش وای بۆ دەرخستم کە ئەمڕۆ دونیا گەرم دەبێ. ئەو ڕۆژە چوومە بنکەکانی سەرچیا پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ گەڕامەوە شارەکە. هەر کە لەوێ نەبووم وا پێدەچوو هەموو شتێ بەڕێکوپێکی ڕۆیشتبێت. بیستم هێرش دەست پێدەکرێتەوە. ئەو تیپەی ئێمە خزمەتمان تیای دەکرد لەناوچە بەرزەکانی لای ڕووبارەکەوە دەست بەهێرش دەکا. کاپتن پێی گوتم دەبێ لەکاتی هێرش کردندا من چاودێری بنکەکان بکەم. وا دانرابوو کە لە شوێنێکی تەنگەبەری ڕووبارەکەوە بپەڕینەوە و لەناوچە گردەلانییەکان پەرتوبڵاو ببنەوە. ئوتومبیلەکانیش دەبوایە لەبنکە داپۆشراوەکان بپارێزرێن و لەنزیکترین شوێنی ڕووبارەکەوە بن. شتێکی ئاساییە، دەبوایە ئەم بنکانە لەلایەن پیادەوە دەستنیشان کرابان، بەڵام دەبوایە ئێمە ئیشەکەمان ڕاپەڕاندبایە. ئەم کارەش شتێ بوو لەو شتانەی وات لێ دەکەن کە هەستی ساختەیی سەربازی لەگیانت بڕسکێنێ.

زۆر پیس و دژون بووم. بۆ خۆشوشتن سەرکەوتمە سەرەوە. چوومە ژوورەکەم ڕینالدی لەسەر تەختەکەی دانیشتبوو، دانەیێ کتێبی (هۆگۆ)ی لەبارەی ڕێزمانی ئینگلیزییەوە بەدەستەوە بوو. جلی لەبەر کردبوو. پۆتینە ڕەشەکانی لە پێدا بوو، قژی دەبریسکایەوە. کە منی بینی گوتی:

«دەرفەتە، تۆ لەگەڵما دێی بۆ دیتنی بارکلی.»

– «نەخێر»

– «بەڵێ تکایە لەگەڵم وەرە و یارمەتیم بدە کاری تێبکەم.»

– «باشە، چاوەڕێ کە تا خۆم ڕێک دەخەم.»

– «خۆت بشۆ و هەر بەم جلانە وەرە.»

خۆم شوشت، قژم شانە کرد، کەوتینە ڕێ...

ڕینالدی گوتی:

«تاوێ چاوەڕێ کە، دەبێ سەرو پێک بخۆینەوە.»

باولەکەی کردەوە بوتڵێکی دەرهێنا. گوتم:

« خۆ، ستریگا نییە؟»

گوتی: «نەخێر، گراپایە.»

– «زۆر باشە.»

دوو پێکی تێکرد. هەڵمان گرتن. پەنجەی گەورەمان بەرز ببووەوە. گراپاکە زۆر بەهێز بوو.

«پێکێکی تریش.»

گوتم: «قەی ناکا»

سەرو پێکی دووەمی گراپامان خواردەوە.

«ڕینالدی بوتڵەکەی لەو لا دانا، لە پێبلکەکە دابەزینە خوارەوە. شار بۆ ڕۆیشتن گەرم بوو، خۆر خەریک بوو ئاوابێ. ئەمەش دیمەنێکی دڵکەرەوە بوو.

نەخۆشخانەی بەریتانی ڤێلایەکی گەورە بوو، ئەڵمانییەکان پێش شەڕ دروستیان کردبوو. بارکلی لە باخچەکەدا بوو. سستەرێکی تری لەگەڵا بوو. جلە سپییە یەک تەرزییەکانیانمان لە کەلێنی درەختەکان بینی. بەرەو لایان چووین. ڕینالدی سڵاوی لێ کردن، منیش بەنەرمی سڵاوم لێ کردن. بارکلی گوتی: «خۆشحاڵم بەدیدەنیت. خۆ تۆ ئیتاڵی نیت، وا نییە.»

– «ئۆه، نەخێر.»

ڕینالدی لەگەڵ سستەرەکەی تر کەوتبووە قسان و پێدەکەنین.

«شتێکی سەیرە! چۆنە لەناو سوپای ئیتاڵی دای؟»

– «لەڕاستیدا لە ڕیزی سوپا نیم. لەگەڵ تیپی فریاگوزاریم.»

– «زۆر سەیرە، ئەرێ بۆ ئەو کارەت هەڵبژاردووە؟»

– «خۆشم نازانم، هەمیشە هەموو شتێ ڕوونکردنەوەی نییە.»

– «ئۆ، چۆن هیچ نییە، وا تێدەگەم کە دەبێ هۆیێ هەبێ.»

– «ئەم قسەیەت زۆر تەواوە.»

– «دەتوانین بەم شێوەیە لە قسەکانمان بەردەوام بین.»

گوتم: «نەخێر»

– «ئەمە دەرفەتە. وا نییە؟»

لە بارکلیم پرسی: «ئەم گۆپاڵە چییە بەدەستەوەیە؟.»

بارکلی کچێکی تا بڵێی کەڵەگەت بوو، جلێکی وای لەبەر بوو، وای بۆچووم جلی سستەران بێ، قژ کاڵی بەڕوخسار ڕەنگ گەنم چاوەکانی خۆڵەمێشی بوون، زۆر جوان هاتە خەیاڵم، گۆپاڵێکی لە ڕیشەی دارخورمای (ڕاتان)ی[(١)] دروست کراو و لەچەرم گیراوی بەدەستەوە بوو کە لە قامچی بووکەشووشەی منداڵانی دەکرد.

(١) ڕاتان: جۆرە دارخورماییێکە لە ڕۆژهەڵاتی هیندا دەڕوێ.





– «ئەم گۆپاڵە یادگاری لاوێکە پار لە شەڕدا کوژراوە»

– «زۆر بەداخەوە.»

– «گەنجێکی کۆک بوو، بڕیار بوو بمخوازێ بەڵام لە شەڕی (سۆم)دا کوژرا.»

– «شەڕێکی توندوتیژ بوو.»

«لەوێ بووی؟»

– «نەخێر، تەنیا گوێم لێی بووە، هیچ شەڕێکی تری وەک ئەو شەڕە چەپەڵە لێرە ڕووی نەداوە. ئەوان ئەو گۆپاڵەیان بۆ ناردووم، دایکی لەگەڵ جل و بزگوڕی بۆی ناردووم.»

– «ماوەی دەزگیرانیتان زۆری خایاند؟»

– «هەشت ساڵ. ئێمە پێکەوە گەورە بووین.»

– «لەبەرچی زەماوەندتان نەگێڕا؟»

– «نازانم من گێل بووم، ئەگینا ئەمتوانی بەهەر جۆرێ بوایە ئەم کارەم ڕاپەڕاندبایە، لەو باوەڕەدا بووم کە ئاکامێکی خراپی بۆ ئەو ببێ؟»

«تێگەیشتم.»

– «کەست لەژیانتا خۆش ویستووە؟»

گوتم: «نەخێر.»

لەسەر سەندەلیێ دانیشتبووین. تەماشایم کرد. گوتم: «پرچت زۆر جوانە»

– «دڵت دەیگرێ؟»

– «زۆر زۆر»

– «کە جوانە مەرگ بوو خەریک بوو بەتەواوی بیبڕم.»

– «نەکەی بیبڕی.»

– «ویستم شتێکی بۆ بکەم. خۆ تۆ دەبینی گوێم بەهیچ شتێکی تر نەداوە. دەیتوانی هەموو شتێکم لێ داوا بکا. دەیتوانی هەر شتێکی لێم بوویستبایە بەدەستی بێنێ، گەر بمزانیایە، دەبوایە زەماوەندمان گێڕابایە وەیا شتی ترم کردبایە. من ئێستا وا ئەو هەموو شتە دەزانم. بەڵام ئەو کاتەی ویستی بچێ بۆ شەڕ من پێم نەزانی.»

هیچم نەگوت.

– «ئەو کات هیچ شتێکم نەدەزانی، وام دەزانی بۆ ئەو ئەمە شتێکی خراپ دەبێ. لەو باوەڕە بووم ئەو ناتوانی بەرگەی ژیانی شەڕ بگرێ لە ئەنجامدا بەمەرگ شاد بوو و هەموو شتێک کۆتایی پێ هات.»

– «نەم زانیوە.»

– «ئۆه، بەڵێ ئەمە کۆتاییەکەی بوو.»

تەماشای ڕینالدیمان کرد. لەگەڵ سستەرەکەی تر کەوتبووە قسەوە.

پرسیم: «ناوی چییە؟»

– «فێرگسۆن. هێلین فێرگسۆن. هاوڕێکەت دکتۆرە، وانییە؟»

– «بەڵێ، دکتۆرێکی باشە.»

– «ئەمە ڕێکەوتە. بەدەگمەن لە شوێنێکی وا نزیک لە بەرەوە چاومان بەیەکێکی باش بکەوێ. وانییە؟»

– «ڕاستە.»

گوتی: «بەرەیەکی تڕوهاتە. بەڵام زۆر جوانە. چ هێرشێ دەکرێ؟»

«بەڵێ.»

– «ئەو کات دەبێ کار بکەین، هەرچەند ئێستا بێ کارین.»

– «لەمێژە سستەری؟»

– «لە کۆتایی پازدەکانەوە[1].

کە ئەو چوو بۆ شەڕ دێتە بیرم بیرێکی پووچ هاتە مێشکم. لەو باوەڕە بووم کە دێتە ئەو نەخۆشخانەی منی تیام، وای بۆ چووم، کە بە شیر بریندار بووە و سەریشی شاشی لێ بەستراوە. وەیا گوللەیەکی بەشان کەوتووە. شتێکی ئەندێشەییە.»

گوتم: «بەرەیەکی ئەندێشەییە.»

– «بەڵێ، خەڵک وە تێناگەن کە فەرەنسا لە چ بارێکدایە. ئەگەر تێگەیشتبان ئەم کوشتارە بەردەوام نەدەبوو. ئەو بە شیر بریندار نەبوو بەڵکو نارنجۆکیان پێ دادابوو پەل پەل ببوو.»

نقەم لێوە نەهات.

– «لەو باوەڕەی شەڕ بەردەوام بێ؟»

– «نەخێر»

– «چ دەیوەستێنێ؟»

– «دەبێ لەلایێ بشکێ.»

– «ئێمە دەشکێین. ئێمە لە فەرەنسا دەشکێین، ئەوان ناتوانن لەشەڕ بەردەوام بن و قەسابخانەیەکی وەکو (سۆم) دروست بکەن و نەشکێن.»

گوتم: «لێرە ناشکێین.»

– «لەو باوەڕە نیی؟»

– «نەخێر، ئەوان پار هاوینێ دکرێکی چاکیان پێ کردن.»

(١) لەکۆتایی پازدەکانەوە: واتە کۆتایی ساڵی ١٩١٥.





گوتی: «لەوانەیە ئەوان بشکێن. هەموو کەسێ ڕەنگە بشکێ.»

– «ئەڵمانییەکانیش.»

گوتی: «نەخێر، لەو باوەڕە نیم.»

لەپاشا چووینە لای ڕینالدی و فێرگسۆن.

ڕینالدی بەئینگلیزی لە فێرگسۆنی پرسی:

– «ئیتاڵیات خۆش دەوێ؟»

– «یەگجار»

ڕینالدی سەری خۆی لەقاند گوتی:

«تێ نەگەیشتم.»

قسەکەی فێرگسۆنم کردە ئیتاڵی گوتم:

«AAbbastanze bene»

سەری خۆی لەقاند.

– «زۆر باش نییە. ئینگلتەرەت خۆش دەوێ؟.»

– «زۆر نا ، من سکوتلەندیم. دەزانی؟»

ڕینالدی بەخەیاڵی ڕۆیشتووەوە سەیری منی دەکرد. بەئیتاڵی گوتم:

– «ئەو سکوتلەندییە. سکوتلەندای لە ئینگلتەرە خۆشتر دەوێ.»

– «بەڵام سکوتلەندا بەریتانیایە.»

ئەم دەستەواژەیەم بۆ فێرگسۆن پەرچەڤەکرد.

فێرگسۆن: «Pas encore»

– «بەڕاستی نا؟»

– «نەخێر، ئێمە ئینگلیزمان خۆش ناوێ»[1]

– «هەرگیز ئینگلیزتان خۆش ناوێ؟ (بارکلی)شت خۆش ناوێ؟»

–«ئاه، ئەمە جیاوازە. نابێ هەموو شتێ وەکو یەک لێک بدەینەوە.» پاش ماوەیەک شەوشادیمان لەیەکتری کرد و بەجێمان هێشتن و گەڕاینەوە ماڵ. ڕینالدی گوتی:

– «بارکلی تۆی لەمن بەدڵترە. ئەوە زۆر ئاشکرایە. بەڵام کیژۆڵە سکوتلەندییەکە زۆر جوانە.»

(١) فێرگسۆن کە دەڵێ ڕقی لە ئینگلیزە مەبەستی دەوڵەتی بەریتانیایە چونکە بەریتانیا وڵاتەکەی ئەوانی داگیرکردووە کە (سکوتلەندا)یە بە بەشێک لە بەریتانیای گەورەی دادەنێ. وە گەلی سکوتلەندا چەندەها ساڵە خەبات دەکا تا لەژێر چەپۆکی بەریتانیا ڕزگاری ببێ بەسەرۆکایەتی (سوپای نهێنی ئیرلەندی) ڕۆژ نییە دەست لە سوپای داگیرکەر نەوەشێنن.

گوتم: «زۆر» خۆشم درکم بەوەکرد «تۆ ئەوت خۆش ئەوێ؟»
ڕینالدی گوتی: «نەخێر.»

## 5

پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی جارێکی تر چوومەوە سەردانی خانم بارکلی. لەناو باخچەکە دانەنیشتبوو. منیش چوومە دەرگای لاتەنیشتێی باڵەخانەکە کە ئوتومبیلەکانی فریاگوزاری لەبەردەم ڕادەوەستا. لەژوورەوە سەرۆکی سستەرانم بینی پێی ڕاگەیاندم کە خانم بارکلی نۆرە ئیشیەتی. (ئیمرۆ شەڕ دەستی پێکردۆتەوە) منیش گوتم دەزانم.

گوتی: «تۆ ئەمریکی لە سوپای ئیتالی؟»

– «بەڵێ.»

«چۆن وا هات ئەمە بکەی؟ بۆچی نەهاتییە ڕیزی ئێمە و لەگەڵ ئێمەمانان بی؟»

– «نازانم دەتوانم ئێستاکە بێمە ڕیزەوە؟»

– «بەداخەوە پێم بڵێ بۆچی چوویتە ڕیزی ئیتاڵییەکانەوە؟»

گوتم: «لە ئیتاڵیا بووم. ئیتاڵی دەزانی.»

گوتی: «ئۆها! من تازە بەتازە وا فێری دەبم. زمانێکی خۆشە.»

– «هەندێ کەس دەڵێن، دەتوانی لەماوەی دوو هەفتە فێر ببی.»

– «پەه، ئەوا من لە دوو هەفتەدا فێری نەبووم، گەرچی وا بۆ چەند مانگێ دەچێ دەیخوێنم. گەر مەبەستت دیتنی کاترینە دەتوانی دوای سەعات حەوت بێی ئەوکات دەستی بەردەبێ. بەڵام نەکەی کۆمەڵە ئیتاڵییەک لەگەڵ خۆت بێنی.»

– «تەنانەت لەبەر خاتری زمانە خۆشەکانیشیان.»

– «نەخێر، تەنانەت لەبەر جلە سەربازییە جوانەکانیشیان.»

گوتم: «ئێوارەت شاد.»

– «ڕیڤیدرسی تێنیتە.»

– «ڕیڤیدرا.»

منیش خواحافیزم لێ کرد و چوومە دەرەوە. زۆر زەحمەتە وەکو ئیتاڵیان خواحافیزی لە بیانیان بکەی بێ ئەوەی نەشێوێی. وا تێگەییبووم کە ماڵئاوایی ئیتاڵی هەرگیز بۆ ناردنە دەرەوە بەکارنێ(٢).

ژوورەکە گەرم بوو، منیش چووبوومە سەر ڕووبارەکە و تا سەری پردەکەی (پلاڤا)

(٢) مەبەست لەبەر قورسی زەحمەتی خواحافیزکردنە بەئیتاڵی. کە غەیرە ئیتاڵییەکان بەئاسانی فێری نابن.





چووم. بڕیار وا بوو هێرش لەوێوە دەست پێ بکات. ساڵی پار چوونەپێش لە ناوچەی ئەوبەر زۆر ستەم بوو. چونکە تاکە ڕێگایێ لەوێ هەبوو. ئەویش دادەکشایە خوارەوە بەرەو پردی کەڵەک دەچوو، بەدرێژایی یەک میل لەژێر ڕەحمەتی گڕی تۆپەکاندا بوو. سەرەڕای ئەوەش پردی کەڵەک ئەوەندە فراوان نەبوو، تا هەموو گواستراوەکان واتە سەرباز و ئوتومبیلەکان بۆ هێرشێ بەپۆستەیێ هەڵبگرێ. نەمساوییەکان دەیانتوانی ئەو ناوە بەخوێنی کوژراو سوور بکەن، بەڵام ئیتاڵییەکان لە ڕێگایەکی بچووک لەوبەری ڕووبارەکەوە پەرتەیان کرد و میل و نیوێکیان لەبەری نەمساوییەکان گرت.

ئەوێ جێگایەکی سەخت بوو. نەدەبوا نەمساوییەکان لێ بگەڕێن ئەوێ داگیر بکەن، وای بۆ چووم کە ئەمە چاو لێپۆشینێکی هاوبەشی بوو. چونکە سەری پردەکە و ئەولای ڕووبارەکە هەر بەدەست نەمساوییەکانەوە مابوو؛ مەتارێزەکانیان لەسەر گردەکان بوو چەند یاردەیێ لە ئیتاڵییەکانەوە دوور بوو. ئەم شوێنە وەختی خۆی شارۆچکەیەک بوو، بەڵام هەمووی بۆتە پەلەبەرد، ئەوەی لەوێ مابوو، پاشماوەی ئیستگەیەکی شەمەندەفەر و پردێکی جێگیر کە نەدەتواندرا جارێکی تر بەکاربێتەوە چونکە لەبەر چاوان بوو.

ملی ڕێگا تەسکەکەم گرتەبەر بەرەو ڕووبارەکە چووم، ئوتومبیلەکەم لە بنکەیێ بەجێهێشت، لەژێر گردەکەوە. لە پردە کەڵەکەکە پەڕیمەوە کە چیایەکە پەنای لێ کردبوو.

بەناو مەتارێزەکانی ناو شارۆچکە خاپوورکراوەکە بەلێواری هەڵدێرەکەوە ڕۆیشتم، سەربازەکان هەموویان لەناو قۆرتەکاندا بوون. چەند ڕیزێ ڕۆکێت بۆ بەهانا گەیشتنی تۆپ داندرابوون، وەیا لەکاتی پچڕانی تەلی تەلەفۆن وەکو نیشانە بەکاربهێنرێن. بەرەی شەڕ ئارام، گەرم و پیس بوو. سەیری هێڵەکانی بەرەی نەمساوییەکانم کرد، کەس دیار نەبوو. لەگەڵ کاپتنی ناو قۆرتێک خواردمەوە کە لەناو داڵدەکەوە ناسیم، بەسەر پردەکەدا گەڕامەوە.

ڕێگایەکی فراوانی نوێ خەریک بوو تەواو ببێ، لەوێش پێچ پێچ سەردەکەوتە سەر، بەرەو پردەکە دادەکشا، هەرکاتێ ئەم ڕێگایە تەواو ببێ هێرش دەست پێدەکرێ. ئەم ڕێگایە بەناو دارستاندا بەلۆفەی تیژ دەهاتە خوارەوە. بڕیار وابوو کاتی هێرش هەموو شتێ بەسەر ئەم ڕێگایە نوێیە دەرچووبایە و ترێلە بەتاڵەکان و عارەبانەکان و ئوتومبیلە فریاگوزارە بەبارەکان و هەموو شتێکی گواستنەوە هاتبایە سەر ڕێگا نوێیەکە. بنکە پزیشکییەکە لەبەری نەمساوییەکان و لەوبەری ڕووبارەکە و، لەژێر لێواری گردەکە بوو، دەستەبەرە هەڵگرەکانیش دەبوایە بریندارەکانیان لەپردی کەڵەکەکە بپەڕێنەوە. ئەگەر هێرشیش دەست پێ بکات هەر بەم شێوەیە دەبێ. بەدرێژایی میلێ وەیا زیاتر لە ڕێگا تازەکە، کاتێ هێرش دەست پێ بکا تا ڕاستەڕێیەکە دەکەوێتە ژێر ئاگری تۆپەکانی نەمساوییەکان. وا دیار بوو فەرتەنەیێ بقەومێ. پەنایەکم بۆ ئوتومبیلەکان دۆزییەوە تا ئوتومبیلەکانی تیادا بپارێزرێ. پاش ئەوەی ناوچە بەدەکە دەبڕن، دەتوانن چاوەڕێی بریندارەکان بکەی کە بەپردەکە دەیان پەڕێننەوە. حەزم کرد لەسەر ڕێگا تازەکە ئوتومبیل

لێخوڕم، بەڵام هێشتا تەواو نەبوو بوو. وا پێدەچوو فراوان و زۆر بەچاکی دروست کرابێ. لۆفەکانی باش بوون، پێچەکانی ڕێک و دیاربوون، دەتوانی لەنێو دارەکانی دارستانەکەی سەرچیاکەوە پێچەکانی ڕێگا ببینی. ئوتومبیلەکان هیچ مەترسییەکیان لەسەر نەبوو، چونکە برێکی کانزاییـیان هەبوو. هەر چۆنێ بێ لەکاتی دابەزین لە لێژاییەکاندا قورس نەبوون. بەڕێگایەکی تەسکدا گەڕامەوە.

قەرەبینا بەدەست ئوتومبیلەکەیان ڕاگرت. تۆپێ کەوت، لەو کاتەی ڕاگیرابووین سێی تریش کەوتنە سەر ڕێگاکە. تۆپەکان لەچەشنی حەوتا و حەوت بوون، بایەکی بەووشەوشیشی لەگەڵ دەهات، تەقینەوەیەکی توند و بریقەدار و ترووسکە و پاشان دووکەڵێکی خۆڵەمێشی ڕێگاکەی تەنی. قەرەبینادارەکان نیشانەیان بۆ کردین. بەو شوێنانە تێپەڕین کە تۆپیان بەرکەوتبوو من لە شوێنە شکاوەکان دوورکەوتمەوە. بۆنی تەقینەوەی گەورە و بۆنی قوڕ و بەردی هەڵتەکاو بەردە ئەستێی تازە هاردڕاوم کرد. بۆ (گوریزیا) گەڕامەوە بۆ باڵەخانەکەمان لێم خوڕی. لەدڵی خۆمدا گوتم، چووم بۆ دیدەنی بارکلی لە ئیشدا بوو. نانی ئێوارەم زۆر بەپەلە خوارد. بۆ ئەو باڵەخانەیە چووم کە بەریتانییەکان نەخۆشخانەی خۆیانیان تیای دانابوو. بەڕاستی زۆر گەورە و خۆش بوو، دارودرەختێکی جوانیش لەناو باخچەکەیدا هەبوو. بارکلی لەسەر ئەسکەملێکی ناو باخچەکە دانیشتبوو. خانم فێرگسۆنی لەگەڵا بوو. بەدیتنم زۆر دڵشاد بوون. پاش ماوەیەکی کەم فێرگسۆن داوای لێبووردنی کرد و بەجێی هێشتین. فێرگسۆن گوتی:

«هەردووکتان بەجێ دێڵم، بەبێی من دەتوانن کاتێکی خۆش پێکەوە بمێننەوە.»

بارکلی گوتی: «هێلین مەڕۆ.»

– «حەزم دەکرد، بەڵام هەندێ نامەم هەیە دەبێ بیان نووسم.»

گوتم: «شەو شاد»

– «شادتر مستەر هێنری»

«شتێکی وا مەنووسە سانسۆری پۆستە دڵتەنگ بکا.»

«مەترسە تەنیا دەربارەی ئازایەتی ئیتاڵییەکان و ئەو شوێنە خۆشانە دەنووسم کە تیایدا دەژیم.»

– «لەسەر ئەم نووسینانە خەڵات دەکرێی.»

– «شتی باشە، شەو شادتر کاترین.»

کاترین: «کەمێکی تر دەتبینمەوە.»

خانم فێرگسۆن لەتاریکیدا ڕۆیی و ئێمەی بەجێهێشت.

«ئای فێرگسۆن کچێکی چاکە.»

– «ئا، بەڕاستی زۆر چاکە، سستەرە.»

– «ئەی تۆش سستەر نیی؟.»





– «ئۆه، نەخێر، پیشەیەکی ترم هەیە پێی دەوترێ (V.A.D)[1] زۆر کاری دژوارمان ئەنجام داوە، سەرەڕای ئەمەش تا ئێستا نەبووینەتە جێی متمانەیان.»

– «لەبەرچیی؟.»

«گەر ئیشیان پێمان نەبێ ئەوا جێی متمانە نین. بەڵام ئەگەر بەڕاستی ئیشیان هەبێ، ئەوا دەبینە جێگەی متمانەیان.»

– «جیاوازی نێوان ئێوە و سستەران چییە؟»

– «سستەر وەکو پزیشکە پێویستی بەماوەیەکی زۆرە تا ببێتە سستەر. بەڵام هاتنە ڕیزی (V.A.D) پێویستی بەو ماوە درێژە نییە»

– «تێگەیشتم.»

ئیتاڵییەکان حەز ناکەن ئافرەتەکانیان لە نزیک بەرەوە بن، بۆیە ئێمە لەژێر چاودێرییەکی تایبەتی داین. ناتوانین بێینە دەرەوە.»

– «خۆ من دەتوانم بۆ ئێرە بێم؟»

– «ئۆه، بەڵێ، خۆ ئێمە وەکو ڕەبەنان بەند نەکراوین.»

– «با خۆ لەشەڕ دەربازکەین.»

– «ئەمە زۆر زەحمەتە هیچ شوێنێ نییە خۆی پێ دەرباز بکەین.»

– «هەر چۆنێ بێ با خۆ دەرباز بکەین.»

– «زۆر باشە»

لەتاریکیدا هەریەک لە ئێمە سەیری ئەوی تری کرد. بارکلیم زۆر جوان هاتە بەرچاو، دەستیم گرت، ڕێگەی دام دەستی بگرم، دەستیم بەرز کردەوە تا باسکم لە قۆڵی وەربینم.

گوتی: «نا، نەکەی.»

دەستم لەو شوێنە ڕاگرت.

–«لەبەرچی؟»

– «نا»

– «بەڵێ، تکایە.»

لە تاریکییەوە زیاتر لێی چوومە پێشەوە تا ماچی بکەم، هەر ئەوەندەم زانی ئاگری لەچاو بڵند کردم، زللەیەکی وەشاندە لووت و چاوم، فرمێسک زایە چاوەکانم.»

گوتی: «پەشیمانم.» هەستم کرد قازانجی تایبەتی هەیە.

(١) V.A.D کورتکراوەی (Volountry Aid Detchment).
واتە: دەستەی فریاکەوتنی خۆبەختکەر.

– «تۆ لەسەر حەق بووی.»

– «زۆر پەشیمانم ئێستا ناتوانم بەم شێوەیە پیشەی سستەری بەمەسەر، نەم دەویست ئازارت بدەم. ئازارم دای، ئازارم نەدای؟» لەتاریکیدا سەیری دەکردم، منیش تووڕە ببووم، بەڵام دڵنیا بووم. خۆمیش ئەوەم لەبەرچاوی خۆم دانابوو، وەکو جوولەی یاری شەترەنج.

– «دەستەکانت خۆش، هیچ پێی دڵگیر نیم.»

– «ئای بەسەزمان»

– «من ژیانێکی پڕ بەزم و ڕەزم بەسەردەبەم، هەرگیز بەئینگلیزی قسەم نەکردووە. لەگەڵ ئەوەش تۆ زۆر جوانی.»

تەماشایم کرد.

گوتی: «پێویست بەو هەموو قسە هەڵەق و بەڵەقە ناکا، ئێمە دوورکەوتینەوە.»

– «بەڵێ، لەشەڕ دوورکەوتینەوە.»

ئەو پێکەنی، بۆ یەکەمجار بوو، گوێم لە پێخەنینی بوو. تەماشای ڕوویم کرد گوتی: «خوێن شیرینی.»

«نەخێر، وانیم.»

– «بەڵێ، تۆ ئازیزی، زۆر کەیفخۆش دەبم گەر هیچت لەبەردڵ نەبێ ماچێکت بکەم.»

تەماشای چاوەکانیم کرد، هەروەکو پێشا باسکم لە قۆڵی وەربنا، ماچم کرد، زۆر بەتوندی ماچم کرد و بەتوندی لە ئامێزیم گرت هەوڵم دا لێوەکانی بکەمەوە. زۆر بەتوندی نابووینە سەربەک تا ئەوکاتەش هەر تووڕە بووم. کاتێ کوتوپڕ ئەوم لە ئامێزم گرت لەرزی. زۆر لەخۆمم نزیک کردەوە بەڕادەیێ هەستم لە لێدانی دڵی کرد. سەری خۆی بەدەستم دا دا و، سەری بردە دواوە، لەسەر شانم دایە گریان.

گوتی: «ئاه، گیانەکەم، تۆ دەبیتە دڵسۆزی من؟»

لە دڵی خۆمدا گوتم، کام دۆزەخ، بەئەنگوستەکانم وازیم بەپرچەکەی کرد و شەپم لەسەر شانی دا. ئەو دەگریا.

– «تۆ وا دەبی، وا نابی؟»

تەماشایەکی منی کرد و لە قسەکەی بەردەوام بوو، گوتی:

– «چونکە ئێمە پێکەوە ژیانێکی سەیر و خۆشمان دەبێ.»

ماوەیێ مایەنەوە. تا دەرگای ڤێلاکە لەگەڵیا ڕۆیشتم، ئەو چووە ژوورەوە. منیش گەڕامەوە ماڵەوە بۆ نهۆمی سەرەوە بۆ ژوورەکەم سەرکەوتم. ڕینالدی لەسەر تەختەکەی خۆی ڕاکشابوو، سەیرێکی کردم و گوتی:





– «کەوابێ باشی لەگەڵیا ڕۆیشتووی.»

«ئێمە هاوڕێی یەکترین.»

«دەڵێی سەگی بەبایت.»

لەم قسەیە تێنەگەیشتم. گوتم: «وەکو چیی؟!»

بۆی ڕاڤەکردم، گوتی: «وەکو ئەو سەگە بەبایت کە...»

گوتم: «بەسیکە... پاش ماوەیەکی کەم لەسەر ئەم قسانە جوێن پێک دەدەین» پێکەنی.

گوتم: «شەو شاد.»

گوتی: «شەو شادتر گوجیلە.»

بەمۆم و سەرینەکەوە بەسەر چراکەی داکەوتم، بەتاریکی چوومە سەر تەختەکەم. ڕینالدی چراکەی هەڵگرت و دایگیرساندەوە لە خوێندنەوە بەردەوام بوو.

## 6

دوو ڕۆژ لە بنکەکان گیر بووم. کاتێ گەیشتمەوە ماڵەوە ڕۆژ درەنگ بوو. تا ئێوارەی ڕۆژی دوایی مسز (بارکلی)م نەبینی. لە باخچەکە دانەنیشتبوو، بۆیە ناچاربووم لە نووسینگەی نەخۆشخانە چاوەڕوانی بم. تا دابەزییە خوارەوە. کۆمەڵە نیو پەیکەرێکی مەرمەری لەسەر داری بۆیەکراو قایم کرابوون کە بەدرێژایی دیوارەکانی ژووری نووسینگە ڕیزکرابوون. هەروەها ئەو هۆڵەی کە نووسینگەکەی بەرِوویدا دەکرایەوە، ئەم پەیکەرانەی تیابوو. سیفەتی مەرمەڕی تەواویان تیابوو، کە وای کردبوو بەیەکتری بچن تائێستاش پەیکەرتاشی، بەکارێکی بێ تام دەزانم. بەڵام کارە برۆنزییەکان بەشتێک تێدەگەم. یەک گۆڕستانی دڵڕفێن لە جیهاندا هەیە ئەویش لە (پیزا) بوو، (گێون)یش شوێنی دیتنی پەیکەری بەدە. ئەم ساختمانە هی ئەڵمانیەکی دەوڵەمەند بووە.

پەیکەرە نیوە پەژنتییەکانیش پارەیەکی زۆریان تێ چووە.

من لەوە سەرسام بووم کە ئاخۆ کێ دایتاشیبوون و دەستکەوتی چەند بووە. بیرم لەوە کردەوە ئایا دەبێ ئەمانە گشتیان ئەندامی خێزانێک بن یاخود ئەبێ چ بن. بەڵام گشتیان جلوبەرگی کلاسیکیان لەبەرا بوو. تۆ ناتوانی هیچ شتێ لەمەڕ ئەوانە باس بکەی.

لەسەر کورسییێ دانیشتم، شەپقەکەم بەدەستەوە گرت. ئێمە گەر لە (گوریزیا)ش بواینە دەبوایە کڵاوزرێمان لەسەربایە. بەڵام لەسەرنانیان زۆر بێزارکەر بوو، وەک نواندنێکی شانۆیی چەپەڵ دەهاتە بەرچاو، چونکە ئەو شارە هێشتا لە دانیشتوان چۆڵ نەکرابوو. کاتێ کە چوومە بنکەکان کڵاوزرێیەکم لەسەر ناو دەمامکەکی گازی

ئینگلیزیشم هەڵگرت، کە بەم دواییانە هێندێکمان دەستکەوتبوو، بەڕاستی دەمامکی چالاک بوون. داوامان لێ کرا کە چەکی تەماتیک هەڵگرین؛ دکتۆر و هاوپیشەکانمانیش هەمان داوایان لێ کرا. دەبانچەکەم بەکورسییەکەوە دەکەوت. منیش هەستم پێی دەکرد و، هەریەک لە ئێمە گەر بەئاشکرا چەکی هەڵنەگرتبایە دووچاری سزای بەندکران دەبوو. ڕینالدی کیفێکی قاڵتاغی پڕ کلینکسی هەڵگرتبوو.

من چەکێکی بەڕاستیم هەڵگرتبوو. خۆمم وەکو پیاوێکی چەکدار هاتە بەرچاو، تا مەشقم لەسەر تەقاندنی کرد، چەکەکە لە چەشنی ئۆسترا بوو گوللە خۆرەکەی (٧,٦٥) بوو، لوولەکەی زۆر کورت بوو، لەکاتی تەقاندندا زۆر بەگورجی دەگەڕایەوە. کاتێ دەتتەقاند دەنگی پێکەوتنی بەهیچ شتێ نەهات. مەشقێکم پێی کرد، سێرەم لەژێری نیشانەکە گرت. هەوڵم دا دەسەڵاتم بەسەر جوولەی لوولە سەیرەکەی دابشکێنم. تا توانیم لە دووری یەک یاردەوە لەو نیشانەیەوە بدەم کە لە دووری بیست یاردەوە سێرەم لێ گرتبوو. ئەوکات پڕوپووچی هەڵگرتنی چەکم بەخەیاڵدا هات.

هەر زووش لەبیرم نەما، دەبانچەکەم لەلاتریزەم بەستبوو بێ ئەوەی هەست بەهیچ شتێ بکەم تەنیا لەو کاتانەدا نەبێ کە گەیشتمە هەندێ ئینگلیززوبان کەمێ شەرمم لەخۆم کردەوە. لەسەر کورسییێ دانیشتبووم نەخۆشەوان بەمۆنی لە دوای مێزێکەوە سەیری کردم. لەو کاتەی من سەیری زەوی ژووری پەیکەرەکان و ئەستوونی نیوە پەیکەرەکان و تابلۆ (فریسکۆ)کانی سەر دیوارەکەم دەکرد و چاوەڕێی بارکلی بووم. تابلۆ فریسکۆکان لەو خراپانە نەبوون، هەر فریسکۆیێ لەوکاتەی دەست بەتوێژ فڕێدان و داخوران بکا باش دەبێ. چاوم بەکاترین کەوت بۆ داڵانەکە دادەبەزی، هەستامەوە سەرپێ، کە بەرەو لام دەهات و، کەڵەگەت دیار نەبوو، بەڵام زۆر بەردڵ بوو.

– «ئێوارەباش، هێنری.»

گوتم: «چۆنی»

نەخۆشەوانەکە لەدواوەیی مێزەکەوە گوێی ڕادێرا بوو.

– «لێرە یا لەدەرەوە لەنێو باخچەکە دانیشین؟»

– «با بچینە دەرەوە ئەوێ فێنکترە.»

بەدوو قۆڵی بۆ ناو باخچەکە ڕۆیشتین. نەخۆشەوانەکەش لە داڵانەکەوە چاوی تێ دەبڕین، تا گەیشتینە سەر ڕێچکۆلە چەوڕێژکراوەکەوە.

گوتی: «تۆ لەکوێ بووی؟»

– «لەبنکەکان بووم»

– «نەدەکرا هەواڵێکم بۆ بنێری؟»

– «نەخێر، وا ئاسان نەبوو. بەمەزندەم وابوو کە دەگەڕێمەوە.»

– «دەبوایە ئاگادارت کردبام، گیانەکەم.»





لە ڕێچکۆلەکە دوورکەوتینەوە لەژێر ڕیزە درەختێ پیاسەمان دەکرد، دەستم گرت، ڕاوەستاین پاشان ڕامموسی.

– «هیچ شوێنێ نییە بچین؟»

– «نەخێر، پێویستە لێرە پیاسە بکەین، لەمێژە لێم دووری.»

گوتم: «ئیمڕۆ سێیەم ڕۆژە، بەڵام ئەوە نییە گەڕاومەتەوە»

تەماشایەکی کردم و گوتی:

– «منت خۆش دەوێ؟»

گوتم: «بەڵێ.»

گوتی: «تۆ گوتت منت خۆش دەوێ، وا نییە؟»

بەدرۆوە گوتم: «بەڵێ، تۆم خۆش دەوێ.»

پێشتر وام نەگوتبوو.

گوتی: «پێشم دەڵێی کاترین؟»

گوتم: «کاترین»

لە پیاسەکردن بەردەوام بووین، لەژێر دارەکاندا وەستاین.

گوتی: «بلێ، بەشەو گەڕاومەتەوە لای کاترین.»

گوتم: «بەشەو گەڕاومەتەوە لای کاترین.»

– «ئۆه، ئازیزم، خۆ تۆ گەڕایەوە، وانییە؟»

– «بەڵێ»

– «تۆم زۆر خۆش دەوێ. لەو ماوەیەدا دڵم هەر لای تۆ بوو.»

– «خۆ دوور ناکەویتەوە.»

– «نەخێر، هەر دەگەڕێمەوە لات.»

– «تۆم خۆش دەوێ، تکایە ئەمجارەش دەستت لەهەمان جێگەوە دانێوە.»

– «دەستم دوور نەکەوتۆتەوە.»

وەرم سووڕاند، ڕووم بینی، کاتێ ماچم کرد، بینیم هەردوو چاوی داخستبوو. منیش هەردوو چاوەکانیم ماچ کرد.

وا هاتە مێشکم کەمێ سەرشێت بێ... گەر واش بێ خراپ نەبوو. بەلاشمەوە ئەمە گرینگ نەبوو، ئەمە زۆر چاکترە لەوەی کە هەموو ئێوارەیێ بچیە ژووری ئەفسەرەکان کە تیاترۆکان بەسەرقاچت هەڵدەگەڕێن، شەپقەکانیشت بەرەواژی دەکەنەوە کە بەڵگەی ئاشنایەتی خۆیان نیشانی هاوڕێی چەکدارەکان دەدەن، لەنێوان گەشتەکانیان بۆ نهۆمی سەرەوە. سووڕ دەمزانی کە کاترینم خۆش نەدەویست و، بەهیچ جۆرێ دڵم بەناوی

خۆشەویستییەوە بۆی نەچووە.

تەنیا ئەمەش یارییەکە وەکو یاری (بریج)، کە هەندێ شتت دەگوت لەجیاتی بەکاغەز گەمە بکەی. وەکو یاری (بریج) دەبێ وا خۆت نیشان بدەی. کە لەپێناوی پارە یان شتێکی گرەو لەسەرکراو یاری دەکەی، بێ ئەوەی کەس باسی شتە گرەو لەسەرکراوەکە بکا، یان بزانێ چییە وەیان چۆنە. کەوابوو ئەمەشیان لەوان بۆ من چاکترە.

گوتم: «خۆزیا شوێنێ هەبوایە، ڕوومان تێکردبایە، من تووشی گیروگرفتی مانەوە لەسەر خۆشەویستی لە نێوان نێرینە و مێیینە تا ماوەیەکی دوورودرێژ هاتووم.»

گوتی: «هیچ شوێنێ نییە.» لەخەیاڵێکی ڕۆیشتوو وشیار بووەوە،

– «دەتوانین بۆ ماوەیەکی کەم لێرە دانیشین.»

لەسەر ئەسکەملەیەکی بەردینی تەخت دانیشتین.

دەستیم گرت. ڕێگەی نەدام دەستمی تێ وەرێنم.

گوتی: «زۆر ماندووی؟»

– «نەخێر»

چاوی بڕییە گیا و گوتی:

– «ئەمە یارییەکی چەپەڵە تۆ دەیکەی، وا نییە؟»

– «کام یاری؟»

– «خۆت گێل مەکە.»

– «نەخێر، هەرگیز مەبەستم ئەمە نییە.»

– «تۆ کوڕی باشی، ئەمە دەکەیت و دەشزانی چۆنی دەکەی بەڵام تکایە ئەمە یارییەکی چەپەڵە.»

– «تۆ هەردەم دەتوانی دڵی خەڵک بخوێنیتەوە؟»

– «نەک هەردەم بەڵکو لەگەڵ تۆ. تۆ خۆت بەم شێوەیە نیشان نەدا منت خۆش بووێ ئەوا یاری ئەم ئێوارەیەش بەسەرچوو، چیت ماوە باسی بکەی؟»

– «بەڵام تۆم خۆش دەوێ.»

– «تکایە، کاتێ ناچار نین درۆ بکەین با درۆ نەکەین، کاتێکی خۆشم لەگەڵ خۆنواندنی تۆ بەسەربرد. خۆ بینیت من شێت نیم، هەرگیز شێت نەبوومە. تەنیا هەندێ جار نەبێ ئەویش بۆ ماوەیەکی کەم.»

دەستم ڕاگوشی. گوتم: «گیانەکەم، کاترین.»

– «ئەم دەنگە زۆر پێکەنیناوییە کاترین! زۆر بەچاکی دەرت نەبڕی بەڵام تۆ کوڕی باشی.»





– «ئەمە قسەی قەشەیە.»

– «بەڵێ، تۆ زۆر باشی و دێیە سەردانم؟»

«هەڵبەت»

– «نابێ پێم بڵێی تۆم خۆش دەوێ. ئەمەش وەختی بەسەرچووە.» هەستایەوە و دەستی خۆی لەدەستم دەرهێنا و گوتی: «شەو شاد.»

ویستم ماچی بکەم، گوتی: «نەکەی زۆر ماندووم.»

گوتم: «کەوابێ تۆ ماچم بکە.»

گوتی: «زۆر ماندووم، ئازیزم.»

گوتم: «ماچم بکە»

– «زۆرت حەز لێیە ماچم بکەی؟»

– «بەڵێ»

یەکترمان ڕامووسی و لە پڕ ماچەکەمان بڕی، گوتی:

– «تکایە، بەسیەتی، شەو شاد.»

بەرەو دەرگاکە چووین، چووە ژوورەوە، بەرەو دالآنەکە هەڵکشا، حەزم دەکرد تەماشای ڕۆیشتنی بکەم. بۆ دالآنەکە هەڵکشا. منیش بۆماڵەوە گەڕامەوە. شەوێکی گەرم بوو. هاتوچۆیەکی گەرمیش لەسەر چیاکان هەبوو. تەماشای برووسکەی سەر چیای (سانت گبریل)م کرد. لەبەردەم کۆشکی (ڕۆزا) هەڵوێستام کرد تای پەنجەرەکان کرابوونەوە.

بەڵام خەڵکی هەر تیا بوو، یەکێ گۆرانی دەگوت.

ڕۆیشتمەوە و ڕینالدی لەدوایی من هاتەوە لەو کاتەدا ڕووت و قووت بووم.

– «ئاه، حاڵت شڕە. کوڕەکە شلەژاوە؟»

– «لەکوێ بووی؟»

– «لە ڤیلا ڕۆزا، بەزمێکی خۆش بوو، نەفام هەموومان گۆرانیمان دەگوت. ئەی تۆ لەکوێ بووی؟.»

– «چووبوومە دیدەنی کیژۆڵە بەریتانییەکە.»

– «سوپاس بۆ خوا تووشی ئینگلیزان نەبووم.»

## 7

لە ئێوارەی ڕۆژی دوایی لەبنکەی یەکەمی چیادا گەڕامەوە و ئوتومبیلەکەم لەبنکەی (سیستینتۆ) ڕاگرت، کە بریندارەکان و نەخۆشەکان لەو بنکەیە لێک جیادەکرانەوە و

نەخۆشخانەی جیاجیا لەسەر ڕاپۆرتەکانیان دیاری دەکرا. خۆم ئوتومبیلەکەم لێدەخوڕی. لەناو ئوتومبیلەکە مامەوە. شوفێرەکەش ڕاپۆرتەکانی بردە ژوورەوە. ژوورێکی گەرم بوو، ئاسمان شین و سامال بوو. ڕێگاش سپی و تۆزاوی بوو. لەسەر کوشینە بەرزەکەی فیاتەکە دانیشتبووم، بیرم لە هیچ شتێ نەدەکردەوە، کەرتێک سەرباز لە ڕێگاوە بەنزیکمان تێپەڕین. تەماشام کردن. سەربازەکان گەرمایان بوو ئارەقەیان کردبوو. هەندێکیان کڵاوزرێیان لەسەر بوو، زۆریان بەهەگبەکانیان وەکردبوو. زۆربەی کڵاوەکان زۆر گەورەبوون. تا بناگوێی ئەوانەی لەسەریان نابوو هاتبووە خوار، ئەفسەرەکان هەموویان کڵاوزرێیان لەسەر نابوو. کڵاوزرێی ئەفسەرەکان چاکتر و ڕێکتر بوون. ئەم سەربازانە نیوەی تیپی (بریگاتا بازیلیکسانا) بوون. سەربازەکانی ئەم کەرتەم بەتاڵی سوور و سپییەکەی یەخەیانەوە ناسییەوە. پاش ماوەیێ هەندێ سەربازی دواکەوتوو دوابەدوای ڕەتبوونی کەرتەکەی پێشوو، بەسەر ڕێگاکە ڕەت بوون. ئەم سەربازانە نەیانتوانیبوو بگەنەوە گرووپەکانیان. ئارەقەیان پیا دەچۆڕایەوە. تۆزاوی و ماندووبوون، هەندێکیان حاڵشڕ دیار بوون سەربازێ بەماوەیێ پاش سەربازەکانی دوایی هات. بەشەلە شەل دەڕۆیی. وەستا و لەتەک ڕێگاکەوە دانیشت. دابەزیم. چوومە سەری، گوتم:

«چیتە؟»

سەیرێکی منی کرد و هەستایەوە سەر پێ گوتی:

– «بەردەوام دەبم.»

– «چیت لێ قەوماوە؟»

– «ئەم شەڕە...»

– «ئەی لاقت چییەتی؟»

– «لاقم نییە. گونکم.»

– «ئەی بۆچی سواری ئوتومبیل نەبووی؟ لەبەرچی ناچییە نەخۆشخانە؟»

– «ڕێگەم نادەن. ئەفسەرەکەمان پێی گوتم بەئەنقەست قایشی گونکیت فڕێ داوە.»

– «ڕێگەم بدە سەیرێکی بکەم.»

– «یەکجار هەڵزۆپاوە.»

– «لەکام لایە.»

– «لێرەیە.»

هەستم پێی کرد. گوتم: «بکۆکە»

– «دەترسم لەوە گەورەتربێ. ئێستا دووهەندی سەرلەبەیانییە.»

– «دانیشە، هەر ئێستا ڕاپۆرتی ئەم نەخۆشخانە وەردەگرم، لەگەڵ خۆم هەڵت دەگرم،





دەتدەمە دەست ئەفسەرە پزیشکییەکەی خۆتان.»

– «ئێستا پێم دەڵێ کە بەئەنقەست وام کردووە.»

– «ناتوانن هیچ بکەن. خۆ ئەوە برین نییە. خۆ تۆ لەمەوپێش وات بەسەرهاتووە. وا نییە؟»

– «بەڵام من خۆم قایشەکەم فڕێ داوە.»

– «ئەوان ڕەوانی نەخۆشخانەت دەکەن.»

– «دەتوانم لێرە بمێنم تێنیتە؟»

– «نەخێر، چونکە هیچ ڕاپۆرتێکی تۆم لانییە.»

شوفێرەکە لە دەرگاکە هاتە دەرەوە و ڕاپۆرتی نەخۆشەکانی ناو ئوتومبیلەکەی هێنابوو. گوتی:

– «چواریان بۆ نەخۆشخانەی نمرە (١٠٥)ن و دوانیان بۆ (١٣٢)ن.» ئەم دوو نەخۆشخانەیە کەوتوونەتە دواوەیی ڕووبارەکە.

بەشوفێرەکەم گوت:

– «ئوتومبیلەکە لێخوڕە.»

منیش یارمەتی سەربازە گونکەکەم دا تا سواری ئوتومبیلەکە بێ. لە کنەخۆمم دانا.

پێی گوتم: «ئینگلیزی دەزانی؟»

– «هەڵبەت.»

– «چۆن لەم شەڕە نەفرەت لێکراوە ڕادەبینی.»

– «خراپ.»

– «منیش دەڵێم خراپە سوێند بەعیسا ئەم شەڕە شتێکی چەپەڵە.»

– «لە ئەمریکا بووی؟»

– «بەڵێ خەڵکی (بتربزبورگ)م. زانیم ئەمریکی.»

– «ئیتاڵییەکەم باش نییە. وایە؟»

– «زانیم تۆ ئەمریکی.»

شوفێرەکە لەسەربازەکە ڕاما و. بە ئیتاڵی گوتی:

– «ئەمریکییەکی تر!»

– «گەورەم، بەیارمەتیت، هەر دەبێ بمدەیتەوە کەرتەکەی خۆم؟»

– «بەڵێ.»

– «لەبەرئەوەی دکتۆرەکەمان دەزانی گونکم وە بەئەنقەست قایشە نەفرەت لێکراوەکەم فڕێداوە تا خراپتربێ، نامەوێ بگەڕێمەوە هێڵەکانی پێشەوەی بەرەی

جەنگ.»

– «تێگەیشتم.»

– «ناتوانی بۆ هیچ شوێنێکی ترم ببەی؟»

– «ئەگەر لە بنکەکانی پێشەوە نزیک بواینە ئەو کات دەمتوانی بۆ یەکەم بنکەی پزیشکیت ببەم. بەڵام ئێستا دەبێ ڕاپۆرتت هەبێ.»

– «گەر بگەڕێمەوە نەشتەرگەریم بۆ دەکەن ئەو کاتەش ڕەوانەی هێڵەکانی پێشەوەم دەکەنەوە.»

بیرم کردەوە...

گوتی: «ئەرێ تۆ خۆت حەز دەکەی هەر لە هێڵەکانی پێشەوەی جەنگ بی؟ ها تۆ حەز دەکەی؟»

– «نەخێر»

– «ئەی عیسا. توخوا ئەمە شەڕێکی چەپەڵ نییە؟»

– «گوێم لێ بگرە. لە ئوتومبیلەکە دابەزە. لەتەک ڕێگاکە خۆت بەردەوە، با سەرت ئەستوور بێ. کە لەوسەر گەڕاینەوە لەگەڵ خۆما هەڵتدەگرم بۆ نەخۆشخانەت دەبەم. لەتەک ڕێگاکەوە، لێرە، دەوەستین، ئەلدۆ.»

ئوتومبیلەکەم لەتەک ڕێگاکە ڕاگرت و یارمەتی دابەزینم دا.

– «لێرە دەبم گەورەم.»

گوتم: «خوا حافیز»

دەستمان بەڕۆیشتن کردەوە. پاش میلێ بەلای کەرتەکە تێپەڕین. دوایی لە ڕووبارەکەوە پەڕینەوە. کە بەفراو داییپۆشیبوو. ئاو بەتیژی بەنێو کۆڵەگەکانی پردەکەدا دەڕۆیی. ئەو ڕێگەیەمان گرتەبەر کە بەناو دەشتدا تێپەڕ دەبوو، تا بریندارەکانمان بگەیەنینە هەردوو نەخۆشخانەکە لەگەڕانەوەدا خۆم بەبەتاڵی و بەتیژی ئوتومبیلەکەم لێخوڕی بەڕێگەی خۆماندا بەدوای کابرای (بترۆزبورگ)ی گەڕاینەوە. لە پێشا لە کەرتەکەوە ڕەتبووینەوە لە جاران گەرمتر و لەسەرخۆتر بوون دوایی بەلای سەربازە بەجێماوەکان تێپەڕین تا گەیشتینە عارەبانەیەکی ئەسپی فریاکەوتن. عارەبانەکە لەلای ڕێگاکە ڕاوەستابوو. دوو پیاو خەریکی هەڵگرتنی کابرای گونک بوون تا لەناو عارەبانەکەی دابنێن. بەدوایی سەربازەکە گەڕابوونەوە. سەری بۆ لەقاندم کڵاوزرێییەکەی لەسەری کەوتبوو. نێوچەوانی، ژێرەوەی پرچی، خوێنی پیا دەچۆڕایەوە.

لووتیشی داماڵابوو. جلوبەرگی تۆزاوی و پرچیشی تۆزگرتی ببوو... «گەورەم، سەیرێکی ئاوسانەکەم بکە. چیم پێ ناکرێ، بەدوای منا گەڕاونەتەوە.»

کاتێ گەڕامەوە باڵەخانەکە سەعات پێنجی ئێوارە بوو. چوومە دەرەوە بۆ ئەو شوێنەی ئوتومبیلەکانمان لێ شوشت، تا ئاوێ بکەم بەخۆما، پاشان لە ژوورەکەم ڕاپۆرتەکەمم





ئامادە کرد. بەپانتۆڵ و فانیلەوە لەبەردەم پەنجەرەوە دانیشتبووم. دوو ڕۆژی مابوو هێرش بکرێ. منیش دەبوایە لەگەڵ ئوتومبیلەکانی فریاگوزاری بچوومایە (پلاڤا). ماوەیەکی زۆریش بەسەر ئەو نامەیەی بۆ ئەمریکام ناردبووم تێپەڕیبوو. دەبوایە نامەیەکی تریان بۆ بنووسم. هیچ شتێ نەبوو لەسەری بنووسم بۆیە دوو کارتی پۆستەیی سەربازیم لە چەشنی (ناوچەی شەڕ Zonediguerra)م بۆ ڕەوانە کردن. هەموو شتێکم فەرامۆش کرد تەنیا باشی و سەلامەتی خۆم نەبێ. ئەوەش سێبوورییان دێنێ. ئەم کارتانەیان، لە ئەمریکا، بەدڵ دەبێ، سەیروسەمەرەن، ئەمەش ناوچەیەکی سەیروسەمەرە بوو، بەڵام من وای بۆچووم کە هەڵسووڕانی کاروبارەکە زۆرباش و بێزەوەر بێ، گەر لەگەڵ شەڕەکانی تری نەمساوییەکان بەراورد بکرێ. سوپای نەمساوی بۆ ئەوە خوڵقابوو سەرکەوتن بداتە دەست ناپلیۆن. هەر ناپلیۆنێک بێ، ئاواتەخواز بووم ناپلیۆنێکمان هەبووایە. بەڵام ئێمە لەجیاتی ناپلیۆن جەنەڕاڵ (کادۆرنا)یەکمان هەبوو. قەڵەوێکی زەوقی بوو (ڤیکتۆریۆ عەمانوئیلمان) هەبوو کە خاوەنی ملێکی درێژ و ڕدێنێکی بزنانی بوو. سەرەڕای ئەمەش لەدەستە ڕاستەوەی دۆق (ئۆستا)یان دانابوو. زۆر لایەق بوو ببێتە جەنەڕاڵێکی گەورە، بەڵام پیاوانە بوو. زۆربەی خەڵک حەزیان دەکرد ئەو ببێتە پاشا.

بەپادشا دەچوو. پادشا مامی بوو. سەرکردەی سوپای سێیەم بوو. ئێمە لە سوپای دووەم بووین. هەندێ تۆپی ئینگلیزی لەسوپای سێدا هەبوون. خۆم دوو تۆپچی ئەو تۆپانەم پێکەوە لە (میلانۆ) بینی. مرۆڤی ڕووخۆش بوون. شەوگارێکی خۆشمان پێکەوە بردە سەر. زەلامی گەورە و شەرمن و پەشۆکاو و قەدرزان بوون. خۆزیا سەد خۆزیا لەگەڵ سوپای بەریتانی بام. لەوێ بام کارمی سووکتر دەکرد. خۆ گەر لەوێش بامە لەوانەیە بکوژرابامەوە. نەک لە پیشەی ئەم فریاگوزارییە. بەڵێ، هەتا لە پیشەی فریاگوزاریش. خۆ جارناجار لێخوڕی ئوتومبیلەکانی فریاگوزاری بەریتانیاش دەکوژران. باشە، دەمزانی نەدەبوو لەم شەڕە کوژرابام. نەک لەم شەڕە هیچ پەیوەندییەکی بەمنەوە نییە. مەترسی لەم شەڕە بەقەد ئەمەوە بوو کە فلیمێکی شەڕ لە سینەما ببینم. لەخوا پاڕامەوە، ئاوێ بەم ئاگرە دابکا. ئومێدمان بەرزە لەم هاوینەدا کۆتایی بێ. لەوانەیە نەمساوییەکان شکست بێنن. لەشەڕەکانی تریش شکاون. ئەم شەڕە لەسەر چییە؟ هەموو کەس دەڵێ فەرەنسا نەما و تەواو بوو. ڕینالری گوتی فەرەنسییەکان یاخی بوون، لەشکر هێرشیان بردە سەر پاریس. منیش لێم پرسی چ ڕووی دا؟

گوتی: «ئاه، ئەوان، هێرشەکەیان وەستاند.»

دەمویست بەبێ شەڕ بچمە نەمسا. دەمویست بچمە (دارستانی ڕەش). دەمویست بچمە چیاکانی (هارتس). ئاخۆ چیاکانی (هارتس) کەوتبنە کوێوە؟ لەچیاکانی (کارپانشیان) بەیەکتردادان ببوو. نەمدەویست بچمە وێندەر. خۆ لەوانەش بوو گەشتی وێندەر خۆش بێ. لەوانەیە بچووبامە (ئیسپانیا) گەر شەڕی تیا نەبا.

ڕۆژ بەرەو ئاوابوون بوو، هەواش بەرەو فێنکی بوو. پاش شێوان دەبێ بچمە دیدەنی بارکلی. بەو هیوایە بووم لەوێ بێ. حەزم کرد لە (میلانۆ) لەگەڵی بامە. مگێزی خواردنی گۆڤام دەکرد پاشان لە ئێوارەیەکی گەرمدا بەرەو شەقامی (ڤیامانزۆل) بکشێین لە شەقامەکەدا بپەڕینەوە، لە کەناڵەکەدا پێچ کەینەوە و لەگەڵ کاترین ڕوو لە ئوتێل کەین لەوانەیە قایل بێ، لەوانەشە وا دانێ کە من ئەو دەزگیرانەیمە کە لەشەڕدا کوژرا. لە دەرگای پێشەوەی ئوتێلەکە دەچینە ژوورەوە و خزمەتکاری ئوتێلەکە شەپقەکەی لەسەر دەکاتەوە و بەرەو پیرمان دێ. منیش لەبەردەم مێزی نووسینگەی ئوتێلەکە ڕادەوەستم داوای کلیل دەکەم. ئەویش لە نزیک بەرزکەرەوە دەوەستێ لە پاشان هەردووکمان دەچینە ناو بەرزکەرەوەکە. ئەویش زۆر بەهێواشی بەرز دەبێتەوە و لە نهۆمەکان کرتەی لێ دێ و پاشان لە نهۆمەکەی خۆمان... وەمێر منداڵە خزمەتکارەکەش دەرگای بەرزکەرەوەکە دەکاتەوە. لەوێ دەوەستێ. کاترین دێتە دەرەوە منیش دێمە دەرەوە و لە داڵانەکە بەرەو ژوورەکە دەکشێین، کلیلەکە دەخەمە سەر دەرگاکە، دەرگاکە دەکەمەوە دەچینە ژوورەوە. تەلەفۆن هەڵدەگرم داوا دەکەم بوتلی کاپری بیانگامان لەناو دەفرێ سیلڤەری پڕ بەفرمان بۆ بنێرن، گوێت لە تەقە تەقەی دەفرەکە دەبێ، کە بەلێواری دەفرەکە دەکەوێ. کاتێ بەڕاڕەوەکەدا دەڕوا، منداڵەکە لە دەرگا دەدا داوای لێ دەکەم لە دەرەوە لەبەر دەرگاکەوە دای بنێ. چونکە ئێمە لە ژوورەوە ڕووت و قووتین. هەروەها گەرمایە، پەنجەرەکانیش کراونەتەوە. پەڕەسێلکەکان لەسەربانەکە هەڵدەفڕن، پاشانیش کە تاریک داهات، دەچینە لای پەنجەرەوە، شەمشەمەکوێرە بچووکەکان لەسەر بانەکەوە لە نزیک لووتکەی دارەکانەوە خەریکی ڕاوکردنن بۆ خۆیان، ئێمەش کاپری دەنۆشین. دەرگاکە داخراوە هەواش گەرمە. تەنیا چەرچەفێ بەسەر چوارپایەکەوەیە، شەو هەمووی، هەریەک لە ئێمە ئەوی تری خۆش دەوێ، ئەو شەوە هەمووی، لەو شەوە گەرمە لە (میلانۆ) ئاخۆ دەبێ تەواو ببێ. بەپەلە دەبێ نان بخۆم و بچم کاترین ببینم. لەگەڵ هاوڕێکانم لەسەر خوان زۆرمان قسە کرد. منیش ئارەقم خواردەوە چونکە گەر لەو شەوەدا تۆزێ کەمم خواردبایەوە، هەموومان نەدەبووینە برا. لەگەڵ قەشە لەمەڕ سەرۆکی قەشانی ئێرلەندە قسەم کرد. وا پێدەچوو پیاوێکی خانەدان بووبێ، لەگەڵ ئەو نادادییەیی، ئەو نادادیانەی کە کێشاویەتی، لە سۆنگەی ئەوەی ئەمریکیم و بەشداریم لەو ئازاردانەدا کردووە کەچی وام نیشانی دا باشی لێ دەزانم. بەڵام شتێکی جوان نەبوو کە هیچی لێ نەزانم. پاش ئەوەی گوێم لە هەندێ شیکردنەوەی مەزن و هۆیەکانی بوو، لەپاش هەموو شتێ، وا پێدەچوو لە ئەنجامی لێک حاڵی نەبوون بووە. ناوێکی خۆشی هەبوو خەڵکی (مینیزوتا) بوو ئەمەش وای کردبوو ناوەکەی بەردڵ بکا؛ ئێرلەندە مینیزوتا، ئێرلەندە ویسکوستن، ئێرلەندمەشیگان. ئەوەی ئەم ناوەی خۆش کردبوو، ئەوە بوو کە وەکو (ئایلاند) دەزرینگایەوە. نەخێر، ئەمە نەبوو، شتی تریش، لەمە زیاتر هەبوو. بەڵێ، باوکە ئەمە ڕاستە، باوکە. لەوانەیە، باوکە، نەخێر باوکە باشە لەوانەشە وا نەبێ. باوکە تۆ لەو





مەسەلانە لە من زیاتر دەزانی، باوکە. قەشە، باش بوو. بەڵام مرۆڤێکی وەڕسکەر بوو. ئەفسەرەکان باش نەبوون، بەڵام جاڕسکەر بوون، پادشاش باشە. بەڵام مرۆڤێکی وەڕسکەرە. ئارەقیش خۆ خراپە بەڵام جاڕسکەر نییە. ددانی (مینات) دەردەکا لە ئاسمانەی دەمتدا بەجێی دەهێڵێ.

دۆکا گوتی: «قەشە بەندکرا. چونکە دەستبەڵگەی (کومپیالەی) چەشنی (٣٪) یان لا دۆزییەوە. هەڵبەت ئەوە لە فەرەنسا ڕووی دابوو ئەگەر ئەمە لێرە بووایە هەرگیز نەیان دەگرت. ئەو حاشای لە هەموو زانیاریی دەربارەی دەستبەڵگەکانی سەددا پێنج کردووە. ئەمە لە (بێزییە) ڕووی دا، خۆم لەوێ بووم، لە ڕۆژنامەکانەوە دەربارەی ئەو مەسەلەم خوێندۆتەوە چوو بۆ بەندیخانە، داوای کرد چاوی بەقەشە بکەوێ. ئەمەش ئاشکرایە کە ئەو دەستبەڵگەکانی دزیوە.

ڕینالدی گوتی: «بڕوام بە وشەیێ لەم قسانە نایێ.»

ڕوکا گوتی: «چۆنی تێدەگەی وا تێبگە بەڵام من سەربردەکە بۆ قەشەمان دەگێڕمەوە. پڕ زانیارییە. ئەو قەشەیە. نرخی خۆی دەزانێ.»

قەشە بزەیەکی هاتێ گوتی: «بەردەوام بە، گوێم لێ گرتووی»

– «هەڵبەت، هەندێ دەستبەڵگەش حیسابیان بۆ نەکراوە بەڵام دەستبەڵگەکان لە سەدا سێ و هەندێ لە قەرزەکانی ناوخۆی لای قەشە بووە. بەتەواوی لەبیرم نەماوە، کە چی بوون. جا بۆیە چووم بۆ زیندان، ئەمە مەبەستی چیرۆکەکەیە منیش لە دەرەوەی ژوورەکەی بەندیخانە وەستام، وامزانی دەچم دان بەهەموو شتێ دادەنێم. گوتم:

«ئەی باوکە، پیرۆزیمان پێ ببەخشە، لەو گوناهانەی کە کردوومە.»

هەموویان یەک بەدەنگی خۆیان پێکەنین. قەشە پرسی.

– «ئەی ئەو چی گوت؟.»

ڕۆکا خۆی لێ گێل کرد. لە ڕاڤەکردنی نوکتەکە بۆ من بەردەوام بوو:

– «تۆ مەبەستەکەت زانی، وا نییە؟»

پێ دەچوو نوکتەیەکی سەیر بووبێ. گەر بەتەواوی لێی حاڵی بووبوومایە. هەندێکی تر ئارەقیان بۆ تێکردم.

منیش چیرۆکێکم دەربارەی سەربازێکی تایبەتی ئینگلیزم بۆ گێڕانەوە کە لەژێر دۆشی سەرشۆکیان دانابوو پاشان مێجەر چیرۆکێکی لەبارەی یازدە چیکوسلوفاکی و باشچاوشێکی هەنگاری بۆ گێڕانەوە. پاش ئەوەی کەمێ مەم نۆشی سەرگوزشتەی (جوکی)م بۆ گێڕانەوە کە (پێنی)[1] یەکی دۆزیبووەوە. مێجەر گوتی: چیرۆکێکی ئیتاڵی هەیە لە بەسەرهاتی ئەو دۆقە ژنە دەچێ کە شەو نەیتوانیەوە بخەوێ. لێرەوە، قەشە، ئەوێی بەجێهێشت. من چیرۆکی فرۆشیارێکی گەڕۆکم گێڕایەوە کە لەسەعات

(١) پێن: پارەیەکی ئیتاڵییە.

(٥)ی بەیانی گەیشتبووە (مارسیلیا) کە ساردەبایەک هەڵی کردبوو. مێجەر گوتی؛ وام بیستۆتەوە کە زۆر خۆرەوەم. من حاشام لەوە کرد. ئەو گوتی: ئەمە ڕاستە. بەگیانی (باخۆس) دەتوانین بسەلمێنین کە ڕاستە یان نا.

باخۆس نا، من گوتم. باخۆس نا. بەڵێ، باخۆس ئەو گوتی. من دەبێ پێک بەپێک، بەرداخ بە بەرداخ لەگەڵ (باسی، فلیپۆڤانجێنا) بخۆمەوە. (باسی) گوتی: نەخێر. ئەمە تاقی کردنەوە نییە. ئەوەتا ئێستا دوو هێندەی منی خوادۆتەوە. گوتم، ئەمە درۆیەکی زلە. سوێند بە (باخۆس)یان بە (باخۆس) نا، (فیییلبو فێنزاباسی) یا (باسی فیییلبو فێنرانزا)، بەدرێژایی شەو دەستی بەدڵۆپەیێ مەی نەکەوتووە.

ناوی چییە؟ ناوی منی لێ پرسی ئاخۆ ناوم (فیدیریکۆ ئیرنکو)یە یا (ئیرنکو فیدیریکۆ)یە؟ گوتم باچاکترین پیاو گرەو بباتەوە، باخۆس گیرا، مێجەر دوو کوپی گەورەی پڕ مەی سوور کرد، نیوەی ئەوەی بۆم تێکرا خواردمەوە، خەریک بوو بۆم تێ بکاتەوە، ڕەتم کردەوە و دڵۆپێکی تر ناخۆمەوە بیرم کەوتەوە بۆ کوێ دەچم.

گوتم: «باسی بردییەوە، توانای لە من چاکترە، دەبێ بڕۆم. ڕینالدی: «بەڕاست: ئەو دەبێ بڕوا. ژوانی هەیە، هەموو شتێ دەربارەی ئەوەوە دەزانم.»

– «دەبێ بڕۆم.»

باسی گوتی: «شەوێکی تر، شەوێک کە هەست دەکەی بەهێزتری.»

دەستێکی لەشانم دا، هەندێ مۆمی داگیرساو لەسەر مێزەکە هەبوون ئەفسەرەکان هەمووی کەیفخۆش بوون گوتم: «برایان، شەوتان شاد.»

ڕینالدی لەگەڵم هاتە دەرەوە. لە دەرەوە لە نزیک ڕێچکەی دەرگاکە ڕاوەستاین.

گوتی: «وا چاکە بەسەرخۆشی نەچی؟»

– «سەرخۆش نیم ڕین...نا...»

– «کەوابێ وا باشە هەندێ دەنکە قاوە بجووی.»

– «قسەی بێ مانا.»

– «هەندێکت بۆ دێنم، ڕۆڵە، کەمێ لێرە هاموشۆ بکە.»

ڕۆیشت کە گەڕایەوە مستێ دەنکە قاوەی هێنا.

– «ئەمانە بجوو، ڕۆڵە، خوات لەگەڵ بێ.»

گوتم: «باخۆس.»

– «لەگەڵت دادەبەزمە خوارەوە.»

– «حاڵم زۆرباشە.»

ماوەیێ پێکەوە ڕۆیشتین. دەنکە قاوەم جوویی، لەسەر ڕێگەکەی بۆ نەخۆشخانە دەچێ منی بەجێهێشت و گوتی: «شەو شاد.»

گوتم: «شەو شاد بۆ نایێیتە ژوورەوە؟»

سەری خۆی لەقاند و گوتی: «نەء، من حەزم لەزەوقی سادەترە.»

– «سوپاس بۆ دەنکە قاوەکانت.»

– «هیچ نییە، هیچ نییە.»

بەڕێگاکە ڕۆیشتم، تخووبی ئەودار سەرووانەی دەوری دابوو دیار و ئاشکرابوون،





ئاوڕێکی دواوەم دایەوە، بینیم، ڕینالدی لە جێگەی خۆی وەستاوە تەماشام کرد، دەستم بۆ هەڵبڕی، لە هۆڵی پێشوازیکردن دانیشتم، چاوەڕێی بارکلی بووم، یەکێ بەدەروازەی هۆڵەکە تێپەڕی. بەڵام بارکلی نەبوو، فێرگسۆن بوو.

پێی گوتم: «هەلاو، بارکلی پێی گوتم بەداخەوە ناتوانێ ئەم شەو بتبینێ.»

– «بەداخەوە، بەو هیوایەم نەخۆش نەبێ.»

– «زۆر تەواو نییە.»

– «دەتوانی پێی بڵێی پەرێشانم بۆی؟»

– «بەڵێ.»

– «لەو باوەڕەی دای بەیانی بێم بیبینم؟»

– «بەڵێ، لەو باوەڕەدام.»

– «زۆر سوپاست دەکەم، شەو شاد.»

لە دەرگاکەوە هاتمە دەرەوە کوتوپڕ هەستم بەتەنیایی کرد. زۆر شەیدای بینینی نەبووم. کەمێ سەرگەرم بووم. نزیکەی لەبیرم نەمابوو بێم، بەڵام کە هاتم و لەوێ نەمبینی هەستم بەتەنیایی و بۆشی دەکرد.

## 8

پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی بیستمان ئەمشەو لەسەرووی ڕووبارەکەوە دەست بەهێرش دەکرێ. دەبوایە ئێمە چوار ئۆتومبیلی فریاگوزاری بەهەڵەداوان بگەیەنینە وێندەر. کەسیش هیچی دەربارەی ئەم هێرشە نەزانی، کەچی هەمووشیان زۆر بەگرینگییەوە لە ئیجابیات و زانیاری ستراتیژی ناوچەکە دوان. من سواری ئۆتومبیلی یەکەم ببووم، کاتێ خەریک بوو لە نەخۆشخانەی بەریتانی تێپەڕین داوام لە شوفێرەکە کرد هەڵوێستێ بکا. سێ ئۆتومبیلی تریش بەدوامەوە وەستان. دابەزیم، بەشوفێرەکانم گوت لەڕۆیشتن بەردەوام بن. هەروا پێم گوتن ئەگەر لە دووڕیانی ڕێگاکان نەگەیشتینەوە یەک ئەوا لە (کۆزمۆنس) چاوەڕێمان بن. بەپەلە خۆم لە ژوورێ کرد و چوومە هۆڵی پێشوازیکردن. داوای بارکلیم کرد.

– «لە ئیش دایە.»

گوتم: «دەکرێ دەقەیێ بیبینم؟»

یەکێکیان بەدوایدا نارد بانگی بکا. پاش ماوەیێ بارکلی لەگەڵ ئەو گەڕایەوە. «ڕاوەستام، تا تەندروستیت بپرسم و بزانم چاکتر بوون. گوتیان لە ئیش دای بۆیە داوام کرد بتبینم.»

– «زۆر باشم، وا بزانم تێنی گەرمایی دوێنێ کاری تێکردبووم.»

– «دەبێ بڕۆم.»

– «تا بەردەرگا لەگەڵت دێم.»

لە دەرەوە لێم پرسی: «زۆر باشی؟»

گوتی: «بەڵێ، گیانەکەم. ئەمشەو دەگەڕێیتەوە؟»

– «نەخێر، بۆ (نمایش) دەچم لە سەرووی ڕووباری (پلاڤ)دا ساز ئەکرێ.»

– «نمایش؟!»

– «باوەڕ ناکەم لەوە زیاتربێ.»

– «دەگەڕێیتەوە؟»

– «سبەینێ.»

شتێکی لەملی خۆی کردەوە. خستیە ناو دەستم، گوتی: «ئەمە حەزرەتی ئەنتۆنیۆی پیرۆزە، سبەی شەو وەرەوە.»

– «کاسۆلیکی؟»

– «نەخێر، بەڵام گوتیان حەزرەتی ئەنتۆنیۆ زاتێکی پیرۆزە.»

– «لەبەر خاتری تۆ ئاگاداری دەبم. خواحافیز.»

گوتی: «نا، خواحافیز نا.»

– «زۆر باشە.»

– «کوڕە پیاوی چاک بە ئاگاداری خۆت بە. نەء، ناتوانی لێرە ماچم بکەی. ناتوانی.»

– «باشە»

لە دەرەوە ئاوڕم دایەوە بینیم لەسەر پایەکانی بەردەرگاکە وەستاوە. دەستی هەڵدەشەقاند. منیش دەستی خۆمم ماچ کرد و بەرزم کردەوە. دووبارە دەستی هەڵشەقاند. ئەو کات گەیشتبوومە سەر شەقامەکە سواری ئۆتومبیلەکە بووم. دەستمان بەڕۆیشتن کرد. حەزرەتی ئەنتۆنیۆ لەناو قوتوولوکەیەکی کانزایی سپی دابوو. قوتوولکۆکەکەم کردەوە. حەزرەتی ئەنتۆنیۆم دەرهێنا لەناو دەستم دانا.

شوفێرەکە گوتی: «حەزرەتی ئەنتۆنیۆیە؟»

– «بەڵێ»

گوتی: «منیش دانەیەکم هەیە.»

دەستی ڕاستی لە سوکانەکە بەردا. قۆچپەیەکی کراسی ژێرەوەی کردەوە خەناوکەیەکی لەژێر کراسەکەوە دەرهێنا گوتی:

– «دەبینی؟.»

حەزرەتی ئەنتۆنیۆم خستەوە ناو قوتوولکەکەوە لەگەڵ زنجیرە زێڕەکەی خستمە گیرفانی سەر سینگمەوە. گوتی:

– «لەملتی ناکەی؟»





گوتم: «باشە.»

زنجیرە زێڕەکەم کردەوە لەملی خۆمم کرد، دامخستەوە. حەزرەتی ئەنتۆنیۆ بەسەر کورتەکە سەربازییەکەمدا شۆڕبووەوە منیش سەرەوەی کراسەکەمم کردەوە، قۆچپەیەکی کراسە یەخەدارەکەم کردەوە و خستمە ژێر کراسەکەمەوە. لەکاتی ڕۆیشتنی ئۆتومبیلەکە هەستم کرد قوتوولکۆکە کانزاییەکە بەسەر سینگم دەکەوت. پاشان لەبیرم کرد پاش ئەوەی برینداربووم بووە بەردی بن گۆم و نەمدۆزییەوە. ئەبێ خێرومەندێ لە بنکەکانی دواوە دەستی لێگرتبێ.

کاتێ گەیشتینە سەر پردەکە زۆر بەتیژی بەسەریدا تێپەڕین، لەو کاتەدا لەسەر ڕێگاکە لەبەرایيمانەوە تۆزی ئۆتومبیلەکانمان بینی زۆر بچووک دیار بوون، ئەو تۆزەی لە ژێر تایەکانیان بەرز دەبووەوە، لە نێوانی دارەکان پەرت دەبوو. کە گەیشتینەوە ئەوان، لێیان ڕەت بووین. لە ڕێگایێ سووڕاینەوە سەرکەوتینە سەر گردەکان. هاژووشتنی کاروانی لە ڕێگای پێچاوپێچی ئەوهادا کارێکی زۆر خۆش نییە، نەخوازەڵا لەیەکەم ئۆتومبیلیش بی. لەسەر کوشینی دواوە دانیشتبووم، بۆ خۆم تەماشای گوندەکەم دەکرد. گەیشتینە بناری گردەکان، لەبەری نزیک ڕووبارەکەوە کە بەڕێگاکە بۆ سەرچیاکە سەردەکەوتین، چیای بەرز لەلای باکوورەوە هەبوون کە تائێستاش لووتکەکانیان بەفری بەسەرەوە بوو، ئاوڕم دایەوە، سێ ئۆتومبیلەکە خەریکی سەرکەوتن بوون. نێوان ئۆتومبیلەکان سەرتاپا تۆز دایگرتبوو. بەتەنیشت کاروانێکی درێژی هێستری بارهەڵگر تێپەڕین. کاروانچییەکانیش لە تەنیشت هێسترەکانەوە ڕێگاکەیان بەپێ دەکوتایەوە. فێسی سۆریان لەسەر کردبوو. لە تیپی (بیرساگلیری) بوون، دواوەی کاروانەکە، ڕێگاکە چۆڵ بوو، سەرکەوتینە سەر گردەکان، پاشان دابەزینە سەر لاپاڵێکی درێژکۆڵەی گردێ کە دەچووە سەر دۆڵی ڕووبارێ، هەردوولای ڕێگاکە وەدارودرەخت بوو، ڕووبارەکە لەلای ڕاستی ڕیزە دارەکە بوو، ئاوەکەی ڕوون و تیژڕەو و تەنکاو بوو، ڕووبارەکە نزم بوو، دەرەتانی لم و پلووکە بەردی تیابوو، لەگەڵ جۆگەلەی ئاوی تەسک و جارناجاریش تەنکاوێ ئاو وەکو ورشە بەسەرپلووکە بەردەکاندا دادەپرژا، لەنزیک ڕووبارەکەوە گۆماوێکی قووڵم بینی ئاوەکەی وەکو ئاسمان شین بوو، چەند پردێکی بەردینی کەوانەیی کۆنم لەسەر ڕووبارەکەوە بینی کە ترێلەکانی لێی دەسووڕانەوە بەتەک خانووێکی ناو کێڵگەی بەردین تێپەڕین کە بەرامبەر دیواری خواروویان دارهەرمێیان لێ ڕوابوو، لە شێوەی مۆم داینگەدا بوون، دیواری کێڵگەکە نزم بوو لەبەرد دروست کرابوو، ڕێگاکە بەسەر دۆڵەکە سەر دەکەوت لە پاشان لە پێچێ سووڕاینەوە جارێکی تر بەسەر گردەکان کەوتینەوە. ڕێگاکە زۆر بە ڕکی سەر هەوراز بۆوە و لەو کاتەدا دەتتوانی دارستانی شابەڕوو بەدی بکەی تا دەگەیشتیە ڕەوەزێکی بەرز، لە نێوان دارەکانی دارستانەکە، لە توانام دابوو، کە تیشکی ڕۆژی لەسەربوو، چاو داگرمە خوارەوە و لە دوورەوە هێڵی ڕووبارەکە ببینم کە

هەردوو سوپای لێک جیا دەکردەوە، بەسەر ڕێگا ناخۆشە تازەکەی سوپاییدا تێپەڕین، کە لەسەر لووتکەکەوە درێژ دەبۆوە و، لە باکوورەوە تەماشای دوو زنجیرە چیام کرد، تا هێڵی بەفرەکە سەوز و تاریک دەچوون و لەبەر تیشکی ڕۆژ سپی و دڵڕفێن دیاربوو. پاشان ڕێگاکە بەسەر لێوارەکە هەڵدەکشا زنجیرەی سێیەمی چیاکانم بینی، بەرزترین چیای بەفرین، وەکو گەچ سپی بوو و کەند و قۆرتی زۆری تیابوو کە سەر تەپکەکانیان تەختاییێکی سەیر بوو لە دواوەی ئەم زنجیرە چیایانەوە چیای تر هەبوون، بینینیان لە حوکمی چاودا نەبوو، ئەگەر تۆ بڵێی دەیانم بینی ڕاستت نەدەگوت. ئەم چیایانە چیای نەمساوییەکان بوون، هاوتای ئەم چیایانە لە ئیتاڵیادا نەبوو، لە پێشمان ڕێگاکە بۆ لای ڕاست دەسووڕایەوە، چاوێکم دابڕییە خوارەوە، توانیم ڕێگایێ ببینم کە بەناو دارەکاندا شۆڕ دەبووەوە، لەشکر لەسەر ئەم ڕێگایەوە بوو ترومبیلەکان باریان هەڵگرتبوو هێسترەکانیش تۆپی چیایان لێ بارکرابوو. کاتێ لە ڕێگاکە دابەزینە خوارەوە، بەتەنیشتەکەیدا ڕۆیشتن توانیم ڕووبارەکە ببینم، زۆر لە خوارەوە بوو، هێڵی شەمەندەفەر بەسەر پردە کۆنەکە بۆ بەرەکەی تر بەسەریدا تێپەڕ دەبوو. لە شوێنێکی ژێر گردەکەوە لە دواوەی ڕووبارەکەوە توانیم خانووە خاپوورکراوەکانی شارۆچکەکە ببینم کە دەبوایە بگیرێن. هەر کە دابەزینە خوارەوە وەرسووڕاینەوە سەر ڕێگا سەرەکییەکە کە بەتەک ڕووبارەکەدا تێدەپەڕی، دنیا تاریک داهات.

## 9

ڕێگاکە قەڵەباڵغ بوو، حەسیری تەنراویش لە لاسکی گەنمەشامی و قەسەڵ لە هەردوولای ڕێگاکە هەبوون، لای سەرەوەشی بەحەسیر گیرابوو. بەشێوەیێ لە دەروازەی سێرک یاخود لە گوندێکی خۆماڵی[1] دەچوو.

بەهێواشی ئەم تونێلە بەحەسیر داپۆشراوەمان بڕی لە شوێنێکی پان و پۆڕ هاتینە دەرەوە، کە جاران ئەوێ ئێستگەی شەمەندەفەر بوو، ئەو شوێنە لە ئاستی کەناری ڕووبارەکە نزم بوو. لە شوێنە نزمەکانی کەناری ڕووبارەکە چاڵ هەڵکەندرابوون، سەربازە پیادەکان سەنگەریان تیاگرتبوو، ڕۆژ لەسەر ئاوابوون بوو. لەو کاتەدا بەئۆتومبیل دەڕۆیشتین. سەرم بەرز کردەوە بەدرێژایی کەناری ڕووبارەکە چاوم بەقوللەکانی چاودێریکردنی نەمساوییەکان کەوت کە لەسەر گردەکانی بەرەکەی تر بوون. لەبەر خۆرئاوابوون ڕەش دەچوونەوە، ئۆتومبیلەکانم لە پشت کارگەیێکی کەرپووچدا وەستاند، هەندێ لەو فڕن و چاڵە قووڵانە کرابوونە بنکەی فریاکەوتن، سێ پزیشک لەوێ بوون، دەمناسین، لەگەڵ مێجەر کەوتمە قسە: لەوێم زانی کاتێ کە هێرش

(١) گوندێکی خۆماڵی (نەتەوەیی): مەبەست گوندی زەنجییەکانی ئەمریکایە، کە دانیشتوانی ئەسڵی ئەمریکان.





دەست پێدەکرێ. ئۆتومبیلەکانمان برینداریان لێ بار دەکرێ. بەرەو دواوە لێی دەخوڕین و بەدرێژایی ڕێگا حەسیرییەکە، تا سەرەوەی ڕێگا سەرەکییەکە تا ئەو شوێنەی کە بنکەی پزیشکییە، ئۆتومبیلەکانی تریش ئەوانە دەگوازنەوە. ئاواتەخواز بووین ڕێگاکە لەبەر قەڵەباڵغی نەگیرێ. ڕێگاکە یەک بەری بوو. پەرژینی لێ کرابوو چونکە لەبەرچاوی نەمساوییەکانی ئەوبەری ڕووبارەکەوە بوو. لەکارگەی کەرپووچیشدا. لە ئاگری تفەنگ و تۆپی دوژمن پارێزرابوون بەهۆی لێواری ڕووبارەکە. تەنیا تاقە پردێکی ڕووخاو لەسەر ڕووبارەکە بوو، کاتێ بۆردوومان دەستی پێکرد خەریکی دامەزراندنی پردێکی تر بوون. هەندێ لە تیپە سەربازییەکان دەبوایە لە تەنکاوەکەی لای پێچی ڕووبارەکە بپەڕنەوە. مێجەر پیاوێکی کورتە باڵابوو و جووتێ سمێڵی قیتی هەبوو بەشداری لە جەنگی لیبیادا کردبوو دوو تیلمی لوولی پێوە بوو، گفتی دامێ گەر کاروبار بەچاکی بەڕێوە بچێ خەڵات دەکرێم. گوتم بەو هیوایەم هەموو شتێ بەچاکی بەڕێوە بچێ. بەڵام ئەو پیاوێکی زۆر باش بوو. پرسیم ئاخۆ دەبێ سەنگەرێکی وا گەورە هەبێ شوفێرەکان تیایدا ستر بن. بەدوای سەربازێکی نارد تا سەنگەرێکم نیشان بدا. لەگەڵ سەربازەکە چووم سەنگەرەکەمان دۆزییەوە. سەنگەرێکی زۆر چاک بوو، شوفێرەکانیش زۆر پێ کەیفخۆش بوون. ئەوانم لەوێ بەجێهێشت. مێجەر داوای لێم کرد پێکێ لەگەڵ ئەو و ئەفسەرەکەی تر بخۆمەوە. شەڕابی (ڕەم)مان خواردەوە دانیشتنەکەمان زۆر برادەرانە بوو، دەرەوە تاریک بوو، پرسیم داخوا کەی هێرش دەست پێدەکا. گوتیان کاتێ تاریک دابێ. بۆ لای شوفێرەکان گەڕامەوە، لەناو سەنگەرەکە دانیشتبوون. منیش هەر یەکێ پاکەتێ جگەرەی (ماسیۆدۆناس)م پێ بەخشین. جگەرەکان زۆر شڵ داگیرابوون توتنیان لێ دەڕژا، پێش کێشانی، دەبوایە هەردوو لایت بپێچابایەوە. مانێرا چەرخەکەی ئاگر دا، بەلامانی داگیرا. چەرخەکەی لە ڕادێتەری فیات بوو. منیش هەرچییەکم بیستبوو بۆم گێڕانەوە.

پاسینی گوتی: «کاتێ دابەزین بۆچی بنکەکانمان نەبینی؟»

– «لە دواوەی ئەو پێچەبوو کە لێی سووڕاینەوە.»

مانێرا: «ئەو ڕێگایە زۆر بێ سەروبەر دەبێ.»

– «ئاگر بارانمان هەر دەکەن.»

– «لەوانەیە.»

– «ئەی دەربارەی خواردن؟ پاش هێرش دەرفەتی نانخواردنمان نابێ.»

– «هەر ئێستا دەچم بزانم چ هەیە.»

– «ئێمە لێرە بمێنین یان لەگەڵتا بێین؟»

– «وا چاکە لێرە بمێننەوە.»

بۆ سەنگەرەکەی مێجەر گەڕامەوە. گوتی ناندینێکی مەیدانی گەڕۆک بەڕێوەیە. ئەو

کات شوفێرەکان دەتوانن بەشی خۆیان وەرگرن، هەروا ئامادەیی خۆی دەربڕی کە لەگەنێک (قـزعـەیەک)یان بۆ پەیدا بکا، ئەگەر نەیان بێ. گوتم: وابزانم هەیانە.

گەڕامەوە. بەشوفێرەکانم گوت: هەر کاتێ خواردن بێ دەتوانم بگەڕێمەوە خواردنتان بۆ پەیدا بکەم. مانێرا گوتی بەو هیوایەم بەر لەدەستپێکردنی بۆردوومان بگاتە جێ. ئەوان تا چوومە دەرەوە بێ دەنگ بوون. ئەوان ئامێرساز بوون ڕقیان لەشەڕ بوو. چوومە دەرەوە تا سەیرێکی ئوتومبیلەکان بکەم و بزانم بار چۆن بەڕێوە دەچێ. دوایی هاتمەوە ژوورەوە لەگەڵ چوار شوفێرەکە لەناو سەنگەرەکە دانیشتم پشتمان دابووە دیوارەکەوە جگەرەمان پێکردبوو، دەرەوە تاریک داهاتبوو، زەوی سەنگەرەکەش گەرم و وشک بوو، شانم بەدیوارەکەوە نا، لەسەر پشت پاڵم دایەوە، لێ ڕاکشام.

گاڤاوزی پرسی: – «کێ هێرش دەبا؟»

– «تیپی بیرساگلیری.»

– «هەموو بیرساگلیرییەکان؟»

– «وابزانم»

– «ئەو لەشکرەی لێرەیە بەشی هێرشێکی ڕاستەقینە ناکا.»

– «بۆ ئەوەیە تا سەرنجی سەربازەکان لە شوێنە ڕاستەقینەکەی هێرشەکەوە بۆ لایەکی ترەوە بەرن.»

– «سەربازەکان ئەوە دەزانن؟»

– «لەو باوەڕەدانیم»

مانێرا: «هەڵبەت نازانن، گەر ئەوە بزانن هێرش نابەن.»

پاسینی گوتی: «بەڵێ، هێرش دەبەن. بیرساگلیرییەکان گێلن.»

گوتم: «ئەوان ئازا و مەشق پێدراوی باشن.»

– «ئەوان زل و زەبەلاحن، بەسینگ پان و ساغ و سەلامەتن. بەلام سەرەڕای ئەمەش گێلن.»

مانێرا گوتی: «نارنجۆک هاوێژەکان بالا بەرزن.»

ئەمە نوکتەیێ بوو، دایانە قاقای پێکەنین.

– «گەورەم تۆ لەو کاتەی لەوێ بووی کە ڕازی نەبوون هێرش بەرن لەهەر دە پیاو پیاوی دەیەمیان ئاگرباران کرد.»

– «نەخێر.»

– «ئەمە ڕاستە. ڕیزیان کردن و لەهەر دەیێ، پیاوی دەیەمیان دەکوشت، کاربینەری ئاگربارانیان کردن و هەموویان کوشتن.»

باسینی تفی لە زەوی کرد:





– «کاربینەری، بەلام ئەم نارنجۆک هاوێژانە هەر یەکەیان شەش پێ بەرزن هێرش نابەن.»

مانێرا: «گەر هەرکەس لەلای خۆیەوە هێرش نەبا، شەڕ تەواو دەبێ.»

– «ئەمە لەگەڵ پیاوی نارنجۆک هاوێژ چارەی نەبوو. ئەوان ترسنۆک بوون. زۆربەی ئەفسەرەکانیان لەبنەماڵە نەجیبەکانەوە هاتبوون.»

– «هەندێ لە ئەفسەرەکان بەتەنیا هێرشیان برد.»

– «باشچاوشێ دوو ئەفسەری دایە بەر گوللە کاتێ هێرشیان نەبردبوو.»

– «بەلام هەندێ لە سەربازەکان هێرشیان برد.»

– «ئەوانەی هێرشیان برد ڕیز نەکران. کاتێ پیاوی دەیەمیان ئاگرباران کرد.»

– «یەکێ لەو کوژراوانەی کە کاربینەرییەکان کوشتیان خەڵکی شارەکەم بوو. گەنجێکی کۆکی بالابەرز بوو، شایانی ئەوەبوو بچێتە ڕیزی نارنجۆک هاوێژەکانەوە، زۆر لە ڕۆما دەژیا. شەو و ڕۆژی خوایی دەستی لەنێو دەستی کچان بوو. هەر لەگەڵ کاربینەرییەکانیش بوو.»

پاسینی بەپێکەنینەوە لە قسەکانی بەردەوام بوو، گوتی: «ئێستاش پاسەوانی خۆی و نێزەکەی لەبەر دەرگاکەیانە. کەس ناتوانێ بێ دایک و باوک و خوشکەکانی ببینێ. باوکیشی هەموو جۆرە مافێکی هاوولاتی لێ سەندراوەتەوە. بگرە ناتوانێ دەنگیش بدا.»

یاساش نایان پارێزێ. هەر کەسێ بیەوێ دەتوانێ دەست بەسەر ماڵ و سامانیان دابگرێ.»

– «ئەگەر وایان لەم خێزانە نەکردبایە نەیان دەتوانی کەسی تر ڕەوانەی بەرەی شەڕ بکەن.»

– «بەڵێ، سەربازانی تیپی (VE) و (ئەلپانی) و هەندێ لە بیرساگلیری هێرش دەبەن.»

– «بیرساگلیرییەکانیش لەگۆڕەپانی جەنگدا ڕایان کرد. بەلام ئێستا هەوڵ دەدەن لەبیر خۆیان بەرنەوە.»

پاسینی بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی:

– «گەورەم نابێ ڕێگەی ئەوەمان بدەی بەم جۆرە قسە بکەین.»

گوتم: «دەزانم چۆن قسە دەکەن. هەر چەندە ئێوە ئوتومبیل لێخوڕن ڕەوشتی... دەگرنەبەر»

– «ئەی... وا قسان مەکەن، ئەفسەرەکانی تر گوێیان لێمان دەبێ.»

گوتم: «پێویستە کۆتایی بەشەڕ بێنن. شەڕ بەوەستانی لایێ کۆتایی نایێ. گەر

شەڕمان لەلایەکەوە وەستاند ئەنجامی خراپتر دەبێ.»

– «پاسینی بەڕێزگرتنەوە گوتی: «خراپتر نابێ هیچ شتێ لەشەڕ خراپتر نییە.»

– «بەزین خراپترە.»

– «باوەڕ ناکەم. بەزین چییە؟ تۆ دەگەڕێیتەوە ماڵی خۆت.»

– «بەدوات دادێن و ماڵەکەت داگیر دەکەن. خوشکت زەفت دەکەن.»

پاسینی گوتی: «باوەڕ ناکەم. ناتوانن هەموو کەسێ وا لێ بکەن. با هەر کەسێ بەرگریی لەماڵی خۆی بکا. ڕێگە نەدەن خوشکەکانیان بچنە دەرەوە.»

– «دوور نییە لە سێدارەت دەن یا چۆنیان بوێ وات لێ دەکەن. دەتگەڕێننەوە ڕیزی سەربازی نەک لەناو ئوتومبیلی فریاکەوتن بەڵکو لە تیپی پیادە.»

– «ناتوانن هەموو کەسێ لە سێدارە بدەن.»

مانێرا: «نەتەوەیەکی بیانی ناتوانێ تۆ بکا بەسەرباز هەر لەیەکەم شەڕ هەموومان ڕادەکەین.»

– «وەکو چیکییەکان.»

– «وای بۆ دەچم کە تۆ هیچ شتێ دەربارەی ژیانی ژێردەستی نەزانی، بۆیە لەو باوەڕەی کە ژێردەستی خراپ نییە.»

پاسینی گوتی: «گەورەم، ئێمە لە تۆ دەگەین، ڕێگەمان بدە قسە بکەین. بەیارمەتیت، هیچ شتێ لە شەڕ بەدفەڕتر نییە ئێمە لەناو ئوتومبیلی فریاگوزاری داین. لەگەڵ ئەوەش، ناتوانین هەموو تێبگەین، کە چەند خراپە؛ کاتێ خەڵک دەزانێ چەند خراپە، ناتوانن هیچ شتێ بۆ ڕاگرتنی بکەن، چونکە شێت دەبن. هەندێ خەڵکی تریش هەن لە ئەفسەرەکانیان دەترسن. شەڕ لە نێوچەوانی ئەمانەوەیە.»

– «دەزانم شەڕ خراپە، بەڵام دەبێ کۆتایی بێنین.»

– «شەڕ کۆتایێ نایێ، شەڕ کۆتایی بۆ نییە.»

– «بەڵام هەیەتی.»

پاسینی سەری بادا گوتی:

– «بەسەرکەوتن شەڕ نابڕدرێتەوە... چی دەبێ گەر ئێمە (سان جبریل)مان داگیرکرد؟ چی دەبێ گەر ئێمە (کارسۆ) و (مونثالکون) و (ترسیتا)مان داگیرکرد؟ بەوەندە لەکوێ دەگەینە کوێ؟ تۆ ئیمرۆ ئەم هەموو چیا دوورانە دەبینی؟ تۆ لەو باوەڕەی بتوانین دەست بەسەر هەموویان دابگرین؟

مەگەر تەنیا نەمساوییەکان شەڕ ڕابگرن، تەنیا لایێ دەبێ شەڕ ڕابگرێ. بۆچی ئێمە شەڕ ڕانەگرین؟ ئەگەر بێت و ئەوان بێنە ئیتاڵیا و داگیری بکەن تەنیا ماندووبوون و دەردەسەریان بۆ دەمێنێتەوە، دەگەڕێنەوە دواوە و بەجێی دەهێڵن، ئەوانیش خاوەنی





وڵاتی خۆیانن بەڵام، نەخێر، لەجیاتی ئەمە شەڕە.»

– «دەڵێی وتاردەری.»

– «ئێمە بیر دەکەینەوە و دەخوێنین، خۆ جوتیار نین. ئێمە میکانیکین، بەڵام جوتیارەکانیش چاک دەزانن تا چ ڕادەیێ بڕوا بەشەڕ بکەن، هەموو کەس ڕقی لەم شەڕە دەبێتەوە.»

– «چینێک دەستیان بەسەر کاروباری وڵات داگرتووە، کە گێلن و لەهیچ شتێ ناگەن، ناشتوانن تێبگەن، جا بۆیە ئەم شەڕەمان بەمل داهاتووە.»

– «هەروەها لە پەنای ئەم شەڕەوە پارە کۆدەکەنەوە.»

پاسینی گوتی: «زۆربەیان کۆی ناکەنەوە. ئەوان زۆر گێلن، ئەم شەڕەیان لە پێناوی هیچ نییە، لە گێلاتیانەوەیە.»

مانێرا گوتی: «دەبێ ئەم باسە داخەین، لەڕووی گەورەمانەوە زۆرمان قسە لەبارەی شەڕەوە کرد.»

پاسینی: «ئەویش ئەم قسانەی پێ خۆشە. ئەویش وەردەگەڕێنین.»

مانێرا گوتی: «بەڵام ئێستا دەبێ ئەم باسە داخەین.»

گافۆزی گوتی: «ئەی نان نەخۆین گەورەم؟»

– «دەچم تا بزانم خواردن هاتووە.»

من وام گوت، گۆردینی هەستایە سەرپێ و لەگەڵم هاتە دەرەوە.

– «چ شتێ هەیە ئەنجامی بدەم گەورەم؟ دەتوانم یارمەتیت بدەم؟» گۆردینی لە هەر چواریان هێمنتر بوو.

گوتم: «گەر حەز دەکەی لەگەڵم وەرە بابزانین چ هەیە.»

دەرەوە تاریک بوو و ڕووناکییەکی درێژ لەلایتی پشکێنەری سەر چیاکە دەجوولایەوە. چەند لایتێکی پشکێنەری گەورەش لەم بەرە لەسەر تڕێلانەوە دانرابوون لە نزیک هێڵەکانی بەرەوە، تڕێلەکە کەمێ لە دووری ڕێگاوە ڕاوەستابوو. ئەفسەرێ ڕووی لایتی ئاڕاستەی ناوچەکرد. سەربازەکانیش هەترەشیان چوو. لە گۆڕەپانی کارگەی کەرپووچ تێپەڕین. لە بنکەی تیمارکردنی سەرەکی وەستاین. سەنگەرێکی بچووکی لێ بوو، سەر دەرگاکەی بە لق و پۆی سەوز داپۆشرابوو. لە تاریکیدا، بای شەو، خشەی لەگەڵا وشک بووەکان، بەتینی ڕۆژ، دەهێنا. لە ژوورەوە ڕووناکی هەبوو. مێجەر لەسەر تەلەفۆن بوو، لەسەر سندووقێ دانیشتبوو. کاپتنێکی پزیشک پێی گوتم: کاتی هێرش سەعاتێ هاتۆتە پێش، پێکێ کونیاکی پێشکەش کردم. سەیری مێزە تەختەکانم کرد بینیم ئەو شتانەی لەسەر مێزەکە بوون، وەکو تەشتە شووشە سەر داخراوەکان دەدرەوشانەوە. گۆردینی لە دواوەم وەستا. مێجەر تەلەفۆنەکەی تەواوبوو، هەستایەوە. گوتی: «ئێستا هێرش دەست پێدەکرێ. کاتەکەیان گەڕاندەوە سەر کاتی

پێشووی.»

تەماشای دەرەوەم کرد، دەرەوە تاریک بوو. لایتی پشکێنەری نەمساوییەکانیش لەسەر چیاکانی پشتمان دەجوولایەوە. دەقەیێ دونیا خامۆش بوو، پاشان لە تۆپەکانی پشتەوە بۆردوومان دەستی پێکرد. مێجەر گوتی: «ساڤۆی.»

گوتم: «جەنابی مێجەر، دەربارەی خواردن...»

گوێی لە قسەکانم نەبوو، بۆیە دووبارەم کردەوە.

– «هێشتا نەگەیشتووتە جێ.»

تۆپێکی گەورە هات لە دەرەوە لەنزیک کارگەی کەرپووچەوە تەقییەوە، تەقینەوەیەکی تریشی بەدواوە هات، لەگەڵ دەنگی تەقینەوەی گوێت لەدەنگی خڕەی ڕووخانی وردە خشت بوو تۆزی بەدواوە بوو وەکو باران لە ئاسمانەوە دەکەوتنە خوارەوە.

– «چ بۆ خواردن دەست دەکەوێ؟.»

مێجەر گوتی: «کەمێ ئاستا ئاسیوتا[1]مان لا دەست دەکەوێ.»

– «ئەوەی دەستتان لێی دەبێتەوە وەری دەگرین.»

مێجەر لەگەڵ سەربازێ قسەی کرد. سەربازەکە چووە دەرەوە لەبەرچاوان بزر بوو، ئەوەندەی نەبرد گەڕایەوە قاپێ (ئاستا ئەسیوتا)ی سارد و سڕی لەگەڵ خۆی هێنا. دایە دەست گۆردینی.

– «پەنیرتان لا پەیدا دەبێ؟»

مێجەر بەناڵییەوە قسەی لەگەڵ سەربازەکە کرد، بۆ جارێکی تر چووەوە ژێر زەمینەکەوە پاشان گەڕایەوە چارەگێ پەنیری هێنا، گوتم: «زۆر سوپاس.»

– «وا باشە نەڕۆیتە دەرەوە.»

لە دەرەوە شتێ لەبەر دەرگا داندرا. پیاوێ لەو دوو پیاوانەی کە شتەکەیان هەڵگرتبوو، سەری بەژوورەوە داگرت. مێجەر گوتی: «بیهێننە ژوورەوە. چیتانە؟ دەتانەوێ ئێمە بێینە دەرەوە هەڵی بگرین بۆ ژوورەوەی بێنین.»

دوو دەستەبەرە هەڵگرەکە، بریندارەکانیان لەبن هەنگڵ و قاچییەوە هەڵگرت و هێنایانە ژوورەوە.

مێجەر گوتی: «کورتەکەکەی بدڕێنن.»

مێجەر جفتەیەکی بەپارچە قوماشێ گرت، دوو کاپتنەکەی تریش چاکەتەکەیان لەبەر کردەوە. مێجەر بەدوو دەستەبەرە هەڵگرەکانی گوت: «بڕۆنە دەرەوە.»

بەگافۆزیم گوت: «وەرە بابڕۆین.»

مێجەر لەسەرشانەوە بەئێمەی گوت:

(١) جۆرە هەڕشتەیەکە.





« واچاکە تا بۆردوومان بەسەر دەچێ ئارام بگرن.»

– «ئاخر دەیانەوێ نان بخۆن.»

– «کەیفی خۆتانە.»

لە دەرەوە بەڕاکردن بەلای کارگەی کەرپووچەکەوە تێپەڕین. تۆپێ لە نزیک کەناری ڕووبارەکە تەقییەوە پاشان یەکی تریش تەقییەوە، ئێمە گوێمان لە دەنگی هاتنی نەبوو تا لەناکاو کەوتەوە. هەردووکمان خۆمان لەسەر زگ بەزەوی دادا لەگەڵ ترووسکایی، هەژانەوەی تەقینەکە و بۆنەکەیەوە گوێمان لە قرچە قرچی تەلەزم و خڕەی کەرپووچە ورد و خاشەکان بوو، کە دەکەوتنە خوارەوە. (گۆردینی) هەستایەوە بەرەو سەنگەرەکە ڕای کرد منیش بەدواوەی بووم. پەنیرەکەم هەڵگرتبوو، ڕووی پەنیرەکە بەتۆزی کەرپووچ داپۆشرابوو. شوفێرەکان لەناو سەنگەرەکەوە پشتیان بەدیوارەکە دابوو جگەرەیان دەکێشا.

گوتم: «برایانی نیشتمانی لێرەن.»

مانێرا: «ئوتومبیلەکان چۆنن؟.»

– «سەلامەتن»

– «هەترەشت نەچوو، گەورەم؟»

گوتم: «زۆر ڕاست دەکەی.»

چەقۆکەم دەرهێنا و کردمەوە. تیغی چەقۆکەم سڕیەوە، بەشە تۆزاوییەکەم بەتیغی چەقۆکە لابرد. گافۆزی قاپەکەی دایە دەستم.

– «دەست پێ بکەین گەورەم.»

گوتم: «نەخێر، لەسەر زەوی دانێ، هەموومان پێکەوە دەیخۆین.»

– «چەنگالمان نییە.»

بەئینگلیزی گوتم: «بۆ خاتری خوا!.»

پەنیرەکەم کردە چەند پارچەیێ و لەسر مەعکەڕۆنیەکەم دانا. گوتم: «دەی بفەرموون.»

دانیشتن چاوەڕوانیان کردم. منیش پەنجەی گەورە و پەنجەکانی ترم بردە ناو خواردنەکە. چەنگێکم دەرکرد، هەندێکی کەوت.

– «بەرزیان کەوە گەورەم.»

منیش ئەوەندەی دەستم درێژبوو بەرزم کردەوە، ئەوانەی ڕۆخەکان شۆڕبوونەوە. خستمە ناو دەممەوە. مژیم و گازم لە کۆتاییەکانی گرت، جویم پاشان پارچەیێ پەنیرم خوارد، جویم، پاشان پێکێ ئارەقم خواردەوە. تامی میتالێکی ژەنگاوی لێ دەهات. مەتارەکەم دایەوە دەست پاسینی. گوتی:

– «ئەمە بۆگەنە. ماوەیەکە لەناو ئەم مەتارەیە لەناو ئوتومبیلەکەم دایە.» هەموویان دەیانخوارد و چەنەگەیان لەسەر قاپەکەوە بەرز دەکردەوە سەری خۆیان بۆ دواوە دەبرد. کۆتاییەکانیان دەمژی پارویکی ترم لێ دایەوە، هەندێ پەنیر و قومێ شەرابیشم لێ دایەوە، شتێ لە دەرەوە کەوتە سەر زەوی، زەوییەکەی لەرزاند.

گافۆزی گوتی: «لە چەشنی عەیار (٤٢٠) بوو.»

گوتم: «لەناو چیادا هیچ تۆپێکی عەیار (٤٢٠)ملم نییە.»

– «ئەوان تۆپی سکۆدای گەورەیان هەیە. من چاڵەکەیم بینیوە.»

– «تۆپی عەیار (٣٠٥)یان هەیە.»

لە خواردن بەردەوام بووین. کۆکەیێ پەیدابوو، دەنگێکی وەکو دەنگی مەکینەی شەمەندەفەر دەستی پێکرد. پاشان تەقینەوەیێ جارێکی تر زەوی لەرزاندەوە.

پاسینی گوتی: «ئەم سەنگەرە قووڵ نییە.»

– «ئەمە تۆپی سەنگەری گەورە بوو.»

– «بەڵێ گەورەم.»

دوا پارچە پەنیرەکەی خۆمم خوارد، پاشان قومێ ئارەقم فڕکرد. لەکاتی هاتنی هاژەدا گوێم لە کۆکەیێ بوو، پاشان دەنگی تشو-تشو-تشو-تشو هات، پاشان ترووسکاییێ وەکو ئەو ترووسکاییەی لەکاتی دەرگا کردنەوەی فڕنی، لە فڕنییەوە دەردەچێ. نەڕەی براوسکەی تۆپ دەستی پێکرد. ترووسکاییەکە لەسەرەتادا سپی بوو پاشان سوور هەڵگەڕا. بەم شێوەیە لەگەڵ با بەردەوام بوو. ویستم هەناسە بدەم، بەڵام هەناسەم نەدەهات. هەستم بەوە کرد کە خەریکە لە پێستەی خۆم دەربچمە دەرەوە. دەرچمە دەرەوە، دەرچمە دەرەوە، دەرچمە دەرەوە، بەدرێژایی ئەو کاتە لەشم هەموو لەناو بادا بوو، بەگورجی چوومە دەرەوە.

وامزانی مردوومە، پاشانیش سەراوکەوتووم. شتێکی زۆر هەڵەیە پیاو خۆی بەمردوو دابنێ. لەجیاتی ئەوەی بۆ پێشەوە بچم وام هەست کرد بۆ دواوە خلیسکاوم. هەناسەم دا بۆ دواوە گەڕامەوە.

زەوی قلێشابوو لەو لای سەرمەوە تەختەدارێ هەبوو پارچە پارچە بووبوو. لەگەڵ ئەو شتەی لەسەرمدا دەلەرایەوە گوێم لە هاواری یەکێ بوو. هەسم کرد یەکێ ناڵە ناڵیەتی. ویستم بجووڵێمەوە. بەڵام نەمتوانی بجووڵێم. گوێم لەدەنگی شەست تیر و تفەنگان بوو. ئەوبەری ڕووبارەکەیان ئاگرباران کرد، گوللە پرژا بوو و ڕۆشنە گوللەم[1] بینی

بەرز دەبۆوە و دەتەقینەوە و سەریان دەکرد، سپی بوون، موشەک بەرز دەبووەوە گوێم لە تەقینەوە بوو. ئەمە هەمووی لەماوەی تاوێ بوو، پاشان لە نزیک خۆمەوە گوێم لە

(١) طلقة التنوير





هاواری یەکێ بوو، دەیگوت: «ئای دایە، ئای دایە.» قاچی خۆمم خشاند. نووشتاندمەوە، سووڕامەوە. دەستم لێدا (پاسینی) بوو.

کاتێ دەستمی بەرکەوت هاوارێکی لێ بەرز بووەوە.

قاچی لەلای من بوو. لە تاریکی و ڕووناکیدا بینیم. هەردوو قاچی تا سەر چۆکی شکابوون.

قاچێکی بەتەواوی پەڕیبوو. قاچەکەی تریشی بەدەمارەوە لەگەڵ بەشێ لە پانتۆڵەکەیەوە وەمابوون. قونکەکەی موچرکی پیا دەهات و خرنکەی دەدا.

هەروەک بەلەشییەوە نەنووسابێ. گەزەی لە باسکی خۆی دەدا و دەینالاند (ئای دایە، ئای دایە) پاشان گوتی: «Diote salve maria, Diote Salve» ئای خوایە بمکوژە. ئای مەسیح بمکوژە، ئای دایە، دایە، ئای ماریا ئەم ئازارەم لەکۆڵ بکەوە. ئەی خوایە ئەم ئازارەم ڕابگرە، ڕابگرە. ئەی عیسا، ئەی مریەمی پیرۆز، ئەم ئازارەم ڕابگرە، ئای، ئای، ئای.»

بەدەنگێکی کز گوتی: «ماما، ماما میا...» پاشان هێمن بوو، گەزەی لە باسکی خۆی دەگرت، قونکی ڕانی هەڵدەلەرزی. هاوارم کرد:

– «ئەی دەستەبەرە هەڵگرینە. ئەی دەستە بەرەهەڵگرینە.»

ویستم لە (پاسینی) نزیک بمەوە تا بەشەتەکدەر قاچی شەتەکدەم بەڵام نەمتوانی بجووڵێم. جارێکی تر هەوڵم دا، قاچم کەمێ بەدوامدا هات توانیم لەسەر هەنیشک بۆ دواوە بگەڕێمەوە. (پاسینی) ئارامی گرتبوو. لە تەنیشتی دانیشتم کورتەکی خۆمم کردەوە هەوڵم دا دامێنی کراسەکەم بدڕێنم. بەڵام، نەمتوانی بیدڕێنم، گازم لە دامێنی کراسەکەم گرت تا بەددانم بیدڕێنم. پاشان دۆلاخی (پاسینی)م هاتە بیر. من گۆرەوی خوریم لە پا بوو. بەڵام شوفێرەکان بەلەک پێچیان بەستبوو. بەڵام پاسینی یەک قاچی مابوو. کاتێ هەستامەوە سەرپێ بۆ ئەوەی بەلەک پێچەکەی لە قاچی بکەمەوە. بینیم تازە پێویست بەوە ناکا شەتەکدەری بۆ بکەم، چونکە دوا هەناسەی کێشا و ماڵئاوایی لێ کردین.

چوومەوە سەری تا بزانم بەڕاست مردووە. سێ هاوڕێ ماون دەبێ بدۆزرێنەوە. ویستم بەقیتی دانیشمەوە، کاتێ وام کرد شتێکی قورس لەناو سەرمدا وەکو ئەو قورساییەی لەسەر چاوی بووکەشووشەدایە... لە دواوە خۆی لە پشتی چاوم دەدا. هەستم کرد قاچم گەرم داهاتووە و پێڵاوەکانیشم تەڕ ببوون و لەناوەوە گەرم بوو، زانیم بریندارم. ڕاکشامە سەر زەوی. دەستم لەسەر چۆکم دانا. چۆکم لە شوێن خۆی نەمابوو. دەستم بەرەو خوارتر ڕەوان کرد، چۆکم چووبووە خوارەوە، بەرەو لوولاقم داکشابوو. دەستم بەکراسەکەم سڕییەوە. ڕووناکییەکی تری ڕۆشنکەرەوە بەشێنەیی کەوتە خوارەوە، سەیری قاچم کرد، زۆر ترسام، گوتم ئەی خوایە لێرەم ڕزگارکە. زانیم، هەرچۆنێ بێ سێ کەسی تر لێرە هەبوون. ئەوان چوار شوفێر بوون، پاسینی مرد و سێ کەسی

بەجێهێشت. یەکێ منی لە هەنگڵەوە هەڵگرت و یەکی تریش قاچمی بەرز کردەوە.

گوتم: «سێ کەسی تر لێرەن، یەکیش مردووە.»

– «ئەوە منم مانێرا. چووین دەستەبەرە بێنین، بەڵام هیچی لێ نەبوو. چۆنی گەورەم؟.»

– «گۆردینی و گافۆزی لە کوێنە؟»

– «گۆردینی لە بنکەی پزیشکییە، چووە برینەکەی تیمار بکا. گافۆزیش وا قاچی گرتووی. ملم باش بگرە. ئایا برینەکەت سەختە؟.»

– «لەقاچمەوەیە. گۆردینی چۆنە؟»

– «سەلامەتە؛ ئەم تۆپە تۆپی سەنگەری گەورەبوو.»

– «پاسینی مرد.»

– «بەڵێ، مرد.»

تۆپێ لە نزیکمانەوە بەزەوی کەوت. منیان بەسەر زەوی دادا خۆشیان لەسەر زەوی درێژ بوون.

مانێرا گوتی: «ببوورە گەورەم– باوەش بکە بەملمدا.»

– «ئەگەر جارێکی تر بەرم دەنەوە...»

– «بۆیە لەدەستمان کەوتی چونکە هەترەشمان چووە.»

– «ئێوە بریندار‌بوون»

– «برینی هەردووکمان سووکە.»

– «ئایا (گۆردینی) دەتوانێ ئوتومبیل لێ بخوڕێ؟»

– «لەو باوەڕەدانیم.»

بەر لەوەی بگەینە بنکە پزیشکییەکە جارێکی تر بەریان دامەوە.

– «ئەی کوڕی سۆزانینە.»

مانێرا گوتی:

«ببوورە، گەورەم، جارێکی تر بەرت نادەینەوە.»

لە دەرەوەی بنکەکەوە برینداریکی زۆر لەسەر زەوی لە تاریکی درێژ کرابوون. دەستەبەرە هەڵگرەکان برینداره‌کانیان هەڵدەگرت و دەیان هێنایە ژوورەوە و دەیان بردنە دەرەوە. کاتێ پەردەکان دەکرانەوە هەندێ برینداری تریان دەهێنایە ژوورەوە یان دەیانبردنە دەرەوە. ڕووناکی لە بنکەکە هاتە دەرەوە. مردووەکان لەلایێ درێژ کرابوون. پزیشکەکانیش قۆڵ و باسکی خۆیانیان تا سەر شانیان هەڵکردبوو، وەکو قەسابان لەخوێندا سوور ببوون. ژمارەیەکی کەمی دەستەبەرەی لێ هەبوو. برینداره‌کان هاتوهاواریان بوو. بەڵام زۆربەیان نقەیان لێوە نەدەهات. با گەڵای سەر کەپری دەرگای





بنکەکانی دەجوولاندەوە. شەویش بەرەو ساردی دەچوو. دەستەبەرە هەڵگرەکانیش هەر لە هاتوچۆ بوون. برینداریان دەهێناو دایان دەنان و دەگەڕانەوە. کاتێ منیان گەیاندە بنکەی دواوە (مانێرا) باشچاوشێکی هێنایە دەرەوە. هەردوو قاچمی بەشاش بەستەوە. گوتی تۆز و خۆڵێکی زۆر چووەتە ناو برینەکەم، ئەم تۆز و خۆڵە نەیهێشتووە خوێنێکی زۆر لە لەشم دەرچێ. هەر کاتێ دەرفەت ببێ ڕەوانەم دەکەن. ئەو چووە ژوورەوە. مانێرا گوتی: گۆردینی ناتوانێ ئوتومبیل باژوا شانی شکاوە. سەری ئازاری پێ گەییووە. خراپ نەبوو بەڵام ئێستا شانی ڕەق بووە. ئەو لەتەک دیوارێکی کەرپووچ دانیشتبوو. هەر یەکێ برینداریکی بەکۆڵ خۆیدا دابوو. لە توانایان دابوو، ئوتومبیل لێخوڕەکانی بەریتانییەکان هاتن سێ ئوتومبیلی فریاگوزاریان هێنا، لەهەر یەکێ دوو پیاوی تیابوو. یەکێ لە شوفێرەکان هاتە لام گۆردینی بۆ لای منی هێنا. ڕەنگ پەڕیو و نەخۆش دیاربوو. بەریتانییەکە خۆی داهێنایەوە و گوتی:

«خۆ برینەکەت کاریگەر نییە؟» فیتە زەلامێ بوو چاویلکەیەکی چوارچێوە پۆڵای لە چاوا بوو.

– «بەقاچم کەوتووە.»

– «هیوادارم مەترسی نەبێ. جگەرەیێ نافەرمووی؟»

– «سوپاست دەکەم.»

– «پێیان گوتم: زیانتان دوو شوفێرە.»

– «بەڵێ، یەکێکیان مرد ئەوی تریشی ئەوە بوو، بەدوای تۆدا هات؟»

– «چ بەخت ڕەشییەکە! حەز دەکەی ئێمە ئوتومبیلەکان وەربگرین؟.»

– «خۆشم نیازی ئەوەم هەبوو، دەمویست پێتی بڵێم.»

– «باش ئاگاداریان دەبین. دەیان بەینەوە ڤێلایەکە. تۆ لە ئۆردووگای ژمارە (٢٠٦)نی؟.»

– «بەڵێ.»

– «شوێنێکی دلڕفێنە. تۆم لە دەوروبەری ئەوێوە بینیوە. پێیان گوتم ئەمریکی.»

– «من ئینگلیزم.»

– «توخوا ئینگلیزی؟»

– «بەڵێ لەو باوەڕەبووی ئیتاڵی بم؟ هەندێ ئیتاڵی لەیەکەکەی ئێمە هەن.»

گوتم: «ئیشێکی زۆر چاکە گەر ئوتومبیلەکان وەربگری.»

گوتی: «دەبێ زۆر ئاگاداریان بم. –هەستایە سەر پێ– «ئەم شوفێرە لاوەت زۆری لێ کردم بێم چاوم پێت کەوێ.» دەستێکی لە شانی گۆردینی دا. گۆردینی ڕاچەنی و بزەیەکی هاتێ ئینگلیزەکەش بەخێراوە بەئیتاڵییەکی تەواوەوە گوتی: «ئێستا هەموو

شتێ تەواوە. ئەفسەرەکەی تۆم بینی. هەردوو ئوتومبیلەکە وەردەگرین خەفەت مەخۆ.» کەمێ لەقسە وەستا دوایی گوتی: «دەبێ شتێکی وا بکەم لێرەت ڕزگار بکەم. دەبێ چاوم بەلێپرساوە پزیشکییەکان بکەوێ و لەگەڵ خۆما بتبەم.»

بەرەو بارەگاکە چوو، بەهۆشیارییەوە هەنگاوی لەنێوان بریندارەکان دەهاویشت، پەتۆکەی لادا، ڕووناکی هاتە دەرەوە، چووە ژوورەوە.

گۆردینی گوتی: «ئاگاداری تۆ دەبێ گەورەم.»

– «چۆنی فرانکۆ؟» لە تەکمەوە دانیشت، پاش تاوێ، پەتۆکە لادرایەوە. دوو دەستەبەرە هەڵگرە هاتنە دەرەوە، لەگەڵ دوو ئینگلیزەکەوە بوون. یەکسەر بۆ لای منیان هێنا بەئیتاڵی گوتی: «وەرە، وەرە، پاڵەوانێکی خوێناوی مەبە.» بەئیتاڵی بەدەستەبەرە هەڵگرەکانی گوت: «ئاگاداری بن، زۆر بەدیقەت لەقاچییەوە هەڵیگرن، قاچەکانی ئازاریان زۆرە، کوڕی ڕاستەقینەی سەرۆک ولسنە.» بۆ ژوورەوە هەڵیان گرتم، لە ژوورەوە، لەسەر هەموو مێزێ کاری نەشتەرگەری بەڕێوە دەچوو. مێجەرێکی کورتە باڵا بەشێتگێرییەوە تەماشای ئێمەی کرد. منی ناسییەوە. مقاشەکەی دەستی جوولاند. «Cava bien»

– «Cava» ئینگلیزەکە بەئیتاڵی گوتی: «من هێناومەتە ژوورەوە. تاقە کوڕی سەرۆکی ئەمریکی (ولسن)ە، تا چارەی دەکەن لێرە دەمێنێ. پاشان لەگەڵ باری یەکەم ئوتومبیل، لەگەڵ بریندارەکان ڕەوانەی دەکەم.» خۆی هێنایەوە و گوتی: «دەچم بەدوایی یاریدەدەر دەگەڕێم، تا ڕاپۆرتەکەی پێ تەواو بکەم، دەبێ هەموو شتێ بەخێرایی ئەنجام بدەم.» لە چوونە دەرەوەدا سەنگرایەوە. تا سەری بەسەردەرەکە نەکەوێ، مێجەر مقاشەکەی لەناو قاپێ دانابوو. چاوم بڕیبووە دەستی شاشی دەبەست. دەستەبەرە هەڵگرەکان پیاوەکەیان لەسەر مێزەکە داگرتە خوارەوە.

کاپتنی گوتی: «چارەی ئەفسەرە ئەمریکییەکە دەکەم.»

بۆ سەر مێزەکە بەرزیان کردمەوە. مێزەکە ڕەق و لیژ بوو، بۆنێکی دڵ گوشێنەری گران و بۆنی کیمیاوی و خوێنی لێ دەهات. پانتۆڵەکەمیان لەبەر کردمەوە. پزیشکە کاپتنەکە، برین پێچەکەی ئاگادار کردەوە و بەخۆشی خەریکی ئیشکردن بوو. پێی گوت: «چەند برینێکی سەر گۆشت لەشلکەی هەردوو ڕان و هەردوو چۆک لەگەڵ پێی ڕاستە. برینی چۆک و پێی ڕاستەی کاریگەرن، لەگەڵ داماڵانی چەرمی سەری – دەستێکی لێدا– ئازاری هەیە؟ بەڵێ، بە مەسیح. دەشێ لە کاسەی سەری شکان هەبێ، کە لە کاتی خزمەتکردندا لەبەرەکانی جەنگدا بەسەری هاتووە. ئەمە لە دادگای سەربازی قورتارت دەکات. نەبادا بەئەنقەست وات لە خۆ کردبێ. حەز دەکەی بڕاندی بخۆیتەوە؟ ئەمە چۆن ڕووی دا؟ دەتویست چ ئەنجام بدەی؟ ئایا تۆ هەوڵی خۆکوشتنت دەدا؟ زەحمەت نەبێ کەمێ دەرمانی دژ بەدەردەکۆپان... نیشانەی خاچ لەسەر هەردوو قاچەکەی بکێشە. سوپاست دەکەم. دەبێ ئەمە کەمێ پاکژ کەمەوە. دەیشۆم و دەرمانی





دەکەم تۆ خوێنت زۆر بەچاکی دەمەیی.» یاریدەدەرەکە سەری لەسەر کاغەزەکانم هەڵبڕی.

– «چ برینداری کردووی؟»

کاپتنەکە گوتی: «چیت پێ کەوت؟» منیش بەچاوی نوقاوەوە گوتم: «پڕووشکی تۆپی سەنگەر.»

کاپتن شتێکی کرد، زۆر ئازاری دام. شانە گۆشتینەکانمی دەبڕی و گوتی: «دڵنیایت.»

منیش دەمویست لەسەر پشت بە کڕ و بێدەنگی بمێنمەوە. لەگەڵ بڕینی گۆشتەکەم هەستم بەلێدانی گەدەم کرد. گوتم: «وا تێدەگەم.»

کاپتنی پزیشک، شتێکی لەناو برینەکەم دۆزیەوە سەرنجی ڕاکێشا. گوتی: «ئەمەتا تەلەزمی تۆپی سەنگەری گەورەی دوژمن. بەدوایی هەندێکی تر دەگەڕێم گەر ڕەزامەندیت لەسەر بێ. هەرچەندە ئەمە پێویست نییە. ئەوانە هەمووی بۆیە دەکەم. ئایا ئازارت دەدا؟ ئەم ئازارە لەچاو ئەو ئازارەی دوایی هەستی پێدەکەی هەر هیچ نییە. هێشتا ئازار دەستی پێ نەکردووە. بڕاندی بۆ بێنە. شلەژان ئازار سڕ دەکا، ئەمە زۆر باشە. بەڵام دڵە ڕاوکێی ناوێ، ئەگەر ئەمە کاری تێ نەکا. بەتایبەتی ئێستاکە سەرت چۆنە؟»

گوتم: «ئەی خوایە!»

– «مادام کاسەی سەرت بریندارە چاکتر وایە بڕاندی زۆر نەخۆیەوە، ئەگەر تەڵەزمی تیایە، خۆ تۆ ناتەوێ هەو بکات، ئازارەکەی چۆنە؟» ئارەقە لە لەشم چۆڕایەوە. «ئەی خوایە.»

– «وای بۆ دەچم کاسەی سەرت شکابێ. شاشی لێ دەبەستم سەرت مەسووڕێنە.» شاشی لێ پێچا دەستەکانی زۆر بەخێرا دەهێنا و دەبرد و شاشەکەشی زۆر بەچاکی جێگەی خۆی گرت.

– «زۆر باشە. بەختێکی باش و بژی فەرەنسا.»

کاپتنی گوتی: «ئەمریکییە.»

کاپتنەکە گوتی: «وامزانی گوتت فەرەنسییە. بەفەرەنسی قسە دەکا. پێشتر ناسیومە. لەو باوەڕە بوومە فەرەنسی بووە.» نیو پێک کۆنیاکی خواردەوە و گوتی: «کەمێکی تر بێنە. کەمێکی تر دەرمانی دژ بەدەردەکۆپان بێنە.»

کاپتن ئیشارەتی بۆ من کرد. بەرزیان کردمەوە. پەتۆکەی دەرگاکە لەکاتی هاتنە دەرەوە سەر و چاومی داپۆشی برین پێچی یاریدەدەر لە دەرەوە لەو جێگەی ڕاکشابووم، لە تەنیشتم چۆکی دانەوە. بەنەرمی پرسی: «ناوت؟ ناوی باوکت؟ پایەت؟ شوێنی لەدایکبوونت؟ لە کام لەشکری؟.» چەند پرسیارێکی لەم بابەتە... «زۆر بەداخەوە بۆ

سەرت، هیوادارم چاکتر ببی ئێستا لەگەڵ ئوتومبیلە ئینگلیزییەکە ڕەوانەت دەکەم.»

– «زۆر باشم. سوپاست دەکەم.» ئەو ئازارەی کاپتن قسەی لێ کرد دەستی پێکرد هەموو ئەو کارانەیان بەبێ بەرژەوەندی و ناسیاوەتی بۆ کرد. پاش ماوەیێ ئوتومبیلی فریاگوزاری ئینگلیزی گەیشتەجێ. لەسەر دەستەبەرەیەکیان دانام. دەستەبەرەکەیان تا ئاستی سکەی ئوتومبیلەکە بەرز کردەوە، پاشان بۆ ژوورەوە پاڵیان پێوە نام. دەستەبەرەیەکی تر لە تەنیشتمەوە بوو، پیاوێکی لەناو درێژکرابوو. تەنیا لووتی دیار بوو، مۆمی دەچوویەوە و شاشی لێ نەبەسترابوو. زۆر بەزەحمەت هەناسەی دەدا. چەند دەستەبەرەیەکی تریان بەرزکردەوە، بۆ سەر سکەکانی سەرەوەیان پاڵ نا. شوفێرە ئینگلیزە درێژەکە هات و فیتە بەدەورەیەکی کرد و سەرێکی بەناوەوە داگرت و گوتی: «بەهێواشی و لەسەرخۆ داژۆم، هیوادارم ئاسوودە دەبن.» هەستم کرد مەکینەکە بەگڕ کەوت. شوفێرەکە سواری ئوتومبیلەکە بوو، لەسەر کوشینەکەی پێشەوە دانیشت، هەندڵ برێکەکەی داگرت و پێی خستە سەر کلاج. ڕۆیشت. بەکڕی درێژ بووم، لێ گەڕام با ئازار سواری کۆڵم بێت.

ئوتومبیلەکە بەسەر هەورازێ کەوت، لەبەر قەڵەباڵغی ڕێگاکە لە ڕۆیشتن زۆر سست بوو. هەندێ جار دەوەستا، جار نا جاریش لە لۆفەیەک دەگەڕایەوە دواوە. لە پاشا بەخێراییەکی زۆر سەرکەوت. هەستم کرد شتێ دڵۆپەی دەکرد، لەسەرەتاوە زۆر بەهێواشی و بەڕێکی کەوتە خوارەوە. پاشان بوو بەخوڕ بانگی شوفێرەکەم کرد. ئوتومبیلەکەی ڕاگرت، لە کولانکەی پشت کوشینەکەیەوە سەیری ناوەوەی کرد، گوتی: «چی بووە؟»

– «ئەو پیاوەی سەرەوەی من خوێنی بەربووە.»

– «لەسەری لوتکەکەوە دوور نین، بەتەنیا توانای هەڵگرتنی دەستەبەرەکەم نییە. ناتوانم بیهێنمە دەرەوە.»

ئوتومبیلەکەی بەئیش خستەوە. خوێن بەردەوام بوو، لە تاریکیدا لە توانامدا نەبوو، بینیم خوێنەکە لەکام شوێنی مشەمایەکەی سەرەوەی من دێ. هەوڵم دا بچمە لایەکی ترەوە، تاوەکو خوێنەکەم بەسەر دانەڕژێ. لەو شوێنەی کە کەوتمە خوارەوە هاتە ژێر کراسەکەمەوە خوێنەکە گەرم و لیچ بوو. سەرمام بووم و قاچەکانم ئازاریان دام. نەخۆشی کردم. پاش ماوەیێ خوێنەکە کەمتر بۆوە، بووەوە دڵۆپ دڵۆپ، گوێم لێ بوو و هەستم کرد مشەماکەی سەرەوەم دەجوولێتەوە تا پیاوی ناو دەستەبەرە چووەوە باوەشی ئارامی یەگجارییەوە و ئۆقرەی گرت. کابرای ئینگلیزەکە لە کولانکەکەوە گوتی: «کابرا چۆنە؟ خەریکە دەگەینە جێ؟»

گوتم: «وا بزانم تەواو بوو!»

دڵۆپە خوێنەکان زۆر بەهێواشی کەوتنە خوارەوە، دەتگوت چۆڕاوەی چلوورەی خۆرئاوان. ژوورەوەی ئوتومبیلەکە سارد بوو. لە ڕێگا شەویش ڕێگاکە هەموو هەوراز





بوو. لە بنکەی پزیشکی سەر لووتکەکەوە دەستەبەرەکەیان داگرتە دەرەوە یەکی تریان لە شوێنی دانا.

ئێمەش لە ڕۆیشتن بەردەوام بووین.

## 10

لە قاوشی نەخۆشخانەی مەیدانەوە پێیان گوتم پاش نیوەڕۆیێ میوانێ دەیەوێ بێتە سەردانم. ڕۆژێکی گەرم بوو، ژوورەکەش مێشی گەلێ زۆر بوو. یاوەرەکەم کاغەزێکی بڕی و کردیە چەند تیلمێ. تیلمەکانی لە دارێ بەست و مێش ڕەوێکی لێ دروست کرد تا مێشم لێ پاس بکا. بینیم مێشەکان بەساپیتەکەوە نووسابوون. کاتێ لە پاسکردن وەستا و خەوی لێکەوت، دابەزین و هاتنە گیانم خۆم مێشەکانم لەخۆم پاس کرد. لە ئاخری بەهەردوو دەستم چاوەکانم داپۆشی و لێ کەوتمە خەو. ڕۆژێکی زۆر گەرم بوو. کە واگا هاتم قاچەکانم وەخورشت کەوتبوون. یاوەرەکەم لەخەو کرد و، هەندێ ئاوی کانزای بەسەر لەفافەکەدا ڕشاند. ئەمە وای لە جێگەکەم کرد فێنک و شێدار بێ. نەخۆشە بەخەبەرەکان یەک بەقاوشەکە قسەیان دەکرد. پاش نیوەڕۆیەکەی کڕ و بێدەنگ بوو. بۆیە بەیانی سێ برین پێچ و دکتۆرێ لەسەر جێگەکەی هەڵیان دەگرتین و بۆ ژووری تیمارکردنیان دەبردین تا جێگەکانمان ڕێک بخەن و برینەکانمان لە ژووری تیمارکردن تیمار بکەن. گەشتەکانمان بۆ ژووری تیمارکردن گەشتێکی خۆش نەبوو. تا درەنگ نەمزانی کە جێگەکانمان بەهۆی پیاوانی وانەوە ڕێک خرا. یاوەرەکەم لەئاو ڕشاندن بووەوە، جێگەکەم فێنک و دڵگیر بوو، منیش ئەو شوێنانەم پێ دەگۆت، لەبنی پێمەوە، کە پێویستیان بەخوراندن هەبوو تا بیان خورێنێ، کە دکتۆرێ لەگەڵ ڕینالدی هاتە ژوورەوە. زۆر بەگورجی بۆ لام هات. ڕینالری خۆی لەسەر قەروێلەکەم داهێنایەوە و ماچی کردم. دەستەوانەی لەدەستی دابوو.

– «ها، ڕۆڵە، چۆنی؟ چۆن هەست دەکەی؟ ئەوەم بۆ هێناوی.» قاپێ کۆنیاک بوو. یاوەرەکەم کورسییەکی بۆ هێنا لەسەری دانیشت. گوتی: «هەواڵێکی خۆشیشم بۆ هێناوی. خەڵات دەکرێی، دەیانەوێ مەدالیای زیوت پێ بدەن، بەڵام لەوانەیە ئەوان بتوانن تەنیا برۆترییەکت بۆ وەرگرن.»

– «لەبەرچی؟»

– «چونکە برینەکەت دژوارە. گوتوویانە گەر بتوانی بسەلمێنی کە چ کارێکی پاڵەوانانەت نواندووە، بەمەدالیای زیوی خەڵات دەکرێی ئەگینا تەنیا بەمەدالیای برۆنزی خەڵات دەکرێی. سەربردەکەم بەتەواوی بۆ بگێڕەوە. چ ڕووی دا. چ کارێکی پاڵەوانانەت کردووە؟»

گوتم: «نەخێر، کاتێ پەنیرمان دەخوارد بۆردوومان کراین.»

– «بەڕاستی دەبێ شتێکی پاڵەوانانەت کردبێ. لە پێش یا لە پاش بریندا ربوون. بەوردی بیر بکەوە؟»

– «نەخێر، شتی وام نەکردووە.»

– «هیچ کەسێکت بەپشتی خۆت هەڵنەگرتووە؟ گۆردینی دەڵێ تۆ چەند کەسێکت بەپشتی خۆت گواستۆتەوە، بەڵام مێجەری پزیشکی بنکەی یەکەم گوتی زۆر زەحمەتە شتی وا بکا. ئەم قسەیەش پێویستی بەشایەدی و ساغکردنەوەیە.»

– «هیچ کەسێکم هەڵنەگرتووە. نەم توانیوە بجوولێمەوە.»

ڕینالدی گوتی: «ئەمە بە گرینگ نییە»

– «دەستەوانەکانی لەدەست کردنەوە.»

– «لەو باوەڕەم بتوانین مەدالیای زیویت بۆ وەرگرین، ئەی ئەوەت ڕەت نەکردبۆوە کە پێش برینداره‌کان تیمار بکرێی؟.»

– «بەڵام زۆر لەسەری سووڕ نەبووم.»

– «ئەوەندە بەسە. سەیرکە چ برینێ بریندار بووی. تەماشای ئەم ڕەفتارە ئازایانەت بکە. هەردەم داوای چوونە پێشەوەی بەرەکانی جەنگت کردووە. سەرەڕای ئەوەش هێرشی ئەم دواییە سەرکەوتوو بووە.»

– «ئایا لە پەڕینەوەی ڕووبارەکە سەرکەوتوو بوون؟.»

– «زۆر بەسەیرەوە... نزیکەی هەزار دیلیان گرت. ئەمە لە بەیاننامە ڕەسمییەکەدا هاتووە. تۆ نەتخوێندۆتەوە؟»

– «نەخێر.»

– «بۆتی دەهێنم. سەرکەوتوو بوو.»

– «کاروبار چۆنە؟.»

– «مەزنە، هەمووومان زۆر مەزنین. هەموو کەسێ شانازیت پێوە دەکا. وە ئێستا جا باوەڕم پێ دەکەی، پێم بڵێ. زیوییەکەش هەر وەردەگری. دەی دە پێم بڵێ هەموو شتێکم دەربارەی بریندا ربوونت بۆ بگێڕەوە.»

تۆزێ لەقسە وەستا بیرێکی کردەوە، گوتی: «لەوانەیە مەدالیاییێکی ئینگلیزیش وەرگری. کابرایەکی ئینگلیززمان لەوێ بووە. دەبێ چاوم پێی بکەوێ. دەبێ تۆ هەڵبژێرێ، دەبێ شتێکی پێ بکرێ. زۆر ئازار ناکێشی؟ بخۆرەوە. ئەرێ هۆ یاوەر! بڕۆ تەپەدۆرکێش بێنە. خۆزیا بتدیبا کە چیم کرد لەلابردنی سێ مەتر لە ڕیخۆڵە. ئێستاش لە هەموو کاتێ باشترە. ئەم هەواڵە شایانی ئەوەیە لە ڕۆژنامەی (لاتیسیتا) بڵاوبکرێتەوە. تۆ پەرچەڤەی دەکەیت و بۆ (لاتیسیتا)ی دەنێرم. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەنگاوی چاکتر دەنێیم ئەی نەزانی هەژار چۆن هەست دەکەی؟ کوانێ ئەو تەپەدۆرکێشە نەفرەت لێکراوە؟! تۆ زۆر ئازا و هێمنی. خۆ لە بیرم چوو تۆ ئازار دەکێشی.»





دەستەوانەکانی لەسەر قەراغی جێگەکەم کوتا.

یاوەرەکە گوتی: «ئەوەتە تەپەدۆرکێشەکە گەورەم.»

– «سەری بوتڵە کۆنیاکەکە هەڵگرە و پەرداخێ بێنە ئەمە بخۆوە ڕۆڵە. سەرە هەژارەکەت چۆنە؟ تەماشای ڕاپۆرتەکەم کرد. شکستی نییە. ئەو مێجەرەی بنکەی یەکەم قەسابی بەرازانە. گەر من بوومایە، هەرگیز ئازارم نەدەدای. من ئازاری هیچ کەسێ نادەم. دەزانم چۆن ئەنجامی دەدەم. هەموو ڕۆژێ شتێ فێر دەبم. کە چاکتر و نەرمتر لە جاران ئەنجامی دەدەم، نەزان. زۆر شڵەژام کە بەسەختی برینداری. فەرموو، ئەمە بخۆرەوە ئەمە زۆر باشە! پازدە لیرەی تێچووە! دەبێ باش بێ؛ نیشانەی پێنج ئەستێرەیە! پاش ئەوەی لێرە دەڕۆم، دەبێ بچمە لای ئینگلیزەکە دەبێ مەدالیای ئینگلیزت پێ ببەخشێ.»

– «چاک بزانە بەم شێوەیە مەدالیا نابەخشن.»

– «تۆ زۆر بێ فێزی، ئەفسەری پەیوەندی بەستن دەنێرم ئەویش ئەو کاتە دەتوانی ئینگلیزەکە دڵنەرم کا.»

– «تۆ بارکلیت بینیوە؟»

– «بۆ ئێوەی دێنم. هەر ئێستا دەڕۆم بۆ ئێرەی دێنم.»

گوتم: «مەڕۆ. ئەی دەنگوباسی کۆریزیا چییە؟ کچان چۆنن؟»

– «هیچ کچی تیا نییە. وا بۆ دوو هەفتە دەچێ نەیان گۆڕیون. چیتر ناچم بۆ ئەوێ، شەرمەزارییە. ئەوان کچ نین بەڵکو هاوڕێی لە مێژینەی شەڕن.»

– «هەرگیز ناچیتە کۆریزیا؟»

– «تەنیا بۆ ئەوە دەچم تا بزانم هیچی تازە هەیە. لەوێ دەوەستم. هەموو لە تۆ دەپرسن. شەرمەزارییە. ماوەیەکی زۆر لەوێ دەمێنیتەوە. تا دەبنە هاوڕێت.»

– «لەوانەیە کچان خۆیان نەیانەوێ چیتر بۆ بەرەکانی جەنگ بچن.»

– «نەخێر، ئارەزووی چوونیان هەیە. کچیان زۆرن. ئەمە تەنیا کارگێڕییەکی خراپە، ئەوان بۆ ڕابواردن، لەناو سەنگەرەکان، لە دواوەی هێڵەکان لەگەڵ خۆیان دەیان هێڵنەوە.»

– گوتم: «ئەی ڕینالدی هەژار تۆ بەتەنیا لە شەڕ دای بێ ئەوەی هیچ کچی تازەت لەگەڵا بێ.»

ڕینالدی پێکێکی تر کۆنیاکی بۆ خۆی تێکرد.

– «باوەڕ ناکەم ئەمە ئازارت بدا. ڕۆڵە ئەمە وەرگرە.»

کۆنیاکەکەم خواردەوە، هەموو هەناومی گەرم کردەوە.

ڕینالدی پێکێکی تری تێکرد، ئێستا هێمنتر ببووەوە. پێکەکەی هەڵگرت. گوتی:

«پێکی برینە پاڵەوانانەکەت لە چاوی مەدالیا زیوەکەت: پێم بڵێ، ڕۆڵە، ئەرێ کاتێ ئەو ماوەیە زۆرە لەو هەوا گەرمە پاڵدەکەوی بێزار نابی؟.»

– «هەندێ جار.»

– «بەخەیاڵم دانایێ. بتوانم بەم شێوەیە لێرە پاڵ بکەوم. لەوانەیە شێت بم.»

– «جا خۆ شێتی.»

– «بەو هیوایەم بگەڕێتەوە. هیچ کەس نییە لەشەودا لە مێبازی بگەڕێتەوە و بێتە لام. کەس نییە فشەی پێ بکەم، کەس نییە پارەی بەقەرز لێ وەربگرم، برای خوێنیم، هاوڕێی ژوورەکەم نابینم. بۆچی خۆت بریندارکرد؟.»

– «دەتوانی گاڵتە بەقەشە بکەی.»

– «ئەو قەشەیە. من گاڵتەی پێ ناکەم. بەڵکو کاپتن گاڵتەی پێ دەکا. من ئەوم خۆش دەوێ. گەر قەشەمان بوێ، هەر ئەو قەشەیەمان هەیە. دێتە سەردانت. چاک بەخۆکەوتووە بێتە لات.»

– «خۆشم دەوێ.»

– «ئاه، ئەوەم زانی وای بۆ دەچم کە تۆ و ئەو لەهەندێ شت لێک حاڵی دەبن، تۆش دەزانی.»

– «نەخێر، وانییە.»

– «بەڵێ، هەندێ جار وا دەکەم. لە هەندێ کەمێ شت وەکو ئمرەی پەلی یەکەمی تیپی (ئان کۆنا).»

– «ئۆه، دەبڕۆ ئاوئاو بچی.»

ڕینالدی هەستایە سەرپێ. دەستەوانەکانی لە دەستی هەڵکێشایەوە.

– «ئۆه، حەز دەکەم گاڵتەت لەگەڵا بکەم. نەزان، سەرەڕای قەشەکەت و دەزگیرانە ئینگلیزەکەت، لەڕاستیدا تۆ لە بنەوە وەکو خۆمی.»

– «نەخێر، من وەکو تۆ نیم.»

– «بەڵێ ئێمە وەکو یەکین. تۆ بەڕاستی ئیتاڵی. هەموو گیانت گڕ و کڵپە و دووکەڵە، بەڵام لە دڵەوە هیچت نییە. تەنیا بەڕواڵەت خۆت وا نیشان دەدەی ئەمریکی ئێمە براین و یەکتریمان خۆش دەوێ.»

گوتم: «لەو کاتەی لەوێ نیم، پیاوی باش بە!.»

– «خاتوو بارکلیت بۆ ڕەوانە دەکەم. تۆ بێی من باشتر دەبی لەگەڵ ئەودا. تۆ پاکتر و ڕووخۆشتری.»

– «ئۆه، دەبڕۆ ئاوئاو چی.»

– «بارکلی ڕەوانە دەکەم. خوای ناسکی و ئەڤینی و سارد و سڕی. خوایە





ئینگلیزەکەت. ئەی خوایە پیاو لەگەڵ ئافرەتێکی وەکو ئەمە چی دەکا. تەنیا پەرستنی نەبێ؟ ئافرەتی ئینگلیزی لەمە زیاتر چی بۆ باشە؟.»

– «تۆ مرۆڤێکی کەمتەرخەم و زمان پیسی.»

– «چی؟.»

– «کەمتەرخەم و زمان پیسی.»

– «تۆش... دەموچاو شەختە بردووی.»

– «تۆ نەزانی دەبەنگی.» هەستم کرد ئەم وشانەی دواوە کاری تێ کردووە. بۆیە بەردەوام بووم و گوتم: «بێ ڕۆشنبیری، بێ ئەزموونی، لە بێ ئەزموونیان دەبەنگی»

– «بەڕاست؟! من هەندێ شتت دەربارەی ئافرەتە چاکەکانت، خواکانت پێ دەڵێم... تەنیا یەک جیاوازی هەیە. لە هەڵگرتنی کچێک کە هەردەم باش بووە و لەگەڵ ئافرەتێ. لەگەڵ کچ بەئازارە من هەر ئەوەندەی لێ دەزانم.»

دەستێکی بەدەستەوانەکەوە لە جێگەم دا و گوتی:

– «تۆش هەرگیز نازانی ئاخۆ کچ حەز لەم ئازارە دەکا یاخود نا؟.»

– «تووڕە مەبە.»

– «تووڕە نیم، من هەر ئەوەندەت پێ دەڵێم، ڕۆڵە تا نەیەڵم تووشی گێچەڵ بێیت.»

– «ئایا ئەمە تاکە جیاوازییە؟»

– «بەڵێ، بەڵام ملیۆنێ بێ مێشکی وەکو تۆ ئەمە نازانێ.»

– «ئەمەش لە چاکەی خۆتە.»

– «خۆ بەدەمەقاڵ نایێت، ڕۆڵە! زۆرم خۆش دەوێی. بەڵام بێ مێشک مەبە.»

– «نەخێر، وەکو تۆ ژیر دەبم!.»

· «تووڕە مەبە. ڕۆڵە پێبکەنە. فڕێ نۆش کە، بەڕاستی دەبێ بڕۆم.»

– «تۆ هاوڕێیەکی کۆنی چاکی.»

– «ئێستا بینیت لە ژێرەوە وەکو یەکین. ئێمە برای کاتی شەڕین. ماچم کە خواحافیز.»

– «تۆ پەشێواوی.»

هەوای هەناسەی بۆلام هات و گوتی: «نەخێر، من مرۆڤێکی زۆر بەسۆزم. خواحافیز دێمەوە سەردانت.»

هەناسەکەی دوورکەوتەوە.

– «ماچت ناکەم، گەر خۆت حەز نەکەی. دەزگیرانە ئینگلیزەکەت بۆ دەنێرم. خوا حافیز ڕۆڵە! کۆنیاکەکە لەژێر قەرەوێڵەکەیە. خوا یار بێ زوو چاک دەبیەوە.»

کەوتە ڕێ و ڕۆیشت.

## 11

تاریک و لێڵی ئێوارە بوو کە قەشە هات. شۆربای شێوانیان هێنابوو، پاشان قاپەکانیان بردەوە. منیش ڕاکشابووم سەیری ڕیزە قەرەوێڵەکانم دەکرد. لە پەنجەرەوە سەیری چڵەپۆپەی ئەو دارەم دەکرد کە بەکزەبا دەشنایەوە. کزەبا لە پەنجەرەوە هاتە ژوورەوە و ئێوارەی فێنکتر بوو لە جاران. مێش بەساپیتەوە بوون؛ لەسەر ئەو گلۆپە کارەباییبیانەوە بوون کە بەوایەرەوە شۆڕ ببوونەوە. گڵۆپەکان تەنیا بەشەو لەو کاتەی یەکێ بهاتبایە ژوورەوە یاخود یەکێ بەئیشێ هەستابایە پێدەکران. ئەمە وای لێ کردم هەست بەڕۆژگاری گەنجایەتیم بکەم، کە دنیا تاریک دادەهات. پاش تاریک و ڕوون ئەوجا لەجێی خۆت بمابایتەوە. ئەوە بەوە دەچوو کە هەر لە زووەوە پاش شێوان لەنێو جێگەکەت داندرابێ. یاوەرەکە بەنێوان ڕیزی قەرویلەکان بەرەو خوار هات و ئینجا وەستا.

یەکێکی لە گەڵابوو، قەشەی هاوڕێم بوو ئەوەی لەوێ وەستا کورتە باڵا و ڕەش تاڵە و پەشۆکاو بوو. گوتی: «چۆنی؟»

هەندێ گورزە شتی لەسەر زەوی لە نزیک قەرەوێڵەکەمەوە دانا.

گوتم: «زۆرباشم، باوکە.»

لەسەر ئەو کورسییە دانیشت کە بۆ ڕینالدی هێنرابوو. بەشپرزەییەوە لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی کرد. شەکەتیم لە ڕوویەوە بەدی کرد.

– «تەنیا دەتوانم ماوەیەکی کورت بمێنمەوە کات درەنگە.»

– «درەنگ نییە. هاوڕێکانمان چۆنن؟.»

بەزەردەخەنەیی و دەنگێکی پڕ ماندوویی گوتی:

– «هێشتا هەر قەشمەرجاری گەورەیانم. سوپاس بۆخوا گشتیان باشن.»

گوتی: «زۆر خۆشحاڵم کە ئێوە باشن، هیوادارم تووشی دەردەسەری و ئازار نەبن.»

زۆر ماندوو دیاربوو. هەرگیز ماندووبوونم پێوە نەدیبوو...

– «ئازارەکەی هیچ نەماوە، هیچ.»

– «جێگاکەت لەنێو برادەران لەسەر خواندا دیارە.»

– «خۆزیا لەوێ بام. من هەردەم کاتی خۆشم لەگەڵ قسەکانتان بەسەر بردووە.»

– «کەمێ شتم بۆ هێناوی.»

گورزەکانی هەڵگرت و گوتی:

– «ئەمە کوللەی مێش و مەگەزە. ئەوەش بوتڵێ (ڤێرموثە). ئەرێ خۆ تۆ حەز لە (ڤێرموث) دەکەی؟ ئەمانەش چەند ڕۆژنامەیەکی ئینگلیزین.»





گوتم: «تکایە بیانکەوە.»

هەوەستی بەم قسەیە هات و شتەکانی کردەوە. کوللەکەم بەدەستەوە گرت. ئەویش بوتلە (ڤێرمۆثە)کەی بەرز کردەوە تا نیشانمی بدا. پاشان لەسەر عەردی، لە نزیک قەرویلەکەمی، دانا. ڕۆژنامەیەکم بەرز کردەوە، بەکەمێ سووڕاندن بەلای ڕووناکی گلۆپە کزەکاندا، کە لە پەنجەرەکەوە کزە ڕووناکییێ دەهاتە ژوورەوە، توانیم ناونیشانە گەورەکەی (هەواڵەکانی جیهان News of world) بخوێنمەوە.

گوتی: «ڕۆژنامەکانی تر بەوێنە ڕوونکراونەتەوە.»

– «بەخوێندنەوەیان خۆشحاڵ دەبم. ئەمانەت لەکوێ دەستکەوتووە؟.»

– «ناردوومە لە میستریبییەوە بۆم هاتووە. هی تریشم بۆ دێ.»

– «باوکە پیاوەتی خۆتە هاتوویت، پێکێ ڤیرموث ناخۆیتەوە؟.»

– «سوپاست دەکەم. بۆ خۆت بێ. بۆ تۆم هێناوە.»

– «نەخێر، دەبێ پێکێ هەر بخۆیتەوە.»

– «باشە، کەوابوو هی ترت بۆ دێنم.»

– «یاوەرەکە دوو پەرداخی هێنا. سەری بوتڵەکەی کردەوە. دوایی تەپەدۆری سەر بوتڵەکەی دەرکێشا. دەبوایە بەشی دواوەی تەپەدۆرەکە بکەوێتە ناو بوتڵەکەوە. توانیم پەشۆکاوی لە سیمایدا بخوێنمەوە، بەڵام گوتی: «زۆر چاکە، زۆر گرینگ نییە.»

– «ئەمە پێکی ساغ و سەلامەتی تۆیە، باوکە.»

– «ئەمە پێکی چاکبوونەوەی تۆیە.»

پاشان پەرداخەکەی بەدەستەوە گرت ئێمەش سەیری یەکترمان دەکرد، هەندێ جار قسەمان دەکرد و هاوڕێی گیانی بەگیانی یەکتری بووین. بەڵام لەم شەوەدا ئەمە زۆر ستەم بوو.

– «باوکە، چیتە. ماندوو دیاری؟.»

– «گەرمایە.»

– «نەخێر، بەهارە، هەست بەبێزاری دەکەم.»

– «شەڕ بێزاری کردووی؟.»

– «نەخێر، بەڵا ڕقم لە شەڕە.»

گوتم: «خۆ منیش پێم خۆش نییە.»

سەری خۆی لەقاند و. لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەی کرد.

– «گوێی مەدەرێ. هێشتا شەڕت نەبینیوە. ئەبێ بمبووری. دەزانم تۆ برینداری»

– «ئەمە تاکە ڕووداوێک بوو.»

– «هەرچەندە تۆ برینداری بەڵام، دەتوانم پێت بڵێم هێشتا شەڕت نەبینیوە. هەر

چەندە خۆشم نەمبینیوە. بەڵام کەمێک هەستی پێدەکەم.»

– «کاتێ بریندار بووم، قسەمان لەسەر شەڕ دەکرد، پاسینی قسەی بۆ دەکردین.»

قەشە پەرداخەکەی دانا. بیری لە شتێکی تر دەکردەوە. گوتی:

– «دەیانناسم، چونکە خۆشم وەکو ئەوانم.»

– «بیروباوەڕت لەگەڵ ئەوان جیاوازە.»

– «بەڵام لە ڕاستیدا وەکو ئەوانم.»

– «ئەفسەرەکان هیچ نابینن.»

– «هەندێکیان دەبینن. هەندێکی تریش زۆر هەستیارن و لە ئێمە ئاگادارترن و خراپتر هەستی پێ دەکەن.»

– «زۆربەیان بیروباوەڕیان لەگەڵ تۆ جیایە»

– «مەسەلە نەپارەیە و نە ڕۆشنبیرییە، مەسەلە شتی ترە. ئەگەر مەسەلە پارەبێ یا ڕۆشنبیری بێ هەندێکی وەکو (پاسینی) حەز ناکەن بێن بەئەفسەر. منیش حەز ناکەم ببم بەئەفسەر.»

– «پایەکەت ئەفسەرییە، منیش ئەفسەرم.»

– «ئەفسەری بەڕاستی نیم. خۆ تۆ ئیتاڵیش نی، تۆ کابرایەکی بیانی بەڵام تۆ لە ئەفسەرەکان نزیکتری نەوەک لەسەربازەکان.»

– «جا جیاوازی چییە؟»

– «ناتوانم وا بەئاسانی ئەمە شێ بکەمەوە. هەندێ کەس هەن شەڕ هەڵدەکەن. لەم وڵاتەدا زۆر کەسی لەم بابەتە هەیە. هەندێکی تریش هەن شەڕ ناکەن.»

– «بەڵام دەستەی یەکەم هانیان دەدەن شەڕ بکەن.»

– «بەڵێ»

– «منیش هاندەرم.»

– «تۆ بیانی. تۆ نیشتمانپەروەری.»

– «بۆچی ئەوەی شەڕگێڕ نەبێ دەتوانێ شەڕ ڕاگرێ؟»

– «نازانم.»

قەشە دیسان لە پەنجەرەوە تەماشای دەرەوەی کرد. منیش تەماشای سیمایم کرد.

– «ئایا ئەوان قەت پێیان کراوە شەڕ ڕاگرن؟»

– «ئەوان بۆ ئەوە ڕێک نەخراون شەڕ ڕاگرن. هەرکاتێ خۆیان ڕێکخست ئەوا سەرۆکەکانیان دەیانفرۆشن.»

– «کەوابێ بەهیوای چ نەبێن؟»





– «هەرگیز ئەو مەسەلەیە بێ هیوا نییە. بەڵام هەندێ جار هیوام دەبڕێ. من هەردەم هەوڵ دەدەم بەهیوا بژیم. بەڵام زۆرجار بۆم نالوێ.»

– «لەوانەیە کۆتایی بێ.»

– «منیش بەو هیوایەم.»

– «کە شەڕ کۆتایی هات، چی دەکەی؟.»

– «گەر شەڕ تەواو بێ دەگەڕێمەوە، ئەبرۆزی.»

لەگەڵ ناوی ئەبرۆزی یەکسەر ڕووی گەشایەوە.

– «ئایا ئەبرۆزیت خۆش دەوێ؟.»

– «بەڵێ، زۆرم خۆش دەوێ.»

– «کەوابێ دەبێ بۆ وێندەر بگەڕێمەوە.»

– «زۆر کەیفخۆش دەبم گەر لەوێ بژیم و خواپەرستی بکەم. خزمەتی ئایینەکەم بکەم.»

– «ڕێزیشت بگیرێت، وا نییە؟.»

– «بەڵێ، ڕێزیشم بگرن، بۆ نا؟.»

– «ڕێز نەگرتنت بێ مانایە. دەبێ ڕێزت بگرن؟.»

– «ئەمە گرینگ نییە. لە وڵاتی ئێمەماناندا، وا تێگەیشتوون کە مرۆڤ دەبێ خوای خۆیان خۆش بوێ. دیاریشە خواناسین گاڵتەیەکی چەپەڵ نییە.»

– «تێگەیشتم.»

تەماشایەکی کردم و زەردەخەنەیەکی هاتێ.

– «تۆ تێدەگەی بەڵام خوات خۆش ناوێ.»

– «نەخێر.»

پرسی: «هەرگیز خۆشت ناوێ؟»

– «جار وایە شەوان ترسم لە دڵ دەنیشێنێ.»

– «پێویستە خۆشت بوێ.»

– «ئەوەندەم خۆش ناوێ.»

– «بەڵێ، ئەڤینداری. ئەوەی بۆت گێڕامەوە لەبارەی شەوەکان خۆشەویستی نییە. تەنیا سۆز و ئارەزووە. کاتێ تۆ دەکەویە خۆشەویستییەوە دەبێ شتێ لە پێناویدا بکەی و قوربانی بۆ بدا، خزمەتی بکا.»

–«من خۆشم ناوێ.»

– «بەڵێ، خۆشت دەوێ. ڕۆژێ دێ، دەبی بەئەڤیندار، ئەوکات بەختیار دەبی.»

– «من بەختیارم، بەختیاریش بوومە.»

– «ئەمە شتێکی ترە، تۆ هیچ لەبارەی ئەمەوە نازانی تا بەختیار نەبی.»

– «باشە هەر کاتێ بەختیار بووم پێت دەڵێم بەختیارم.»

–«زۆر مامەوە. زۆرم قسەکرد.» لەوەی وتمان نیگەران دیاربوو.

– «نەخێر، نابێ برۆی. ئەی ڕات دەربارەی خۆشەویستی لەگەڵ ئافرەتدا چییە؟ ئەگەر ئافرەتێکم بەڕاستی خۆش بووێ، ئەویش هەر وەک ئەوەیە؟.»

– «هیچ لەو بارەوە نازانم. چونکە هیچ ئافرەتێکم خۆش نەویستووە.»

– «ئەی دایکت خۆش نەویستووە؟.»

– «بەڵێ، دەبێ دایکمم خۆش بووێ.»

– «ئایا تۆ هەردەم خوات خۆش ویستووە؟.»

– «بەڵێ، هەر لەمنداڵییەوە.»

گوتم: «زۆر چاکە.»

هیچ شتێکی وام بۆ نەهات تا پێی بڵێم.

بۆیە گوتم: «کوڕێکی چاکی.»

– «من کوڕی چاکم بەڵام بۆچی پێم دەڵێی، باوکە؟»

گوتم: «ئەمە مەسەلەی ڕەوشتە.»

بزەیەکی هاتێ. بەدڵێکی پڕ هیواوە لێی پرسیم:

– «دەبێ برۆم هیچ ئیشت پێم نییە؟.»

– «نەخێر، تەنها بۆ قسە.»

–«سڵاوت بەهاوڕێیان دەگەیێنم.»

– «سوپاس بۆ دیارییە جوانەکانت.»

– «هیچ نییە.»

– «سەرمان لێ بدەوە.»

دەستی لە دەستم دا: «باشە، خواحافیز.»

گوتم: «بەهیوای بینینەوەت.»

گوتی: «چاوو.»

ژوورەوە تەواو تاریک ببوو. یاوەرەکەم کە لەبەردەم قەریوڵەکەم دانیشتبوو. هەستایەوە. لەگەڵی چووە دەرەوە. زۆرم خۆش دەویست. بەو هیوایە بووم ڕۆژێ بگەڕێتەوە ئەبرۆزی. ژیانێکی کولەمەرگی لەنێو هەڤاڵەکانی دەباتە سەر، بەڵام بەوپەڕی دڵفراوانییەوە وەری دەگرت. ئەوەم بەبیر داهات ئاخۆ لە شارەکەی خۆیدا ماڵی





دەبێ چۆن بێ؟ پێی گوتم: لە (کاپراکۆتا) لەناو چەمەکەی خوارەوەی شاردا ماسییە خاتوونەی زۆربوو. کاتێ لاوان بەستەیان(١) دەگوت، بەشەو شمشاڵ لێدان قەدەغەبوو. تەنیا شمشاڵ قەدەغەبوو. لێم پرسی لەبەرچی؟ گوتی: چونکە خراپە، شەوان کیژوکاڵ گوێیان لە شمشاڵ بێت. جوتیارەکان پێیان دەگوت: (دۆن) و هەرکاتێ پێت گەیشتن کڵاوەکانیان لەسەر دەکردەوە.

باوکی هەمەوو ڕۆژێ دەچووە ڕاو، لە ماڵی جوتیارەکان وەستاوە نانی خواردووە. ئەمەش شەرەفێکی گەورە بووە بۆ جوتیارەکان. ڕێگەیان بەپیاوی بیانی نەداوە لە ناوچەی ئەواندا ڕاووشکار بکا تا پسوڵەی نەگیرانی نیشان نەدابێ. لەناو (گراند سوسا دیتالیا) ورچ هەبووە، بەڵام ئەوێ لێرەوە دوور بوو.

(ئەکیولا) شارێکی خۆشە، شەوانی هاوینی فێنکە و بەهاری ئەبرۆزی لە هەموو ناوچەکانی تری ئیتاڵیادا خۆشترە. بەڵام ئەوەی دڵگر و بەردڵ بوو پایزەکەی بوو کە توانی بۆ ڕاو بچیتە ناو دارستانی شابەڕوو. باڵندەش هەموو چاک قەڵەو بوون، چونکە لەسەر وشییە ترێیاندا دەژیان. پێویستی نەدەکرد پیاو خۆراکی خۆی لەگەڵ خۆی ببا چونکە جوتیارەکان بەوە دەنازین ئەگەر لە ماڵی ئەوان نانت لەگەڵیان بخواردبایە. پاش ماوەیێ چاوەکانم چوونە خەو.

## 12

قاوشێکی درێژ بوو. پەنجەرەکانی لەلای ڕاستەوە بوون. لە بنەبانییەوە دەرگایێ هەبوو، بۆ ژووری تیمارکردن دەچوو. ئەو ڕیزەی کە قەرەوێڵەکەمی تیابوو دەیڕوانییە پەنجەرەکانەوە ڕیزە قەرەوێڵەکەی تریش، کە لەژێر پەنجەرەکانەوە بوو، بەرامبەر دیوارەکەوە بوو، ئەگەر لەسەر تەنیشتی چەپە لێ ڕاکشابای دەتتوانی دەرگای ژووری تیمارکردن ببینی. دەرگایەکی تریش لەلایەکەی ترەوە هەبوو. تاک تاکە خەڵکی پێدا دەهاتە ژوورەوە. ئەگەر نەخۆشێ لە سەرەمەرگ بووایە بەپەردەیێ دەوریان دەدا و لەوانی دابڕیان دەکرد تا کەسێ لە سەرەمەرگدا نەیبینێ. بەڵام پۆتینی دکتۆر و برین پێچەکان لەدامێنی پەردەکەوە دیاربوون. هەندێ جار دوا بەدوای ئەمە پستەپستێ پەیدا دەبوو. پاشان قەشە لە پشت پەردەکەوە دەهاتە دەرەوە تەرمی مردووەکەیان هەڵدەگرت و بەپەتۆ دایان دەپۆشی، بەناو قاوشەکە بەنێوانی دوو ڕیزە نەخۆشەکان تێپەڕ دەبوون. پاشان یەکێ پەردەکەی دەپێچایەوە و دەیبردە دەرەوە. ئەوێ بەیانی مێجەری لێپرسراوی قاوشەکە لێی پرسیم کە ئاخۆ توانای ئەوەم هەیە سبەی سەفەر بکەم. گوتم: بەڵێ دەتوانم. گوتی کەوابێ سبەینێ زوو ڕەوانەت دەکەن. هەروەها گوتی: وا چاکە بەر لەوەی گەرما دابێ سەفەر بکەی. کاتێ لەسەر قەرەوێڵەکەتەوە بەرزیان دەکردیەوە. بۆ

(١) بەستە: Serende

ژووری تیمارکردنیان دەبردی دەتوانی لە پەنجەرەکەوە تەماشای دەرەوە بکەی و گۆڕە تازە دروستکراوەکانی ناو باخچەکەی ببینی.

سەربازێ لەبەر دەرگای باخچەکە دانیشتبوو خەریکی دروستکردنی خاچ بوو. بەبۆیەش ناو و پایە و پەلی سەربازە بەخاک سپاردراوەکانی ناو باخچەکەی لەسەر گۆڕەکانیان دەنووسی. ئەم سەربازە هەندێ ئیشیشی بۆ قاوشەکە دەکرد. لەکاتی بێ ئیشیدا چەخماخێکی لە قەوانی بەتاڵی فیشەکی جۆرە تفەنگێکی نەمساوی بۆ دروست کردم. پزیشکەکانی نەخۆشخانەکە پیاوی چاک بوون. لەکارەکانیان چاپووک بوون. بەحەزرەتی ئەوە بوون هەرچی زووە ڕەوانی نەخۆشخانەی (میلانۆ)م بکەن چونکە لەوێ ئامێری تیشکە (ئێکس)ی باشتر هەیە. پاش نەشتەرگەری سوود لە چارەی مەکینەیی وەردەگرم. خۆشم حەزم دەکرد. بچمە میلانۆ. دەیانویست ئێمە وەدەرنێن و ڕەوانەی دوورترین جێگامان بکەن. چونکە گەر هێرشێ بکرابایە پێویستیان بەم هەموو قەروێلانە دەبوو. لەو شەوەی بەر لەوەی نەخۆشخانە بەجێ بێڵم. ڕینالدی و مێجەری خۆمان هاتنە لام و پێیان ڕاگەیاندم دەبێ بچمە نەخۆشخانەیەکی ئەمریکی کە بەم دواییە لە میلانۆدا دامەزراوە و هەندێ لەیەکەکانی فریاگوزاری ئەمریکی بۆ ئەوێ ڕەوانە کراون. ئەم نەخۆشخانەیە چارەسەری ئەوان و ئەو ئەمریکییانە دەکا کە لە خزمەتی سوپای ئیتاڵین. ئەمریکییەکی زۆر لە ڕیزی خاچی سووربوون. ئەمریکاش دژی ئەڵمانیا شەڕی ڕاگەیاند، نەک نەمسا. ئیتاڵییەکان سووڕ دەیانزانی کە ئەمریکا دژی نەمسا شەڕ ڕادەگەیەنێ. بۆیە لە خەمی ئەو ئەمریکیانەدا بوون کە دەهاتنە ئیتاڵیا، هەرچەندە لە خاچی سووریش دابن. لێیان پرسیم ئاخۆ بەمەزندەی من (ولسن)ی سەرۆکی ئەمریکی شەڕ دژی نەمسا ڕادەگەیێنێ. منیش لە وەڵامدا گوتم ئەمە مەسەلەی ڕۆژگارە. نەم دەزانی چیمان لەگەڵ نەمسا بووە تا دژی بوەستین، بەڵام زۆر لۆژیکی بوو، دژی نەمسا شەڕ ڕابگەیێنین.

لەوەڵامدا گوتم: جێگای گومانە (تورکیاش)[1].

من گوتم، باڵندەی خۆمانییە. بەڵام ئەم نوکتەیەم زۆر بەخراپی گۆڕییە ئیتاڵی ئەوانیش کەوتنە گومان و سەرسوڕمانەوە وا تێگەیشتن گوتوومە «بەڵێ» بەناچاری گوتم: بەڵێ دژی تورکیاش شەڕ ڕادەگەیێنین. دژ بەبولغاریاش؟ ئێمە چەند پێکێک براندیمان خواردبۆوە. گوتم، بەڵێ، بەخودا دژی بولغاریاش شەڕ دەکەین، دژی ژاپۆنیش. بەڵام ئەوان گوتیان ژاپۆن هاوپەیمانێکی بەریتانیایە بۆیە ناتوانین پشت بەئینگلیزی نەفرەتی[2] ببەستین. گوتم ژاپۆنییەکان چاویان بڕیوەتە (هاوایی). پرسیم (هاوای) کەوتۆتە کوێوە؟

(١) وشەی تورکیا Turkey بەزمانی ئینگلیزی قەلەمونە قسەکەر مەبەستی قەمەلەمونە کەچی ئەوانی تر بەتورکیای تێدەگەن.
(٢) نەفرەتی لە جیاتی (bloody) بەکارهاتووە بەمانای خوێناوی دێ.





گوتیان لە دەریالوشی هێمن دایە بۆچی ژاپۆنییەکان چاویان بڕیوەتە (هاوایی)؟ لە ڕاستیدا چاویان نەبڕیوەتە (هاوای) بەڵکو ئەمە تەنیا قسەیە. ژاپۆنییەکان گەلێکی بچووکن. شەیدای خواردنەوە و سەمان. مێجەر گوتی: وەکو فەرەنسییەکان. (نیس) و (ساڤوای) لە فەرەنسییەکان وەردەگرین. ڕینالدی گوتی: هەروەها (کورسیکا) و (ئەدیارتیکی) کەناری وەردەگرینەوە. مێجەر گوتی: ئیتاڵیاش مەزنایەتی ڕۆما وەردەگرێتەوە. گوتم حەز لە ڕۆما ناکەم. گەرم و پڕ کێچە. مێجەر گوتی: تۆ حەز لە ڕۆما ناکەی. بەڵێ ڕۆمام خۆش دەوێ. ڕۆما دایکی جیهانە. هەرگیز (رمۆلوس) شیردەری (تیبەر) لەیاد ناکەم. چی؟ هیچ نا. لێی گەڕێ با بچینە ڕۆما با هەر ئیمشەو بچینە ڕۆما و نەگەڕێینەوە. ڕۆما شارێکی خۆشە. مێجەر گوتی: گوتم ڕۆما دایک و باوکی جیهانە. ڕینالدی گوتی: ڕۆما مێیینەیە بۆیە ناکرێ ببێتە باوکی جیهان. کەوابێ باوک کێیە. گیانی پیرۆزی قودس؟ کفری مەکە. کفرم نەکردووە. دەمەوێ بزانم. تۆ سەرخۆشی ڕۆڵە. کێ سەرخۆشی کردووم؟ مێجەر گوتی، من سەرخۆشم کردووی چونکە تۆم خۆش دەوێ. ئەمریکاش هاتۆتە ناو شەڕەوە. گوتم؛ تا دەسکی شمشێرەوە. ڕینالدی گوتی، تۆ بەیانی ئێرە بەجێ دێڵی. گوتم، بەرەو ڕۆما. مێجەر گوتی: نەخێر، بەرەو میلانۆ. میلانۆ. بۆ کۆشکی کریستالی بەرەو کۆڤا بۆ (کامپری) بۆ (باڤی) بۆ (گالیریا) تۆ کوڕێکی بەبەختی. گوتم؛ بۆ (گران ئیتاڵیا) بۆ ئەو شوێنەی کە (جۆرج)ی تیایە و پارەی لێ وەردەگرم. ڕینالدی گوتی، بۆ (سکالا)، تۆ دەچیتە (سکالا).

گوتم: هەموو شەوێ. مێجەر گوتی، پێت ناکرێ هەموو شەوێ ڕووی تێ بکەی. گوتم. بلیت زۆر گرانە دەبێ چەک لە بانقەوە لەسەر حیسابی باپیرەم دەربکەم. چی؟ چەکی دارایی. یان دەبێ بیدات یا دەبێ بچم بۆ زیندان. (مستەر کونیگهام) ئەم کارە لە بانق ئەنجام دەدا. بەچەکی دارایی دەژیم. جا نازانم باپیرە کوڕەزای نیشتمانپەروەری خۆی تووشی بەندیخانە دەکات کە لە ئیتاڵیا خۆی بەکوشت دەدا. تا ئیتاڵیا سەربەست بژی؟ ڕینالدی گوتی؛ هەربژی (گاریبالدی) ئەمریکی. گوتم، بژی چەکی دارایی.

مێجەر گوتی: دەبێ بێدەنگ بین. چەند جارە داوامان لێ دەکەن بێدەنگ بین. فریدریکۆ، ئایا تۆ بەیانی ئۆغر دەکەی؟ ڕینالدی گوتی: «واپێت دەڵێم، دەچیتە نەخۆشخانەی ئەمریکی. دەچیتە لای سستەرە جوانەکان. نەک نەخۆشەوانە ڕیشدارەکانی نەخۆشخانەی مەیدان. مێجەر گوتی: بەڵێ، بەڵێ، دەزانم ئەو دەچێتە نەخۆشخانەی ئەمریکی گوتم، گوێ نادەمە ڕیشەکانیان، هەر کەسەی دەیەوێ ڕیش دابنێ با بۆ خۆی دابنێ. بۆچی تۆش ڕیش دانانێی، مێجەر؟ ناچێتە ناو دەمامکی گازەوە. بەڵێ دەچێتە ناو دەمامکەوە. هەموو شتێ دەچێتە ناو دەمامکی گاز و جێگەی دەبێتەوە. لەناو دەمامکی گازدا ڕشاومەتەوە. ڕینالدی گوتی، دەنگت ئەوەندە بەرز مەکەوە. نەزان. هەموومان دەزانین تۆ لەبەرەی شەڕ بووی. ئەی کوڕی چاک، ئەی من چی بکەم گەر ئێوە بڕۆن؟ مێجەر گوتی، دەبێ بڕۆین مەسەلەکە بۆتە شتێکی سۆزی.

گوێ بگرە، مژدەت دەمێ. کچە ئینگلیزەکە خۆ. تۆ دەیناسی؟ ئەو کچە ئینگلیزەی کە هەموو شەو دەچوویە نەخۆشخانە بۆ دیتنی. دەچیتە نەخۆشخانەی (میلانۆ). لەگەڵ ئەوەکەی تر دەچێتە نەخۆشخانەی ئەمریکی. هێشتا سستەریان لە ئەمریکاوە بۆ نەهاتووە. من ئەمڕۆ لەگەڵ بەڕێوەبەرەکە قسەم کرد. لێرە لەبەرەوە ئافرەتیان گەلێ زۆرە هەندێکیان دەگەڕێننەوە دواوە. چۆنی تێدەگەی ڕۆڵە؟ زۆرباشە، بەڵێ؟ تۆ بۆ خۆت دەچی لەشارێکی گەورە لەگەڵ کچە ئینگلیزەکەدا دەژی، لەوێ لەباوەشت دەگرێ. بۆچی من بریندار نابم؟ گوتم، لەوانەیە ڕۆژێ دێ بریندار ببی. مێجەر گوتی، دەبێ بڕۆین، دەخۆینەوە دەنگە دەنگ پەیدا دەکەین، فریدریکۆ بێزار دەکەین. مەڕۆن، توخوا، مەڕۆن. دەبێ بڕۆین، خوا حافیز بەخت یارت بێ. چاوو، چاوو، چاوو. زوو وەرەوە. ڕینالدی ماچی کردم بۆنی (لیزۆل)ت لێ دێ خواحافیز، ڕۆڵە. خواحافیز.

زۆر شتی تریش. مێجەر، دەستی لەشانم دا. لەسەر پەنجە چوونە دەرەوە. هەستم کرد زۆر مەستم، بەڵام خەوتم. ڕۆژی دوایی بەرەو میلانۆ بەڕێکەوتین. لەپاش چل و هەشت سەعات گەیشتینە میلانۆ. گەشتێکی ناخۆش بوو. ماوەیەکی زۆر لە ڕێگاوە لامان دەدا. لە نزیک (میستر) ماینەوە منداڵەکان سەیریان دەکردین منداڵێکی بچووکم ڕاسپارد. بوتڵێک کۆنیاکم بۆ بێنێ. بەڵام بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوە گوتی، تەنیا (گراپا) دەستدەکەوێ. داوام لێ کرد بۆم بێنێ. کاتێ گەڕایەوە گراپای بۆ هێنام. ئەو پارە خوردەیەی مابووەوە دامە ئەو. خۆم و پیاوەکەی تەنیشتم خۆمان مەست کرد تا لە (فیسێبیزا) تێپەڕین. خەوتم. کاتێ خەبەرم بووەوە زۆر ڕشامەوە. ڕشانەوەم هیچ گیروگرفتی پەیدا نەکرد، چونکە پیاوەکەی ئەو بەر بەر لەمن زۆرجار ڕشابووەوە. پاش ئەوە چیتر نەمتوانی بەرگەی تێنوویەتی بگرم. بۆیە کاتێ شەمەندەفەر وەستا لە دەرەوەی (ڤیرۆنا) بانگی سەربازێکم کرد، لە نزیک شەمەندەفەرەکەوە پیاسەی دەکرد، ئاوی بۆ هێنام. (جورجینی)م خەبەر کردەوە، ئەویش سەرخۆش بوو. هەندێ ئاوم دایێ. داوای کرد هەندێ ئاو بکەمە سەر شانی، تا وام کرد، کەوتەوە خەو. سەربازەکە ئەو (پێنسەی) ڕەت کردەوە کە دامێ تا پرتەقاڵێکم بۆ پێ بکڕێ. پرتەقاڵێکی خڕپنی بۆ هێنام، مژیم و ناوەکەیشم فڕێدا. سەربازەکە لەبەردەم فارگۆنێک هاتوچۆی دەکرد. پاش ماوەیێ شەمەندەفەر لە ڕێیەوە و دەستی بەڕۆیشتن کرد.





# کتێبی دووەم

## 13

ڕۆژی پاشی لەگەڵ گەردی بەیانیدا گەیشتینە میلانۆ. لە گۆڕەپانی بارگە داگرتندا ئێمەیان لە شەمەندەفەرەکە هێنایە دەرەوە. ئوتومبیلێکی فریاگوزاری بۆ نەخۆشخانەی ئەمریکی بردم. لەبەر پاڵکەوتنم لەناو دەستەبەری ئوتومبیلەکە نەمتوانی بزانم بەکام بەشی شارەوە تێدەپەڕین، بەڵام کاتێ دەستەبەرەکەیان داگرتە خوارەوە چاوم بەبازاڕێک و مەیخانەیەکی کراوە کەوت. کچێ بەر دەرگای مەیخانەکەی دەماشت شەقامەکەیان ئاوڕشێن دەکرد. بۆنی بەیانییەکی زووی لێ دەهات. دەستەبەرەکەیان دانا و چوونە ژوورەوە. دەرگەوانێ لەگەڵیان هاتە دەرەوە. سمێڵێکی بۆری هەبوو و کڵاوێکی دەرگەوانانی لەسەر کردبوو و کراسێکی قۆڵداری لەبەرابوو. دەستەبەرەکە نەدەچووە ناو بەرزکەرەکەوە ئەوانیش لەسەر ئەوەی دام بگرن و بەبەرزکەرەوەکە سەرم بخەن یاخود بەدەستەبەرەکەوە هەڵمبگرن و بەپێپلکەکان سەرم بخەن؛ مشتومڕیان بوو. خۆم گوێم لێیان گرتبوو باسی ئەو شتەیان دەکرد. لە دواییدا بڕیاریان لەسەر بەرزکەرەوەکەدا. منیان بەدەستەبەرەکەوە بەرزکردەوە. گوتم: «لەسەرخۆ، بەنەرمی هەڵمگرن.» ناو بەرزکەرەوەکە قەڵەباڵغ بوو. وە قاچم ژانەکی توندی گرت چونکە نووشتابووەوە. گوتم: «قاچەکانم درێژکەن...»

– «ناتوانین، گەورەم جێگا نییە.»

ئەوەی ئەمەی گوت دەستی تێ وەرینابووم، منیش دەستم لەملی ئەو کردبوو. هەوای هەناسەی بۆنی کانزایەکی تێکەڵ بەسیر و مەی سووربوو بەسەر کولمما دادەکرد. پیاوەکی تر گوتی: «بەزەییت پێ بێتەوە.»

– «دایک سۆزانی، کێ بەزەیی پێ نایەتەوە.» ئەوەی قاچمی گرتبوو دووبارە گوتی: «دەڵێم بەزەییت پێ بێتەوە.» دەرگای بەرزکەرەوەکە داخرا. پاشان دەرگاکەی ناوەوە داخرا. دەرگەوانیش دوگمەی نهۆمی چوارەمی داگرت. دەرگەوان دڵتەنگ دیاربوو، بەبەرزکەرەوەکە لەسەرخۆ بەرزبووەوە. لە پیاوە سیر خواردووەکەم پرسی: «ئایا باری بەرزکەرەوەکە قورسە؟.»

گوتی: «ئەوەندە هەر هیچ نییە.»

دەموچاوی ئارەقەی لێ دەڕژا و مرەی لێ دەهات. بەرزکەرەوەکە سەرلەبەر بەرز بووەوە و هەڵوێستێکی کرد. ئەو پیاوەی قاچمی گرتبوو دەرگاکەی کردەوە، چووە دەرەوە. گەیشتینە باڵکۆنەکە. ژمارەیێ دەرگای دەسک تووجینی تیابوو. ئەو پیاوەی پێی گرتبووم پلی بەدوگمەیێ وەنا زەنگ لێی دا. ئێمە لە پشت دەرگاوە گوێمان لە زرینگەی زەنگەکە بوو. بەڵام کەس نەهات. دوایی دەرگەوانەکە بەپێپلکەوە چووە سەرەوە.

دەستەبەرە هەڵگرەکان گوتیان: «دەبێ لەکوێ بن؟.»

دەرگەوانەکە: «نازانم، لە خوارەوە دەخەون.»

– «یەکێ بدۆزەوە.»

– «دەرگەوانەکە زەنگی لێدا، پاشان لە دەرگای دا، دوایی دەرگاکەی کردەوە، چووە ژوورەوە. کاتێ گەڕایەوە ژنێکی بەساڵاچووی چاویلکە لەچاوی لەگەڵا هات. پرچی پەرشوبڵاو بووبوو، نیوەی بەسەر شان و ملی بڵاو ببۆوە. جلی سستەرانی لەبەرابوو.

ژنەکە گوتی: «تێناگەم، ئیتاڵی تێناگەم.»

گوتم «ئینگلیزی دەزانم. دەیانەوێ لە شوێنێکم دابنێن.»

– «هیچ ژوورێ لە ژوورەکان ڕێک نەخراون، چاوەڕوانی هاتنی هیچ نەخۆشێک نەکراوە» سستەرەکە پرچی بادا و بەچاوێکی کورت بینییەوە تەماشای کردم.

– «ژوورێکیان نیشان بدە. تا بتوانن تیای دامنێن.»

– «ناتوانم، هاتنی هیچ نەخۆشێکمان چاوەڕوان نەکردووە. ئێستا ناتوانم لە هیچ ژوورێکت دابنێم.»

گوتم: «هەر ژوورێ بێ.»

پاشان بەئیتاڵی بەدەرگەوانم گوت: «ژوورێکی چۆلم بۆ بدۆزەوە.»

دەرگەوان: «هەموو ژوورەکان چۆلن. تۆ یەکەم نەخۆشی هاتوویتە ئێرە.»

– «دەرگەوان کڵاوەکەی بەدەستەوە گرت، سەیرێکی سستەرە پیرەکەی کرد.

– «بۆ خاتری مەسیح، لە ژوورێکم دابنێ.» تا دەهات ئازاری قاچم زیاتر دەبوو، بەتایبەتی کاتێ نووشتایەوە. دەمتوانی هەست بەو ژانە بکەم کە بەناو ئێسقانەکانم دەهاتن و دەچوون. کابرای دەرگەوان چووە دەرەوە. سستەریش بەپرچی بۆرییەوە بەدوای کەوت و بەپەلەش گەڕایەوە.

دەرگەوان گوتی: «بەدوام وەرن.»

هەڵیان گرتم بەناو ڕاڕەوێک بۆ ژوورێکی پەنجەرە داخراویان بردم. ژوورەکە بۆنی کەلوپەلی تازەی لێ دەهات. قەرەوێڵەیەک و دۆڵابێکی گەورە و ئاوێنەیەکی تیابوو. لەسەر قەرەوێڵەکە درێژی کردم. ئافرەتەکە گوتی: «ناتوانم چەرچەفی بەسەر دادەم، چەرچەفەکان لەناو دۆڵاب کلیل دراون.»

خۆم لە ئافرەتەکە نەگەیاند و بەکابرای دەرگەوانم گوت: «پارە لەناو گیرفانمە، گیرفانی ناوەوە.» دەرگەوان پارەکەمی دەرهێنا. دوو دەستەبەرە هەڵگرەکان لە نزیک قەرەوێڵەکەم وەستابوون، کڵاوەکانیان بەدەستەوە گرتبوو.

– «هەریەکێ پێنج لیرەیان بدێ، پێنجیش بۆ خۆت، ڕاپۆرتەکانیش لەناو گیرفانەکەی ترم دایە، دەتوانی بیاندەیە سستەرەکە.» دەستەبەرە هەڵگرەکان سڵاویان بۆ





کردم و سوپاسیان کردم. منیش وەڵامم دانەوە و گوتم: «خواحافیز، زۆر سوپاس.»

دووبارە سڵاویان کردەوە و چوونە دەرەوە. بەسستەرەکەم گوت: «ئەم ڕاپۆرتانە بار و جۆری نەخۆشیەکەم و ئەو داودەرمانانەی بەکارم هێناون، دیار دەکەن.»

سستەرەکە وەری گرت، کردییەوە، بەچاویلکەکەیەوە چاوێکی پێ خشاند. سێ ڕاپۆرتی لوولدراو بوون گوتی:

– «نازانم چی بکەم، ناتوانم ئیتاڵی بخوێنمەوە بەبێ فەرمانی دکتۆر ناتوانم هیچ بکەم.»

سستەرەکە دەستی بەگریان کرد و خستیە گیرفانی بەرکۆشەکەی خۆیەوە. بەچاوی پڕ لە گریانەوە، لێی پرسیم: «ئایا تۆ ئەمریکی» ؟

– «بەڵێ، بەڵام گەر زەحمەت نەبێ ڕاپۆرتەکان لەسەر مێزەکەی نزیک قەرەوێڵەکەوە دانێ.»

دنیا تاریک و فێنک بوو. کاتێ لەسەر قەرەوێڵەکە ڕاکشابووم ئاوێنەیەکی گەورەم لەلایەکی تری ژوورەکەوە بینی. تیشکێکی بەر پەچ دەکردەوە بەڵام نەمدەزانی ئەو تیشکە چییە. کابرای دەرگەوان لە نزیک قەرەوێڵەکەوە وەستابوو، پیاوێکی ڕووخۆش و میهرەبان بوو.

پێم گوت: «دەتوانی بڕۆی.»

دوایی بەسستەرەکەشم گوت: «تۆش دەتوانی بڕۆی.» بەڵام لێم پرسی: «ناوت چییە؟»

– «مسز ووکەر»

– «مسز ووکەر دەتوانی بڕۆی، منیش دەخەوم.» بەتەنیا لە ژوورەکە بووم. ژوورەکە فێنک بوو و وەکو نەخۆشخانە بەبۆن نەبوو. دۆشەکەکان لە قەرەوێڵەکانەوە قایم کرابوون. زۆر خۆش بوون. بێ جوولە ڕاکشام، بەزەحمەتیش هەناسەم دا، کە هەستم کرد ئازاری قاچم کەم بۆتەوە فەرامۆشییەکم هاتەبەر. ویستم ئاو بخۆمەوە دوگمەی زەنگەکەم دۆزیەوە. بەگوریسێ لە نزیک قەرەوێڵەکەوە بەسترابووەوە. زەنگم لێدا، بەڵام کەس بەدەنگمەوە نەهات، بۆیە لێ کەوتمە خەو. کاتێ خەبەرم بووەوە چاوێکم بەدەوروبەری خۆمدا گێڕا، تیشکی خۆر لە پەنجەرەکانەوە هاتبووە ژوورەوە. دۆڵابێکی گەورە و دیواری ڕووت و دوو کورسیم بینی، قاچەکانم بەشاشی پیس پێچرابوون و ڕاست لەناو نوێن چەقی بوون. منیش بەئاگادارییەوە دەم جووڵاندنەوە. تینووم بوو خۆم گەیاندە زەنگەکە پلم بەدوگمەوە نا گوێم لە دەنگی بوونەوەی دەرگا بوو. تەماشام کرد سستەرێ بوو، جوان و جاحێڵ. گوتم: «بەیانی باش.»

لە قەرەوێڵەکەم نزیک بووەوە و گوتی: «بەیانی باش.»

گوتی: «پێمان نەکرا دکتۆر بێنین. چووەتە دەریاچەی کۆمۆ کەس نەیزانیوە نەخۆش

دێتە ئێرە. هەرچۆنێ بێ چ خێرتە؟.»

– «من بریندارم، برینەکەم لەلاق و پێمەوەیە سەریشم ئازاری پێگەییوە.»

– «ناوت چییە؟»

– «هێنری، فریدریک هێنری.»

– «پێم دەکرێ بتشۆم، بەڵام بۆ مەسەلەی تیمارکردن هیچمان لەدەستدا نییە، تا دکتۆر نەیێ.»

– «خانم بارکلی لێرەیە؟»

– «نەخێر، هیچ کەسێ بەم ناوە لێرە نییە.»

– «ئەو ئافرەتە کێ بوو کە منیان هێنایە ئێرە، دەستی بەگریان کرد؟» سستەرەکە پێکەنی و گوتی: «ئەوە مسز وۆکەر بوو، ئێشکگری شەو بوو، کە تۆیان هێنا ئەو خەوتبوو. چاوەڕوانی هاتنی هیچ نەخۆشێکی نەدەکرد.»

کاتێ قسەمان دەکرد جلەکانمی لەبەرکردنەوە لە شاشەکان بترازێ ئەوەی قوماش بێ لەبەرم نەما. زۆر بەنەرمی و ژیرانە شوشتمی. هەستم کرد ئەم شوشتنە بەکەڵک بوو. سەریشم شاشی لێ بەسترابوو. دەوروبەری شاشەکەی سەریشمی هەموو شوشت.

– «لەکوێ بریندار بووی؟.»

– «لە (ئۆسۆنزی) باکووری (پلاڤا).»

– «کەوتۆتە کوێوە؟»

– «باکووری گۆریزیا.»

هەستم کرد ناوی ئەم شوێنانە، لای ئەو هیچ مانا نابەخشێ.

– «ئازاریان زۆرە؟»

– «نەخێر، ئێستا زۆر نییە.»

سستەرەکە گەرمی پێوی خستە ناو دەمم گوتم:

«ئیتاڵییەکان گەرمی پێو لەبن هەنگڵ دادەنێن.»

– «قسە مەکە.»

کە گەرمی پێوەکەی لەدەمم دەرهێنا. ڕای وەشاند. پلەکەی خوێندەوە.

– «پلەی گەرمی چەندە؟.»

– «پێویست ناکا تۆ بزانی!»

– «پێم بڵێ چەندە؟»

– «زۆر ئاساییە.»

– «هەرگیز تام نەهاتیتێ، قاچەکانیشم پڕن لە کۆنە ئاسن.»





– «مەبەستت چییە؟.»

– «پڕی تەڵەزمی تۆپ و سەنگەر و کۆنە برغی و سپرینگی قەرەوێڵە و شتی ترە.»

سستەرەکە سەری خۆی لەقاند و بزەیەکی هاتێ.

– «ئەگەر قاچەکانت هەر تەنێکی لایەدیان تیابا. ئەوا هەویان دەکرد و تات دەهاتێ.»

– «زۆر چاکە پاشان دەبینی چ عەشاماتێکی لێ دێتە دەرەوە.»

چووە دەرەوە. دوایی لەگەڵ سستەرە پیرەکەی بەیانی زوو، گەڕایەوە. پێکەوە جێگەکەمیان ڕێکخست، منیش هەر لەسەر جێگەم بووم. ئەم جۆرە ئیشە لای من تازە بوو جێگەی سەرسوڕمان بوو.

– «کێ لێپرسراوی ئێرەیە؟.»

– «خانم ڤان کامپن.»

– «ئێرە چەند سستەری لێیە؟.»

– «تەنیا دوو.»

– «هی تر نایێن؟»

– «هەندێکی تر دێن.»

– «کەی دەگەنە ئێرە؟.»

– «نازانم، زۆر بەپرسیاری. لە مرۆڤێکی ئاسایی نەخۆش پتر پرسیار دەکەی.»

– «من نەخۆش نیم، بریندارم.» لە ڕێکخستنی جێگەکەم تەواو بوون. منیش لەسەر قەرەوێڵەکەوە لێی ڕاکشابووم، چەرچەفێ لە بنم و یەکی تریش لەسەرەوە. خانم وۆکەر چووە دەرەوە، دوایی گەڕایەوە کراسی بێجامەی بۆ هێنام. کردیانە بەرم. هەستم کرد زۆر پاک و پۆشتەم. گوتم: «ئێوە زۆر باشن لەگەڵم، دەتوانم پەرداخێ ئاو بخۆمەوە؟» ئەو سستەرەی ناوی گاج بوو پێکەنینێکی بێ مانای گرت.

– «بەڵێ، دەتوانی، دوایش دەتوانی بەرچایێ بخۆی.»

– «من بەرچایم ناوێ. ئاخۆ دەتوانم داوای کردنەوەی پەنجەرەکان بکەم.» ڕووناکی لە ژوورەوە کز بوو، کاتێ پەنجەرەکان کرانەوە ژوورەکە ڕووناک بوو و پڕ تیشکی ڕۆژ بوو. لە باڵکۆنەکەوە تەماشای دەرەوەم کرد، لە پشت سەربان، دووکەڵکێشە کەرپووچ ڕێژەکان دیاربوون. لەو دیو سەربانە بەکەرپووچ داپۆشراوەکانەوە هەورێکی سپی و ئاسمانێکی شینم بینی.

– «نازانی کەی سستەرەکانی تر دەگەنە ئێرە؟»

– «بۆچی، ئێمە خزمەتت ناکەین؟»

– «ئێوە زۆر باشن لەگەڵم.»

– «حەز دەکەی قەعدە بەکاربێنی؟»

– «هەوڵ دەدەم.» یارمەتیان دام، بەرزیان کردمەوە. بەڵام بێ سوود بوو، پاش ماوەیێ لێی پاڵکەوتمەوە لە دەرگا کراوەکاندا سەیری باڵکۆنەکەم کرد.

– «کەی دکتۆر دێ.»

– «هەر کە هاتەوە. هەوڵمان داوە زوو بێ، تەلەفۆنمان بۆ دەریاچەی (کۆمۆ) بۆی کرد.»

– «هیچ دکتۆری تر لێرە نییە؟»

– «ئەو دکتۆری ئەم نەخۆشخانەیە.»

خانم گاج سوراحیەک ئاو و پەرداخێکی هێنا. سێ پەرداخ ئاوم خواردەوە و منیان بەجێهێشت. ماوەیێ لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم کرد. پاشان لێ کەوتمەوە خەو. فرەوینم خوارد، پاش نیوەڕۆیێ خانم (ڤان کامپن)ی سەرپەرشتکاری نەخۆشخانە هات بۆ دیتنم. من کەیفم پێی نەدەهات، ئەویش کەیفی بەمن نەدەهات. کورتەباڵا بوو، زۆر بەگومان بوو، بەڵام پیاو بۆ خوا بلێ پایەی سەرپەرشتکردن هەر لە خۆی دەوەشایەوە. زۆری پرسیار لێ کردم، پێ دەچوو بوونی من لەگەڵ ئیتاڵییەکان بەشوورەیی بزانێ.

– «دەتوانم لەگەڵ خواردن مەی بخۆمەوە.»

– «مەگەر دکتۆر ڕێگەت بدا.»

– «واتە، تا دکتۆر نێ ناتوانم بخۆمەوە؟»

– «هەڵبەت ناتوانی.»

– «داواتان لێ کردووە سەرەنجام هەر بێتەوە؟.»

– «تەلەفۆنمان بۆ دەریاچەی (کۆمۆ) بۆی کردووە.»

ئەو چووە دەرەوە. خانم گاج گەڕایەوە ژوورەوە. گوتی: «بۆچی وا بەڕەقی قسەت لەگەڵ (ڤان کامپن) دەکرد؟.»

پاش ئەوە هەندێ ئیشی زۆر چاپووکانەی بۆ ڕاپەڕاندم. وای پێ گوتم:

– «نەم دەویست بگاتە ئەم ڕادەیە. بەڵام ئەو لەخۆباییە.»

– «ئەو گوتی تۆ خۆت بەزل زانیوە. بەڕەقی قسەت لەگەڵ کردووە.»

– «وام نەکردووە. بەڵام تۆ و ویژدانت بوونی نەخۆشخانە بەبێ دکتۆر چ مانای هەیە؟»

– «بەڕێگاوەیە! تەلەفۆنمان بۆ کردووە.»

– «لەوێ چ دەکا؟ مەلەوانی دەکا؟.»

– «نەخێر، عیادەی لەوێیە.»

– «بۆچی دکتۆرێکی تر ناهێنن؟.»





– «بێدەنگ بە، بێدەنگ. کوڕی چاک بە وا دێ.» ناردم کابرای دەرگەوان بێتە لام. کە هات. بەئیتاڵی پێم گوت قاپێ (سیزانۆ)م لە مەیخانەوە بۆ بێنێت لەگەڵ بوتڵێ کیانتی و ڕۆژنامەیەکی ئێوارە. دەرگەوان چوو شتەکانی هێنابوو. ڕۆژنامەکەی لە بوتڵەکان وەرگرتبوو دەری هێنا. داوام لێ کرد قەپاغەکانیان هەڵبگرێ. قەپاغەکانی هەڵگرت و مەیەکە و (ڤێرمۆث)ەکەی لەژێر قەرەوێڵەکەم دانا، بەتەنیا بەجێیان هێشتم. منیش لەسەر شوێنەکەم پاڵکەوتبووم. لە ڕۆژنامەکە دەنگوباسی بەرەی جەنگ و لیستەی ناوی ئەفسەرە کوژراوەکان و مەدالیا پێدراوەکانم خوێندەوە. دوایی دەستم بۆ خوارەوە درێژ کرد، دەستم لە بوتڵە (سیزانۆ)کەم گیر کرد. هێنامە سەرەوە. لەسەر گەدەی خۆم دانا. پەرداخە فێنکەکەشم لەسەر گەدەم دانا. لەگەڵ هەڵگرتنی بوتڵەکە، لەکاتی تێکردنی پێکی کەم کەم، بوتڵەکە چەند ئەڵقەیەکی بازنەیی لەسەر گەدەم دروست کرد.

تەماشام کرد، دەرەوە، لەسەربانەکانی شارەوە، تاریک دادەهات.

پەڕەسێلکەکان فیتە بەدەورەیان لێدا و سووڕانەوە، تەماشام کردن، باشۆکەکانیش بەسەربانەکان دەفڕین (سیزانۆ)کەم خواردەوە. خانم (گاج)یش پەرداخێکی بۆ هێنام کە (هێلکاو)[(١)]ی تیابوو. کاتێ هاتە ژوورەوە بوتڵە (ڤێرمۆث)ەکەم داگرتە خوارەوە و لەلایەکی تری قەرەوێڵەکەم دانا. گوتی: «خانم (ڤان) هەندێ (شێر)[(١)]ی بۆ تێکردووی. نابێ لەگەڵی ئەوەندە ڕەق بی. خۆ ئەو گەنج نییە. لێپرسراویەتی نەخۆشخانەش کارێکی گەورەیە و بەئەو سپێردراوە. خۆشت دەزانی کە خاتوو (ووکەر) پیرە ناتوانی یارمەتی بدا.

– «ئافرەتێکی مەزنە. زۆر سوپاسی بکە.»

– «ئێستاش دەچم شێوت بۆ دێنم.»

– «زۆر چاکە، هەرچەندە زۆر برسیم نییە.»

کاتێ سنی شێوەکەی هێنا لەسەر مێزی قەرەوێڵەکەمی دانا سوپاسم کرد. کەمێکم خوارد پاشان تاریک داهات. تیشکی ڕووناکی پشکێنەرم لە ئاسماندا بینی. کەمێ تەماشای ئەوەم کرد. لێ خەوتم. خەوێکی خۆشم لێ کەوت. تەنیا جارێک واگا هاتم. ئەویش لە ئەنجامی خەونێ بوو کە ئارەقەیەکی زۆرم کرد، زۆریش ترسام، پاشان نووستمەوە. هەوڵم دا خۆم لە خەونەکە ڕزگار بکەم... دوایی بەماوەیەکی زۆر بەر لە گزنگدان بەخەبەر هاتم. گوێم لە قووقەی کەڵەباب بوو. تا دونیا تەواو ڕووناک داهات نەخەوتم زۆر ماندوو بووم، هەر کە دونیا ڕووناک بوو جارێکی تر لێ کەوتمەوە خەو.

(١) هێلکاو: هێلکەی تێکدراو لەگەڵ شەکر و کەرە و مەی (egg.nog)

(٢) شێر: جۆرە مەیەکە.

## 14

کاتێ واگا هاتم تیشکی ڕۆژ لە ژوورەکەدا تەواو بەتێن بوو. وام زانی کە لەبەرەی جەنگ گەڕاومەتەوە و لەسەر قەرەوێڵەکەم ڕاکشاوم. قاچەکانم ئازاریان دەدام. سەرم پێداگرتن هێشتا لەناو لەفافە پیسەکاندان کە چاوم پێیان کەوت ئەوجا زانیم لە کوێم. دەستم بۆ پەتی زەتگەکەوە هەڵبڕی، دوگمەی زەنگەکەم داگرت. گوێم لە زرینگەی زەنگەکە بوو لە ڕاڕەوەکەدا دەزرینگایەوە. یەکێ بەسۆلی لاستیکی بەڕاڕەوەکەدا دەهات، ئەویش خانم گاج بوو لەبەر تیشکی ڕۆژی گەش کەمێ بەتەمەن دیاربوو، زۆر جوان دیارنەبوو. گوتی: «بەیانی باش، ئایا ئەمشەوت بەخۆشی بردە سەر؟»

– «بەڵێ زۆر سوپاس. دەکرێ داوای سەرتاشێ بکەم؟»

– «هاتم بتبینم بەڵام خەوتبووی، ئەمەشت لەسەر قەرەوێڵەکە لەلابوو.»

دەرگای دۆڵابە گەورەکەی کردەوە بوتلە (ڤێرمۆث)ەکەی دەرهێنا، ئەوەندەی تیا نەمابوو. گوتی: «بوتڵەکەی ژێر قەرەوێڵەکەشم لەناو ئەم دۆڵابە داناوە. بۆچی بۆ پێکێ بانگت نەکردم؟»

– «وام زانی ڕێگەم نادەی بخۆمەوە.»

– «کەمێکم لەگەڵت هەر دەخواردەوە.»

– «تۆ کچێکی باشی.»

– «باش نییە بۆ تۆ بەتەنیا بخۆیتەوە. نابێ لێرە بەدواوە وا بکەی.»

– «زۆر چاکە.»

– «هاوڕێکەت خانم بارکلی هاتە ئێرە.»

– «توخوا بەڕاستتە؟!.»

– «بەڵێ، بەڵام، دڵم نایگرێ.»

– «دەکەوێتە بەر دڵت، کچێکی چەندی بڵێی باشە» سەری خۆی لەقاند و گوتی: «دڵنیام لەوەی کچێکی باشە. دەتوانی کەمێ خۆت بۆ ئەم لایە بجوولێنی؟ ئا ئەوها زۆر باشە. دەبێ بۆ نانی بەیانی پاکت بکەمەوە.»

بەپارچە قوماشێ و بەئاوی گەرم و سابوون جوانی شوشتم و گوتی:

– «شانت بەرزکەوە، ئا ئەوها زۆر باشە»

– «دەتوانم بەر لەنانی بەیانی بەسەرتاشێ، تراشێ بکەم؟»

– «دەرگەوانی بەدوا دەنێرم.»

چووە دەرەوە و گەڕایەوە، گوتی:

– «بەدوام نارد.» ئەو پارچە قوماشەی لە دەستی بوو لە ئاوی تەشتەکەیدا هەڵێنا.





سەرتاشەکە لەگەڵ دەرگەوانەکە هات. پیاوێ بوو تەمەنی پەنجا ساڵ دەبوو. سمێڵێکی قیتی هەبوو. خانم گاج لە شوشتنم تەواو بوو، چووە دەرەوە. کابرای سەرتاش سابوونی لە ڕیشم دا و تاشی. کابرایەکی خۆ بەگەورەزان و زۆر بەفیز و کڕ بوو. پرسیم:

«مەسەلە چییە؟ چ دەنگوباس نازانی؟»

– «دەنگوباسی چی؟»

– «هەرچی بێ؟ چ لەشار ڕووی داوە؟»

– «ئێستا کاتی شەڕە و دوژمن بەگوێیە. گوێی لە هەموو شوێنێیە.» سەرم بەرز کردەوە گوتی: «تکایە سەرت هەڵبڕە.» وای گوت لە تاشین بەردەوام بوو و گوتی:

– «هیچت لێم گوێ لێ نابێ.»

گوتم: «تۆ چیتە؟»

– «من ئیتاڵیم. بەهیچ شێوەیێ دەستم لەگەڵ دوژمن تێکەڵ ناکەم.»

بەوەندە وازم لێ هێنا لەوانەیە شێت بێ خوا خوام بوو زوو لەژێر گوێزانەکەی ڕزگارم بێ. هەر ئەوەندە ویستم جارێکی تر سەیری بکەم. گوتی: «ئاگاداربە گوێزانەکە زۆر تیژە.»

کاتێ تەواو بوو پارەکەیم دا نیو لیرەم چێشتانە دایێ، بۆی ڕەت کردمەوە و گوتی: «نامەوێ خۆ لەبەرەی جەنگ نیم، بەڵام چاک بزانە من ئیتاڵیم»

– «بڕۆ لەبەر چاوانم ون بە»

گوتی: «بەیارمەتیت»

هەر ئەوەندەی گوت و گوێزانەکەی لەلاپەڕەیەکی ڕۆژنامەکە پێچایەوە و چووە دەرەوە. پێنج پارە مسیەکەشی لەسەر مێزەکەی نزیک قەرەوێڵەکەم بەجێهێشت و زەنگم لێدا. خانم گاج هاتە ژوورەوە.

– «زەحمەت نەبێ بانگی کابرای دەرگەوانم بۆ ناکەی؟»

– «زۆر باشە.» کابرای دەرگەوان هاتە ژوورەوە، هەوڵی دەدا پێکەنینی ڕابگرێ. لێم پرسی: «ئایا ئەو سەرتاشە شێتە؟»

لە وەڵامدا گوتی: «نا، گەورەم، بەهەڵە چووبوو. زۆر بەباشی تێ نەگەییووە. وای زانیوە من گوتوومە تۆ ئەفسەرێکی نەمساوی.»

گوتم: «ئۆهـ.»

– «هۆ، هۆ، هۆ، کابرایەکی سەیر بوو، پێمی گوت گەر تۆ جولەیەکت کردبایە...» پەنجەی دۆشاومژەی بۆ لای گەرووی بەرز کردەوە. دووبارە پێکەنییەوە «هۆ، هۆ، هۆ،...» ویستی پێکەنینی ڕابگرێ.

– «کاتێ پێم گوت تۆ نەمساوی نی هۆ، هۆ، هۆ...»

– «بەتوورەییەوە گوتم: «هۆ، هۆ، هۆ! سەیر دەبوو گەر ملی پەلدابام....»

– «نەخێر، گەورەم، نەء، نەء زراوی لە نەمساوییەکان چووە، هۆ، هۆ، هۆ،....»

– «هۆ، هۆ، هۆ، لێرە بڕۆ دەرەوە...»

چووە دەرەوە گوێم لێ بوو لە ڕاڕەوەکەوەش لە پێکەنینی نەکەوتبوو، گوێم لە خوستەی پێی یەکێ بوو لە ڕاڕەوەکەوە دەڕۆیی. تەماشای دەرگام کرد. خانم بارکلی بوو. وەژوور کەوت و بۆ لای قەرەوێڵەکەم هات.

گوتی: «ڕۆژباش خۆشەویستم.»

زۆر تەڕ و جاحێڵ و جوان بوو. وا هاتە خەیاڵم کە هەرگیز هیچ کەسێکی وا جوانم نەدیوە. کاتێ ئەوم بینی، گیرۆدەی ئەڤینی ئەو بووم. هەموو ناخم سەراوژێر بوو. تەماشای دەرگای کرد بینی کەس دیار نییە. لەلایەکی قەرەوێڵەکەم دانیشت. خۆی داهێنایەوە ماچی کردم، منیش بۆ خوارەوەترم ڕاکێشا و ماچم کرد، هەستم کرد کە دڵی لێدەدا. گوتم: «خۆشەویستەکەم هاتنی خۆت بۆ ئێرە لا سەیر نییە؟»

– «هاتنم زەحمەت نەبوو، مانەوەم زەحمەتە»

– «دەبێ لێرە بمێنێی. ئۆه، تۆ زۆر جوانی.»

خەریک بوو شێت بم بۆی. باوەڕم نەکرد کەوا ئەو لەتەکمە. بەتوندی باوەشم تێ کرد. گوتی: «نابێ وا بکەی. تەندروستیت تەواو نییە.»

– «بەڵێ تەندروستیم تەواوە. دەی.»

– «نەخێر، تۆ هێشتا ئەوەندە بەهێز نیی.»

– «بەڵێ، بەهێزم. بەڵێ، تکایە.»

– «ئایا تۆ منت خۆش دەوێ؟»

– «بەڕاستی تۆم خۆش دەوێ. خەریکە شێت بم بۆت. تکایە، وەرە.»

– «گوێ لە دڵە کوتەی دڵمان بگرە.»

– «دڵی خۆمانمان لا هیچ نییە. من تۆم دەوێ. ئێستا شێتی تۆم.»

– «بەڕاستی تۆ منت خۆش دەوێ؟»

– «بەس ئەم قسەیە بڵێوە. وەرە. تکایە، تکایە، کاترین.»

– «باشە بەڵام لە خولەکێ زیاتر ناخایێنێ.»

گوتم: «قەیدی ناکا. دەرگاکە داخە.»

– «تۆ ناتوانی، نابێ وا بکەی.»

– «وەرە، قسە مەکە. وەرە.»

کاترین لە سەر کورسییێ لەنزیک قەرەوێڵەکەوە دانیشت، دەرگاکەش کرابووەوە، دەیڕوانییە سەر داڵانەکە. کەف و کولم نیشتەوە قەت وا خۆم بەهێمن و شێنەیی





نەبینیوە. لێی پرسیم: «جا ئێستا باوەڕم پێ دەکەی تۆم خۆش دەوێ؟.»

– «ئۆه، تۆ مرۆڤێکی بەر دڵی. دەبێ بمێنێیتەوە. ناتوانن ڕەوانەت بکەنەوە. شێت و شەیدای ئەڤینی تۆ بووم.»

– «دەبێ زۆر وریا بین. ئەم کارەی ئێمە شێتایەتییە. نابێ وا بکەین.»

– «لە شەودا دەتوانین.»

– «دەبێ زۆر ئاگاداربین. دەبێ وریابین، نەخوازەڵا لەبەرچاوی خەڵک!»

– «ئاگادار دەبم.»

– «دەبێ ئاگادار بی. تۆ شیرینی. ئایا تۆ منت خۆش دەوێ، وا نییە؟.»

– «ئەمە دووبارە مەکەوە. تۆ نازانی ئەم قسەیە چ لەمن دەکات؟.»

– «لەمەودوا ئاگادار دەبم. نامەوێ لەوە زیاتر هیچی ترت لەگەڵ بکەم. ئێستا دەبێ بڕۆم، ئازیزم، بەڕاستی دەبێ بڕۆم.»

– «یەکسەر بگەڕێیتەوە.»

– «خوا حافیز.»

– «خوا حافیز شیرینەکەم.»

ئەو چووە دەرەوە. خوا دەزانێ من نەمدەویست بکەومە داوی ئەڤینی ئەوەوە، یان ئەڤینی هیچ ئافرەتێکی ترەوە. بەڵام خوا دەزانێ ئەوە وا هات. من لەناو جێگە لە ژوورێکی نەخۆشخانەی میلانۆ کەوتبووم. هەموو جۆرە شتێک لەناو سەرمدا گلی دەخواردەوە. هەستم بەسەرسووڕە و واق و وڕمان کرد. لەدواییدا خانم گاج هاتە ژوورەوە گوتی:

«دکتۆر وا بەڕێوەیە. لە دەریاچەی (کۆمۆ)وە تەلەفۆنی کرد.»

– «کەی دەگاتە ئێرە؟.»

– «پاش نیوەڕۆ دەگاتە جێ.»

## 15

تا پاش نیوەڕۆ هیچ ڕووی نەدا. دکتۆر پیاوێکی لاواز و کورتەباڵا و هێمن بوو، لە نێوچەوانی دەتخوێندەوە کە لەشەڕ بێزارە. چەند تەڵەزمی بچووکی پۆڵایی بەوریایی و جوانی و بێ زەوقی لەشلکەی هەردوو ڕانم دەرهێنا. سڕکەرێکی خۆماڵی بۆ سڕکردنی شانە پێکاوەکان بەکارهێنا. پێیان دەگوت (بەفر) یا شتێکی لەو بابەتە کە شانەکانی سڕ دەکرد و ژانەکەی دادەمرکاندەوە. تا ئەو کاتەی میلی نەشتەری یا (نێزە) وەیان (جفتە) نەدەگەیشتە ژێر جێیە سڕبووەکە هەستت پێ نەدەکرد. جێیە سڕبووەکەی بەئارامی دیارکرد.

پاش ئەوەی دکتۆر بێ ئارامی سەری تێ کرد و سەرقاڵی بوو گوتی وا چاکە ئەشیعەی ئێکس وەربگیرێ چونکە دیارخستنی ئەنجام بەمیلی نەشتەری جێگای دڵنیایی نییە. لە نەخۆشخانەی (ماگیۆر) تیشکی -ئێکسیان بۆ وەرگرتم. ئەو دکتۆرەی ئەم کارەی ئەنجام دا مرۆڤێکی زۆر بەهەڵپە و چاپووک و بەزەوق بوو. ئەم کارەش بەبەرزکردنەوەی هەردوو شانەوە ئەنجام درا. نەخۆش بەخۆی دەیتوانی هەندێ تەنە بیانییە هەرە گەورەکان لەناو ئامێرەکەدا ببینێ.

ئەشیعەکان دەنێرتە نەخۆشخانەکەم. دکتۆر داوای لێ کردم لەناو دەفتەری تێبینییەکانی گیرفانی ناوی خۆم و پەلەکەم، پایەکەم و بیروبۆچوونی خۆم بنووسم. گوتی تەنەکانی ناو لەشم پیس و بێزەوەر و بەئازارن.

نەمساوییەکان کوڕی سۆزانین. چەند پیاوت لێ کوشتوون؟ هیچ کەسێکم نەکوشتووە. بەڵام بۆ ئەوەی دڵی ئەو ڕازی بکەم. گوتم: زۆرم لێ کوشتوون. خانم (گاج)م لەگەڵابوو. دکتۆر قۆڵی لەبن هەنگڵەکانی هەڵکێشا گوتی گاج زۆر لە کلێوپاترە جوانترە. ئاخۆ گاج دەبێ لەمە گەیشتبێ؟ کلێوپاترەی شاژنی دێرینی میسر. بەڵێ. خوا هەڵناگرێ وابوو. بەئوتومبیلی فریاگوزاری گەڕاینەوە نەخۆشخانە بچووکەکە.

پاش ماوەیێ زۆر بەرز بوونەوە خۆم لە نهۆمی سەرەوە لە جێگاکەم بینییەوە. پاش نیوەڕۆیێ ئەوێ ڕۆژێ ئەشیعەکانم بەدەست گەیشت. دکتۆر سوێندی بەخوا خوارد. پاش نیوەڕۆی بۆمیان بنێرێ. هەرێی خۆی گەیاندە جێ. کاترین ئەشیعەکانی نیشان دام. لەناو بەرگە سوورەکانیاندا بوون. لەناو بەرگەکە دەری هێنان، بەرزی کردنەوە دایە بەر تیشکی ڕووناکی. هەردووکمان تەماشامان کرد. گوتی: «ئەمە قاچی ڕاستەتە.» داینایەوە ناو بەرگەکەی: «ئەمەشیان قاچی چەپەتە.»

– «لەولایان دانێ و وەرە سەر قەرەوێڵەکەوە.»

گوتی: «ناتوانم تەنیا بۆ چرکەیێ هاتووم. هاتووم ئەمانەت نیشاندەم و بگەڕێمەوە.» چووە دەرەوە و منیش لەوێ درێژ ببووم. پاش نیوەڕۆیەکی گەرم بوو. منیش لەمانەوەی ناو جێگە بێزار ببووم بەدوای دەرگەوانم نارد ڕۆژنامەم بۆ بکڕێ، لە هەموو ڕۆژنامەیێ کە دەستدەکەوێ ڕۆژنامەیێ بێنێ. بەر لەوەی دەرگەوانەکە بگەڕێتەوە سێ دکتۆر لێم وەژوور کەوتن. منیش تێبینی ئەوەم کرد کە ئەو دکتۆرانە لە پیشەی پزیشکی سەرکەوتوو نەبن، لەکاتی دیتنی نەخۆش بۆ یارمەتی و ئامۆژگاری پەنا دەبەنە بەر هاوڕێکانیان. ئەو دکتۆرەی نەتوانێ بەڕێکی و سەرکەوتووانە ڕیخۆڵە کوێرەت ببڕێ، ڕێنمایی دکتۆرێکت بۆ دەکا لەجیاتی ڕیخۆڵە کوێرە کە ناتوانێ نەشتەرگەری ئالۆتت بەسەرکەوتووانە بۆ بکا. ئەو سێ دکتۆرەش لەم چەشنە بوون و هەرێیان لە مەڕێ دەرنەدەکرد. لێپرسراوەکەیان بەدەستە ناسکەکانی نیشانی کردم و گوتی: «ئەوە گەنجەکەیە.» دکتۆرەکیان ڕەقەڵەی کەڵەگەتی ڕیشدار بوو، گوتی: «چۆنی؟» دکتۆری سێیەمیش کە ئەشیعەکانی بەدەستەوە بوو، لەناو بەرگە سوورەکانیان دابوون و نقەی





لێوە نەهات. دکتۆرە ڕیشدارەکەش پرسی: «ئەرێ شاشەکان بکەینەوە؟» دکتۆری لێپرسراو گوتی: «هەڵبەت» بەخانم گاجی گوت: «زەحمەت نەبێ شاشەکان بکەوە.» خانم گاج شاشەکانی لابرد. منیش سەرم بەسەر داگرت تەماشای هەردوو قاچی خۆمم کرد. لە نەخۆشخانەی مەیداندا قاچەکانم وەکو گۆشتی هەمبەرگەری نەبرژاو بوون، بەڵام ئێستاکە قەتماغەدارن و ئەژنۆکەشم ئاوساو و بێ ڕەنگ بوون. بەلەکم چرچ و وێک هاتبوونەوە، بەڵام کێمی نەکردبوو. دکتۆری لێپرسراو گوتی: «زۆر پاکن. زۆر پاک و جوانن.» دکتۆری ڕیشدار برمەیەکی لێوەهات گوتی: «ئم.» دکتۆری سێیەمیش لەسەر شانی دکتۆری لێپرسیراوەوە سەیری کرد. دکتۆری ڕیشدار گوتی: «زەحمەت نەبێ چۆکت بجوولێنە.»

– «ناتوانم.» دکتۆری ڕیشدار گوتی: «جوولەی جومگەکان تاقی بکەینەوە؟» ئەو خەتێک و سێ ئەستێرەی بەقۆڵەوە بوو. ئەمەش مانای ئەوەیە کە کاپتنی پلەی یەکەمە.

دکتۆری لێپرسراو گوتی: «هەڵبەت، دەبێ تاقی بکرێتەوە.» دوانیان قاچی ڕاستەمیان زۆر بەوریاییەوە چەماندەوە.

گوتم: «ئازارم دەدا.»

– «بەڵێ بەڵێ. کەمێکی تر بیچەمێنەوە، دکتۆر.»

– «هەر ئەوەندە دەچەمێتەوە.»

گوتم: «لەوەندە زیاتر ناچەمێتەوە.» کاپتنی یەکەم گوتی: «جومگەی کەمێک بزفتییە.» هەستایە سەرپێ و گوتی: «دەتوانم جارێکی تر چاوێ بەئەشیعەکاندا بگێڕم، دکتۆر؟» دکتۆری سێیەم ئەشیعەکانی دایە دەست، گوتی: «ئەمە نا، هی چەپەی زەحمەت نەبێ.»

– «ئەمە چەپەیەتی.»

– «بەڵێ، ڕاست دەکەی من لە گۆشەیەکی ترەوە سەیرم کرد.»

ئەشیعەکەی گەڕاندەوە، دوایی بۆ ماوەیێ سەیری ئەشیعەکانی تری کرد. گوتی: «ئەمە دەبینی، دکتۆر؟» تەنێ لەو تەنە بیانیانەی دەستنیشان کرد کە شێوەی گۆییان وەرگرتبوو کە لەبەر گلۆپەکاندا بەئاشکرا بەدیار کەوتن. هەموویان بۆ ماوەیێ سەیری ئەشیعەکانیان کرد.

کاپتنی ڕیشدار گوتی: «من دەتوانم تەنیا یەک شت بڵێم، مەسەلە مەسەلەی کاتە. لەوانەیە سێ مانگ، شەش مانگ»

– «هەڵبەت شلەی ناو پێت دەبێ خۆی دروست کاتەوە.»

– «هەڵبەت، ئەوە مەسەلەی کاتە، من ناتوانم بێ ویژدانانە بەر لەوەی تەڵەزمەکان کیس بکەن چۆکی هەڵدڕم.»

– «من لەگەڵ ڕای تۆم، دکتۆر.»

پرسیم: «شەش مانگ! بۆچی؟»

– «شەش مانگ بۆ کیسکردنی تەڵەزمەکان بەر لەوەی کلاوی چۆکت هەڵبدڕێ تا بەسەلامەتی نەشتەرگەریت بۆ بکرێ.»

گوتم: «ئەوە باوەڕ ناکەم.»

– «تۆ ناتەوێ چۆکت سەلامەت دەرچێ، گەنجۆ؟»

گوتم: «نەخێر.»

– «چیی؟»

– «دەمەوێ ببڕێتەوە. ئەوکات دەتوانم چەوتەکێکی تێخەم.»

– «مەبەستت لە چەوتەک چییە؟»

دکتۆری لێپرساو گوتی: «گاڵتە دەکا، دەیەوێ چۆکی سەلامەت دەرچێ. ئەمە گەنجێکی زۆر بەجەرگە بۆ وەرگرتنی مەدالیای ئازایەتی، لە چەشنی زیو هەڵبژێردراوە.» دەستێکی لەسەر شانم دانا. کاپتنی یەکەم تۆقەی لەگەڵ کردم و گوتی: «زۆر پیرۆزباییت لێ دەکەم. هەر ئەوەندەم پێ دەکرێ بڵێم زوو چاک ببیتەوە، بەڵام بەلای کەم دەبێ شەش مانگ لێرە بمێنیتەوە، بەر لەوەی چۆکت نەشتەرگەری بۆ بکرێ. تۆش لە بیروڕای خۆت سەربەستی.» گوتم: «زۆر سوپاست دەکەم. ڕێزی بیروڕاکانت دەگرم.» کاپتنی یەکەم سەیری سەعاتەکەی کرد گوتی: «پێویستە بڕۆین. هیوادارم چاک ببیتەوە.» گوتم: «خۆشبی، زۆر سوپاست دەکەم.» تۆقەم لەگەڵ دکتۆری سێیەم کرد. گوتی: «کاپتن ڤارینی.»

– «تێنیتا هێنری.»

هەرسێکیان چوونە دەرەوە. بانگم ڕادێرا: «خانم گاج.» گاج هاتە ژوورێ گوتم: «زەحمەت نەبێ بەدکتۆری لێپرساو ناڵێی بۆ دەقەیێ بێتە لام.» دکتۆر هاتە ژوورەوە. شەپقەکەی بەدەستەوە گرتبوو. لە نزیک قەرەوێڵەکەم ڕاوەستا.

گوتی: «حەزت کرد من ببینی؟.»

– «بەڵێ، من ناتوانم بەر لە نەشتەرگەری شەش مانگ لێرە بکەوم، توخودا دکتۆر تۆ هیچ جار شەش مانگ لەناو جێگەت ماویەتەوە؟»

– «تۆ ئەو شەش مانگە لەنێو جێگە ناکەوی. بەر لە هەموو شتێ دەبێ برینەکەت بدرێتە بەر هەتاو. پاشان دەتوانی لەسەر دارشەق بڕۆی.»

– «شەش مانگ ئەوجا نەشتەرگەریم بۆ دەکرێ.»

– «ئەمە سەلامەتترین ڕێگایە. تا تەنە بیانییەکان کیس بکەن و شلەی چۆکت خۆی دروست کاتەوە. ئەوکات کردنەوەی کلاوەی چۆکت ئاسان دەبێ.»





– «دکتۆر تۆ خۆت لەو باوەڕەی شەش مانگ بتوانم چاوەڕوان بکەم.»

– «ئاخر ئەمە ڕێگەیەکی سەلامەتە.»

– «ئەو کاپتنە یەکەمە کێیە؟.»

– «باشترین نوژداری (میلانۆ)یە.»

– «کاپتنی یەکەمە؟»

– «بەڵێ، بەڵام باشترین نوژدارە.»

– «نامەوێ کاپتنی یەکەم دەست لە قاچم بدا. ئەگەر کەمێ باشتر بوایە دەکرا بە مێجەر. دکتۆر گیان، من دەزانم کاپتنی یەکەم مانای چییە؟»

– «نوژدارێکی زۆر چاکە، من خۆم پێشنیار و ڕاوەرگرتنی ئەوم لە هەموو ئەوانەی دەیانناسم لاباشترە.»

– «ئایا نوژداری تر دەتوانێ قاچم ببینێ؟»

– «بێ گومان دەتوانی. گەر خۆت حەز بکەی، بەڵام من قسەی دکتۆر (ڤاریلا) بەسەرپشک دادەنێم.»

– «دەتوانی داوا لە نوژداری تر بکەی قاچم ببینێ»

– «داوا لە ڤالینتی دەکەم بێت.»

– «ڤالینتی کێیە؟.»

– «نوژداری نەخۆشخانەی ماگیۆرییە.»

– «زۆر باشە، منیش ڕێزی ئەو پیاوەتییەت دەگرم. تۆ تێدەگەی دکتۆر من ناتوانم شەش مانگ لەناو جێگە بکەوم.»

– «وەکو پێم گوتی: لەناو جێگە ناکەوی. بەر لە هەموو شتێ دەبێ بەهەتاو چارەسەر بکرێ. پاشان مەشقی سووک دەکەی. هەر کاتێ تەڵەزمەکان کیسیان کرد ئەوا نەشتەرگەریت بۆ دەکرێ.»

– «بەڵام ناتوانم شەش مانگ چاوەڕێ بکەم.» پەنجەکانی شەپقەی بەدەستەوەی بوو کردەوە و بزەیەکی هاتێ؛ گوتی: «ئەوەندە شەیدای گەڕانەوەی بەرەکانی جەنگی؟!»

– «بۆچی نە ء؟»

– «زۆر جوانە، تۆ جوانمەردێکی عەگیدی.»

بۆ لای من هەنگاوی ناو خۆی بەسەرمدا داهێنایەوە و بەنەرمی نێوچەوانی ماچ کردم.

– «بەدوای دکتۆر ڤالینتیدا دەنێرم. پیاوی باش بە. خۆت پەشۆکاو و دڵتەنگ مەکە. کوڕی باش بە.»

پرسیم: «دەخۆیتەوە؟»

– «سوپاس، هەرگیز مەیم نەخواردۆتەوە.»

زەنگێکم بۆ دەرگەوان لێدا تا دوو پەرداخ بێنێ.

– «تەنیا پێکێ.»

– «نەخێر، نەخێر، سوپاس، ئەوان چاوەڕێی منن.»

گوتم: «خواحافیز.»

– «خواحافیز.»

پاش دوو سەعات دکتۆر (ڤالینتینی) هاتە ژوورەکەم. زۆر بەپەلە بوو داوی سمێڵی قیت قیت وەستابوون. پلەی سەربازی مێجەر بوو. پێستی ڕووی هەڵقرچابوو و دەم بەپێکەنین بوو.

– «چۆن ئەم کارەساتە چەپەڵەت بەسەر هات؟ ئەشیعەکانم نیشاندەن. بەڵێ، بەڵێ، ئەمە خۆیەتی. وەکو گوێز ساغیت[١]. ئەی ئەم کچە جوانە کێیە؟ دەزگیرانتە؟ لەو باوەڕەم دەزگیرانت بێ؟ ئەی ئەم شەڕە نەفرەتی نییە؟ هەست بەچی دەکەی؟ تۆ کوڕێکی کۆکی. شەرت بێ لە جارانت چاکتر بکەمەوە. ئەرێ هەست بەئازار دەکەی؟ مەرج دەکەم ئازارت دەدا. ئەم دکتۆرانە چۆن دڵیان بەرایی داوە ئازارت بدەن؟ نازانم ئەو ماوەیە چیان بۆ کردووی؟ ئەم کچە ئیتاڵی دەزانێ؟ دەبێ فێری ببێ. کچێکی چەند بەردڵە. دەتوانم فێری ئیتاڵی بکەم. بەوەی خۆم لێرە نەخۆش کەم. نەخێر، دەبێ بەخۆڕایی مامانی بۆ بکەم. ئایا ئەو ئەمە تێگەیشت؟! منداڵێکی جوان و خانومانی وەکو خۆی دەبێ. ئەمە باشە. کچێکی چەند بەردڵە! توخوا لێی بپرسە بزانە ئێوارە شیوم لەگەڵ دەخوا. نەخێر، نامەوێ لەتۆی بسەنم. زۆر سوپاس ئەی خانمی جوان. ئەمە هەموویەتی.» دەستێکی لەسەر شانم دانا و گوتی: «ئەمە هەموویەتی کە دەمەوێ بزانم. لەمەودوا شاش بەکارمەهێنە.»

– «دکتۆر (ڤالنتینی) پێکێ ناخۆیتەوە؟»

– «پێکێ؟! دە پێک. کوا لە کوێیە؟.»

– «لەناو دۆلابەکەیە. خانم بارکلی بوتلێکمان بۆ دێنێ.»

– «لەگیانی تۆ، لەگیانی تۆ خانم. خانم کچێکی چەند بەردڵە. من کۆنیاکی لەوە پاکترت بۆ دێنم.» سمێڵی خۆی سڕییەوە.

– «بەمەزەندەی تۆ کەی نەشتەرگەرییەکە بکرێ باشە؟.»

– «بەیانی سەر لە سبەینێ. لەوە زووتر نییە. دەبێ گەدەت خاڵی ببێ. هەروا دەبێ خۆشت جوان بشۆی. پیرە کچەکە لە خوارەوە دەبینم، هەندێ زانیاری و ڕێوشوێنی دەدەمێ. خواحافیز تا بەیانی. کۆنیاکی لەوە چاکترت بۆ دێنم. تۆ خۆت لێرە حەساوەی

(١) لەئینگلیزییەکەی دەڵێت: وەکو بزن ساغیت.





تا بەیانی خوا حافیز. باش بخەوە، بەیانی زوو دەتبینم.»

لەبەر دەرگا دەستی بۆ هەڵبڕیم و سمێڵەکانی قیت بووەنەوە و ڕووە ئەسمەرەکەشی بزەدار بوو. لەسەر باسکی لەناو چوار گۆشەیێ ئەستێرەیەک هەبوو. چونکە مێجەر بوو..

## 16

ئەوێ شەوێ، شەمشەمەکوێرەیێ لە دەرگا کراوەکەی باڵکۆنەکەوە، کە لەوێوە لەسەرخانی شارەکەوە ورد دەبووینەوە، خۆی دەژۆرێ کرد. ژوورەوە تاریک بوو لەکزە ڕووناکییەکی شەوانەی شارەکەوە بترازێ هیچی تری تیا نەبوو، شەمشەمەکوێرەش بێ ترس بوو. لە ڕاوی خۆی نەکەوت، هەروەک ئەوەی لە دەرەوە بێ وا بوو. ئێمە ڕاکشاین و تەماشای ئەومان کرد، لەو باوەڕەدا بووم ئێمەی نەدیبێ چونکە بێ هەست و خوست لێ ڕاکشابووین. پاش ئەوەی شەمشەمەکوێرەکە چووە دەرەوە، تیشکێکی پشکنین پەیدابوو و بەرەو ئاسمان هەڵکشا و دوورکەوتەوە و جارێکی تر بووەوە شەوەزەنگ. کزەبایەک سەری بەژووردا کرد و گوێمان لە قسەی پیاوە فڕۆکە شکێنەکان بوو، کە لەسەر ئاخەبانەکەی تەنیشتمان قسەیان دەکرد هەوا فێنک بوو، ئەوانیش سەر بەرگەکانیان دەبەر دەکرد. لەوە دەترسام بەم شەوە یەکێ سەرکەوێتە سەرەوە بەم شێوەیە بمان بینێ. بەڵام کاترین گوتی: هەموویان نوستوون. ئەم شەوە جارێک خەومان لێ کەوت، کاتێ واگا هاتم (کاترین) لە تەنیشتم نەبوو، بەڵام لە هۆڵەکەوە گوێم لە تەپەی پێی بوو. دەرگاکەی کردەوە و گەڕایەوە سەر نوێنەکە. گوتی لە خوارێ بوو، هەموو شتێ زۆر ئاسایی بوو، هەموویان لە حەوت خەودان. لە پشت دەرگاکەی خانم (ڤان) خۆی دانوستاندبوو و گوێی لە پرخە پرخی ئەو بووە. کاترین هەندێ پسکویتی لەگەڵ خۆی هێنابوو، خواردمان و هەندێ (ڤێرمۆث)مان بەدوایدا نۆشی. هەردووکمان زۆر برسی بووین. گوتی: ئەوەی ئێستا دەیخۆی تا بەیانی دەبێ هیچت لە هەناودا نەمابێ، جارێکی تر لێکەوتمەوە خەوێ، بەیانی کە واگاهاتم، ڕووناک بوو، جارێکی تر (کاترین) چووبۆوە دەرەوە. کە هاتەوە زۆر تەڕ و بەردڵتر دەهاتە بەرچاو. لەسەر قەرەوێڵەکە دانیشت، ڕۆژ هەڵات و منیش گەرمی پێوم لەنێو دەمدا بوو، هەستمان بەبۆنی خوناوی سەر بانەکان و بۆنی قاوەی پیاوانی فڕۆکە شکێنی سەربانەکەی تەنیشتمان کرد. کاترین گوتی: «خۆزیا بمان توانیبایە پیاسەیەکمان کردبایە، گەر عارەبانەمان هەبوایە پاڵم پێوە دەنای.»

– «چۆن دەتوانم لەسەر عارەبانە دانیشم.»

– «دەتوانین.» لە دەرگا کراوەکە سەیری دەرەوەم کرد، گوتم: «دەتوانین بچین لە باخچەکە بەرچایێ بخۆین؟»

– «بەڵام بەر لە هەموو شتێ دەبێ بۆ دکتۆر (ڤالینتینی)ی هاوڕێت ئامادە بکەم.»

– «لەو باوەڕەدام پیاوێکی مەزن بێ.»

– «ئەوەندەی تۆ ئەوم خۆش ناوێ، بەڵام لەو باوەڕەم پیاوێکی زۆر باشە.»

– «تکایە کاترین وەرە سەر نوێنەکە.»

– «ناتوانم. ئەرێ ئەمشەو خۆشمان ڕانەبوارد؟.»

– «دەتوانی ئەمشەویش ببی بەئێشکگر؟.»

– «لەوانەیە بتوانم، بەڵام پێویستت بەمن نابێ.»

– «بەڵێ، پێویستیم پێت دەبێ.»

– «نەخێر، پێویستیت پێم نابێ. هێشتا نەکەوتیتە بەر دەستی نوژدار، نازانی چۆن دەبی.»

– «باش دەبم.»

– «تۆ نەخۆش دەکەویت و منیش هیچ سوودێکم بۆت نابێ.»

– «کەوابێ ئێستا وەرە لام.»

– «نەخێر، دەبێ هێڵی بەیانی و پلەی گەرمیت بنووسم و بۆ نەشتەرگەری ئامادەت بکەم، خۆشەویستم.»

– «بەڕاستی منت خۆش ناوێت دەنا دێیتە لام.»

ماچی کردم و گوتی: «هەی گێلە پیاو هێڵی بەیانیت زۆر چاکە، گەرمیت ئاساییە پلەیەکی گەرمی باشت هەیە.»

– «تۆش هەموو شتێکت لەبەر دڵانە.»

– «ئۆهـ، نەء، پلەی گەرمییەکەت بەردڵە، زۆر شانازی بەگەرمییەکەت دەکەم.»

– «لەوانەیە منداڵەکانمان گشتیان پلەی گەرمی چاکیان ببێ.»

– «ڕەنگە منداڵەکانمان پلەی گەرمیان ئاژەڵانە بێ.»

– «ئێستا دەبێ چی بکەی تا بۆ دکتۆر (ڤالنتینی) ئامادەبم.»

– «چ نییە. بەڵام شتێکی تەواو ناخۆشە.»

– «هیوادارم تۆ بەم کارە هەڵنەستی.»

– «من بەو هیوایەم. حەزیش ناکەم هیچ کەسێ لە خۆم زیاتر بەم کارە هەڵبستێ و دەستت لێ بدا. من شێتم ئەگەر هەر کەسێ دەستت لێ بدا دەڕەنجێم.»

– «هەتا فێرگسۆنیش؟.»

– «بەتایبەتی فێرگسۆن و گاج و ئەوی تریش. ناوی چییە؟.»

– «وۆکەر.»





– «خۆیەتی، ئێستا ژمارەیەکی زۆر سستەر لێرە هەن. یان دەبێ نەخۆشی ترمان بۆ ڕەوانە بکەن. یان ئەوەتا دەمان گوێزنەوە. ئێستا چوار سستەری لێیە.»

– «لەوانەیە نەخۆشی تر بنێرن، ئەوجا پێویستیان بەژمارەیێ سستەر دەبێ. نەخۆشخانەیەکی گەورەیە.»

– «بەو هیوایەم نەخۆشی ترمان بۆ بێ. چیم پێ دەکرێ گەر خوانەخوازە بگوێزرێمەوە. گەر نەخۆشی ترمان بۆ نەیەت ئەوا دەمانگوێزنەوە.»

– «ئەوکات منیش دەبێ بڕۆم.»

– «گێل مەبە. تۆ توانای ڕۆیشتنت نییە. کەی بەچاکی چاک بوویتەوە. ئازیزم، ئەوا پێکەوە سەر بۆ لایەک هەڵدەگرین.»

– «ئەی پاشان؟.»

– «لەوانەیە شەڕ کۆتایی بێ. خۆ هەر بەردەوام نابێ.»

گوتم: «چاک دەبمەوە، (ڤالنتینی) نوێم دەکاتەوە.»

– «هیچ گومانی تیا نییە. مادامە خاوەنی ئەم سمێڵانەیە. تکایە ئازیزم کاتێ بەنجت لێ دەدەن بیر لە شتی تر بکەرەوە. بیر لە خۆمان مەکەوە.» چونکە مرۆڤ بەکاری بەنج زۆر قسە دەکا.»

– «ئەی بیر لەچی بکەمەوە؟.»

– «لەهەرچی بێ. هەر چ بێ. تەنیا لە خۆمان نەبێ بیر لە ماڵەوەتان بکەوە. وەیا لە هەر کچێکی تر.»

– «نا.»

– «نوێژ بکە، لەوانەیە کارێکی گرینگ بکا.»

– «لەوانەیە قسە نەکەم.»

– «ئەمە زۆر ڕاستە. زۆر خەڵک هەن هەرگیز قسە ناکەن.»

– «من قسە ناکەم.»

– «خۆ هەڵمەکێشە. ئازیزم. تکات لێ دەکەم خۆ هەڵمەکێشە، تۆ زۆر شیرینی، پێویست ناکا خۆ هەڵبکێشی.»

– «هەر متەقیش ناکەم.»

– «ئازیزم، ئێستا وا خۆ هەڵدەکێشی. پێویستیت بەخۆ هەڵکێشان نییە.»

دەتوانی دەست بەنوێژ یا شیعر گوتن، یا هەر شتێکی تر بکەی. کە داوایان لێ کردی هەناسەیەکی درێژ بدەی هەناسەکە بدە. ئەو کاتە زۆر ڕێک دێیتە بەرچاو، منیش زۆر شانازیت پێوە دەکەم. هەرچۆنێ بێ من زۆر شانازیت پێوە دەکەم. پلەیەکی گەرمی گونجاوت هەیە. وەکو منداڵی ساوا دەستت لە بالیفەوە وەرنێ و خەوت لێ دەکەوێ.

وای دانێ کەوا منم لە باوەشت یان کچێکی ترە؟ کچێکی جوانی ئیتالّی؟»

– «ئەو کچە تۆ دەبی.»

– «هەڵبەت. دەبێ من بم. ئۆهـ، من تۆم خۆش دەوێ، (ڤالنتینی) قـاچەکەت چاک دەکاتەوە. زۆرم پێ خۆشە کە کاتی نەشتەرگەری لەوێ نیم.»

– «ئێشکگری ئەمشەو لە ئەستۆی تۆدا دەبێ؟»

– «بەڵێ، بەڵام بەلاتەوە گرینگ نابێت.»

– «چاوەڕێ بکە. بزانە چۆن دەبم.»

– «ئازیزم، ئێستا تۆ لە ناوەوە و دەرەوە پاک بوویتـەوە، پێم بڵێ لە ژیانتـا چەند کەست خۆش ویستووە.»

– «هیچ کەس.»

– «منیش؟!»

– «بەڵێ، تۆم خۆش ویستووە.»

– «بە ڕاستی چەندت خۆش ویستووە؟.»

– «هیچ کەسێ.»

– «چەندت خۆش ویستووە. چۆن ئەمەت دەردەبڕی؟ لەگەڵیان ماویەتەوە؟»

– «هیچ کەسێ.»

– «درۆم لەگەڵ دەکەی.»

– «بەڵێ.»

– «باشە. ڕاستیم لێ بشارەوە، منیش دەمەوێ درۆم لەگەڵ بکەی. ئایا جوان بوون؟.»

– «هەرگیز لەگەڵ هیچ کەسێ نەماومەتەوە.»

– «ڕاستە. دلڕفێن بوون؟.»

– «هیچ لەبارەی ئەوەوە نازانم.»

– «تۆ بۆ منی. ئەمە ڕاستە. تۆ بۆ کەسی تر نابی. باهیچیشم دەربارەی ئەوانەوە پێ نەڵێی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمەم بەلاوە گرینگ نییە. کەچی کە پیاو لەگەڵ کچێ دەمێنێتەوە کەی کچە داوای پارەی لێ دەکا.»

– «نازانم.»

– «هەڵبەت نازانی. ئایا کچە پێی دەڵێ ئەوی خۆش دەوێ؟ ئەوەم پێ بڵێ. دەمەوێ ئەوە بزانم.»

– «بەڵێ، گەر پیاوەکەش ئەوی بوێ.»





– «ئایا پیاوەکە دەڵێ کچەی خۆش دەوێ؟ تکایە ئەمە گرینگە پێم بڵێ.»

– «وا دەڵێ گەر بیەوێ.»

– «بەڵام تۆ هەرگیز وات نەگوتووە؟ ڕاست بڵێ؟»

– «نەخێر، وام نەگوتووە.»

– «بەڕاستتە، ئا دەی ڕاستیم پێ بڵێ.»

درۆم لەگەڵ کرد و گوتم: «نەخێر»

– «نایلێیت، دەزانم ناتوانی بیلێیت من تۆم خۆش دەوێ ئازیزم.»

لە دەرەوە ڕۆژ تەواوێ لەسەر بانەکان بەرز ببووەوە. توانیم نووکی کاتدرائییە ببینم کە تیشکی ڕۆژی بەردەکەوت لە دەرەوە و هەناوەوە زۆر خاوێن بووم. چاوەڕێی هاتنی دکتۆر بووم.» کاترین گوتی: «مەسەلەکە ئەوەیە کچە هەرچییەکی کوڕە بیەوێت دەبێ وا بیلێ و ئەنجامی بدا.»

– «نەک هەموو دەم.»

– «بەڵام من دەیکەم. من تەنیـا ئەوە دەڵێم، کـە تۆ داوام لێ دەکـەی بیـڵـێم. ئەو شتانە ئەنجام دەدەم کە خۆت ئارەزووتە. پاشان پێویستیت بەکچانی تر نابێ. دەبێ؟.»

زۆر بەدڵخۆشی سەیری کردم و بەردەوام بوو گوتی: «ئەوەی دەتەوێ ئەنجامی دەدەم و دەیلێم. بەم کارەش خۆم زۆر بەسەرکەوتوویەکی مەزن دەزانم، وایە؟.»

– «بەڵێ.»

– «حەز دەکەی چیت بۆ بکەم. ئێستا وا تۆ بۆ نەشتەرگەری ئامادەی.»

– «جارێکی تریش وەرەوە سەر نوێنەکەم.»

– «زۆر باشە، دێمەوە.» گوتم: «ئای گیـانەکەم، گیـانەکەم، گیـانەکەم.» گـوتی: «دەمبینی هەرچییەکی داوای دەکەی بەجێی دێنم.»

– «تۆ زۆر نازداری.»

– «دەترسم تا ئێستاش بەلاتەوە باش نەبم.»

– «تۆ زۆر نازداری.»

– «من هەر ئەوەندەم مەبەستە کە تۆ مەبەستتە. لێرە بەدواوە ئەوە نەما کە من من بم. لە ئارەزووت بەم لاوە هیچی تر نەماوە.»

– «گیانەکەم.»

– «بەدڵی تۆم، ئەی بەدڵی تۆ نیم؟ ئارەزووی هیچ کـچێکی تر ناکەی. ئارەزووی دەکەی؟.»

– «نەخێر.»

– «خۆ بینیت من باشم و ئەوەی دەتەوێ جێبەجێی دەکەم.»

## 17

پاش ئەوەی لە نەشتەرگەرییەکە بەخۆ هاتمەوە زانیم ماوم و نەمردووم. تۆ نامریت، تەنیا دەتخنکێنن. ئەمەش هەرگیز لە مردن ناچێ. تەنیا خنکاندنێکی کیمیاوییە، خۆ هەستیشی پێ ناکەیت پاش ئەوەی دێیتەوە سەرەخۆ. هەروەکو خۆت مەست کردبێ وایە، تەنیا ئەوە نەبێ کە دەڕشێیتەوە لە زەرداو بترازێ هیچی تر ناهێنیتەوە. پاشانیش هەست بەچاکتربوون ناکەی. توورەکە لمم لەپێلینگانی قەرەوێڵەکەمەوە بینی کە لەسەر ئەو بۆڕیبیانەی لە قاچی لە گەچ گیراوم بەسترابوون دانرابوون پاش ماوەیێ خانم (گاج)م بینی، گوتی: «ئێستاکە چۆکت چۆنە؟» گوتم: «چاکترە.»

- «کارێکی جوان و پوختەی بۆ کردی.»
- «چەندی خایاند؟.»
- «دوو سەعات و نیو.»
- «هیچ قسەی هەلەق و بەلەقم نەکرد؟.»
- «نەخێر، هیچت نەگوت. قسە مەکە. بێ دەنگ بە.»

لەسەر جێ کەوتبووم. کاترین ڕاستی دەگوت، هەرکێیەک ئێشککگر بوایە بۆ من هیچ جیاوازییەکی نەبوو. نەخۆشخانە سێ نەخۆشی تری تیابوو. یەکێکیان مێرمنداڵێکی لەرز و تاداری لاواز بوو، لەتیپی خاچی سوور بوو، خەڵکی جۆرجیا بوو. گەنجێکی جوانکیلەی باریکی تریش تووشی لەرزوتا و زەرتک بووبوو، خەڵکی نیۆیۆرک بوو. سێیەمیان گەنجێکی خورتی ژیکەلەی تر بوو هەوڵی دابوو سەری کۆمپارەیەک بکاتەوە، کە وزەیەکی تەقینەوەی بەرزی هەبوو، تا وەک یادگارێ هەڵیبگرێ. ئەم چەشنە کۆمپارەیە پێی دەوترا (شارپنەل). نەمساوییەکان لە ناوچەی چیاکاندا بەکاریان دەهێنا. کە سەرقەپاغێکیان هەبوو لە پاش هاوێشتندا بەپێی کەوتن دەتەقینەوە. سستەرەکان (کاترین)یان زۆر خۆش ویست، چونکە لە ئێشکگرتنی شەوانە باکی نەبوو. کاترین کەمێ ئیشی لەگەڵ لەرز و تادارەکان هەبوو. ئەو گەنجەی سەری کۆمپارەکەی شل کردبۆوە ببوو بەهاوڕێمان. بەشەو هەرگیز زەنگی لێ نەدەدا، مەگەر زۆر ناچار بوایە، بەڵام لەمابەینی کاتەکانی ئیشکردندا ئێمە پێکەوە دەبووین. کاترینم زۆر خۆش ویست. ئەویش منی خۆش ویست. بەڕۆژ لەکاتی بێداری وردە تێبینیمان بۆ یەکتری دەنووسی و بەڕۆژ بەخەبەر دەبووین و بە(فێرگسۆن) بۆ یەکترمان ڕەوانە دەکرد. (فێرگسۆن) کچێکی باش بوو هیچ شتێکم دەربارەی ئەوەوە نەزانی تەنیا ئەوەندە نەبێ کە برایەکی لەگەڵ تیپی پەنجاو دوو و یەکی تریشی لە (میزۆپوتامیا) کاریان دەکرد. لەگەڵ کاترین زۆر باش بوو.

جارێک لێم پرسی: «ئەرێ ڤێرگی، دێی بۆ ئاهەنگی زەماوەندمان؟.»





- «ئێوە هەرگیز یەکتری ناخوازن.»
- «یەکتری دەخوازین.»
- «نەخێر یەکتر ناخوازن.»
- «لەبەرچی یەکتری ناخوازین؟»
- «بەر لەوەی یەکتر بخوازن دەجەنگن.»
- «هەرگیز شەڕ ناکەین.»
- «هێشتا زۆرتان ماوە.»
- «هەرگیز شەڕ ناکەین.»
- «پاشان تۆ دەمری، یان شەڕکردن یان مردن. ئەوانەی وا دەکەن یەکتری ناخوازن.»

دەستی خۆم گەیاندە دەستی گوتی: «دەستم مەگرە. من ناگریم. لەوانەیە هەردووکتان ڕاست بن بەڵام ئاگاداربە ئەو نەخەیە ناو گیروگرفتەوە، گەر بیخەیتە ناو گیروگرفتەوە دەتکوژم.»

- «نایخەمە ناو گیروگرفتەوە.»
- «ئاگاداربە، هیوادارم، لە خۆشی دابن. ئەرێ کاتێکی خۆش بەسەر دەبەن؟.»
- «بەڵێ، کاتێکی خۆش بەسەر دەبەین.»
- «شەڕ مەکە، ئەویش مەخەرە ناو خەفەتەوە.»
- «نای خەمە ناو خەفەتەوە.»
- «ئاگاداربە. حەز ناکەم لەگەڵ منداڵانی شەڕدا بیبینم.»
- «تۆ کچێکی باشی، ڤێرگی.»
- «باش نیم. هەوڵ مەدە کوزکێشیم بۆ بکەی، قاچت چۆنە؟.»
- «زۆر باشە.»

پەنجەی گەیاندە سەرم و گوتی: «ئەی سەرت چۆنە؟»

- «هەرگیز ئازارم نادا.»
- «ئاوسانی وا پیاو شێت دەکا، تۆش دەڵێی هەرگیز ئازارم نادا؟.»
- «نەخێر.»
- «گەنجێکی بەبەختی. نامەکەت نووسیوە؟ وا دادەبەزم.»

گوتم: «ئەوەتە لێرەیە.»

- «زۆر هیلاکە. دەبێ داوای لێ بکەی بۆ ماوەیێ واز لە ئێشککگری بێنێ.»
- «زۆر باشە پێی دەڵێم.»
- «هەوڵم دا کارەکەی لەجیاتی ئەنجام بدەم، بەڵام ڕێگەی نەدام. سستەرەکانی

تریش لە خوایان دەوێ ئەو کار بکا. دەبێ ڕێگەی بدەی کەمێ بسێتەوە.»

– «زۆر باشە.»

– «خانم ڤان گوتی: «تۆ هەموو چێشتانان دەخەوی.»

– «وای گرتووە.»

– «وا چاکترە ئەمشەو بۆ ماوەیێ ڕێگەی بدەی کەمێ بسێتەوە.»

– «خۆشم. هەر ئەوەم لێی دەوێ.»

– «نەخێر، تۆ حەز ناکەی. بەڵام گەر ئەوەی بۆ بکەی منیش لە پاداشی ئەمەوە ڕێزت لێ دەگرم.»

– «وای لێ دەکەم پشوو بدات.»

– «باوەڕ ناکەم.»

نامەکەی هەڵگرت و چووە دەرەوە. منیش زەنگم لێدا پاش ماوەیێ خانم (گاج) هاتە ژوورەوە.

– «مەسەلە چییە؟»

– «دەمەوێ قسەیەکت لەگەڵ بکەم. تۆ لەو باوەڕەی کە دەبێ خانم بارکلی. بۆ ماوەیێ واز لە ئێشکگری بێنێ؟ چونکە ئەو لەوپەڕی ماندوویێتییە. لەبەرچی ئەو ماوەیەکی درێژ شەوانە دەمێنێتەوە؟»

خانم گاج سەیرێکی کردم و گوتی: «من هاوڕێی ئێوەم پێویست ناکا بەم شێوەیە قسەم لەگەڵ بکەی.»

– «مەبەستت چییە؟»

– «خۆت گێل مەکە. هەر ئەوەندەت دەویست؟.»

– «ڤێرمۆث دەخۆیتەوە؟.»

– «باشە، پاشان دەبێ بڕۆم.» ئەو بوتڵەکەی لە دۆڵابەکەدا دەرهێنا، پەرداخی هێنا.

– «تۆ بەپەرداخەکە بخۆرەوە منیش بەبوتڵەکەوە دەخۆمەوە.» خانم گاج گوتی: «پێکی تەندروستیت.»

– «توخوا (ڤان) لەبارەی خەوتنم تاچێشتانان چی گوت؟.»

– «قسەی قۆڕ لەسەر تۆ دەکا و دەڵێت تۆ نەخۆشێکی خاوەن نازیاری.»

– «با بۆ خۆی هەر وا بلێ.»

– «ئەو مرۆڤێکی هیچ و پووچ نییە، بەڵام ئافرەتێکی پیر و سەیرە. هەرگیز تۆی خۆش ناوێ.»

– «دەزانم.»





– «باشە، خۆ من خۆشم دەوێی. هاوڕێی تۆم ئەمە لەبیر مەکە.»

– «تۆ یەکجار دڵنەرم و چاکی.»

– «نەخێر، من دەزانم کێ بەدڵی تۆیە. بەڵام من هاوڕێتم. قاچت چۆنە؟.»

– «باشە.»

– «کەمێ ئاوی کاترای سارد دێنم تا بەسەر قاچتیدا بپرژێنم. ژێر ئەم گێچە خورشتی دەبێ. دەرەوە زۆر گەرمە.»

– «بەڕاستی تۆ زۆر دڵنەرمی.»

– «ئەرێ خورشتی زۆرە؟.»

– «نەخێر.»

خۆی داهێنایەوە و گوتی:

– «ئەم کیسە لمانە باشتر قایم دەکەم. من هاوڕێتم.»

– «دەزانم تۆ هاوڕێمی.»

– «نەخێر، نازانی، بەڵام ڕۆژێ دێ دەزانی.»

کاترین سێ شەو لە ئێشکگرتن حەسایەوە. پاشان دووبارە گەڕایەوە سەر ئێشکگرتن. هەر کە بەیەک گەیشتینەوە، هەریەک لە ئێمە وایزانی لەسەفەرێکی دوور دابووە.

## 18

ئەو هاوینمان بەخۆشی بەسەر برد، کاتێ توانای چوونە دەرەوەم بوو، بەسواری پەیتوون لەناو باخچەی گشتی شاردا دەسووڕاینەوە. لەبیرمە سواری پەیتوون بووم و ئەسپەکەش بەهێواشی دەڕۆیشت. عەرەبانچییەکە پشتی لە ئێمە بوو، کڵاوێکی بەرزی بریسکەداری لەسەر کردبوو. کاترینم لە تەنیشت بوو. تەنیا پێکەوتنی لایەکی دەستم بەلایەکی دەستی بەس بوو بۆ ئەوەی جۆشمان هەڵبستێ. پاشان کە توانیم بەدارشەق بەپێی خۆم بڕۆم بۆ شیو خواردن چووینە چێشتخانەی (بیڤی) یان (گران ئیتاڵیا) لە دەرەوە لەسەر مێزی سەر شۆستەکە دانیشتین خزمەتچییەکانیش دەچوونە ژوورەوە و دەهاتنە دەرەوە خەڵکیش بەنزیکمان دەهات و دەچوون، مۆمەکانیش سێبەریان دەڕژاندە سەر مێزەکان. پاش ئەوەی هاتینە سەر قەناعەت کە گران ئیتاڵیا باشترینیانە، جۆرجی سەرۆکی شاگردەکانمان ڕاسپارد کە جێگەیەکمان بۆ بگرێ. جۆرج شاگردێکی باش بوو لەو کاتەی سەیری خەڵکەکە و ناو گەلەرییەکەمان دەکرد لە تاریک و لێڵی ئێوارە و چاو چاوانێمان لەگەڵ یەکتری دەکرد داوامان لە جۆرج دەکرد کە شیومان بۆ بێنێ شەرابی کابری بەستووی ناو دەفرمان خواردەوە. هەرچەندە چەند چەشنە مەی ترمان

وەکو فریزا، باربیرا وە مەی شیرینی سپیمان تاقی کردەوە. لەبەر مەسەلەی شەڕ مەیگێڕیان نەبوو هەر جارێک داوای فریزام کردبایە جۆرج زەردەخەنەیەکی شەرماوی دای دەگرت. جۆرج گوتی: «چاک بزانە، ولاتێ ئەم جۆرە مەیە دروست دەکا کە تامی خۆی وەکو چیلەک بێ.»

کاترین گوتی: «بۆچی نەء؟ وا دیارە نایابە.»

جۆرج گوتی: «خانم گەر مەبەستتە تامی بکە، بەلام ڕێگەم بدە قاپێکی بچووک مارگاوس بۆ برای ئەفسەرم بێنم.»

– «منیش تاقی دەکەمەوە جۆرج.»

– «گەورەم ناتوانم داوای ئەوەت لێ بکەم، تامی چیلەکی هەر لێ نایێ.»

کاترین گوتی: «خۆ لەوانەیە. شتێکی چاکە گەر ئەو تامە بدا.»

– «دەیهێنم، کاتێ خانم دلّی لێ پڕبوو ئەوا لایدەبەم.» لەڕاستیدا هەر ناوی مەی بوو، هەروەکو جۆرج گوتی: «هەرگیز تامی چیلەکی لێ نەدەهات. گەڕاینەوە سەر کاپری، ئێوارەیێ پێویستم بەپارە بوو، جۆرج سەد لیرەی بەقەرز دامێ.

گوتی: «گەورەم، دەزانم گوزەران چۆنە، دەزانم پیاو چۆن پارەی لێ دەبڕێ، گەر تۆ وەیا خانم پارەتان پێویست بوو. من قەت پارەم لێ نابڕێ و بێ پارە نیمە.»

پاش نانخواردنی شێوان لە شۆستەکە پیاسەمان کرد، بەبەردەم چێشتخانە و دوکانەکاندا تێپەڕین قەپەنگەکانیان داخرابوون لە شوێنێکی بچووک کە سەندەویچیان تیا دەفرۆشت ڕاوەستاین، سەندەویچی گۆشتی بەراز و خاس و (ئەنشوفی)(١)

(١) ئەنشوفی: جۆرە ماسییەکە.

کە لە هەویری زۆر تەنکی مەیلەو قاوەیی دروست دەکرا، کە لە پەنجەیێ درێژتر نەدەبوون بەشەو کە برسیمان دەبوو ئەو سەندەویچانەمان دەخوارد. پاشان لەبەردەم کاتدرائیەکەوە لەسەر جادە سواری پەیتوونێکی سەر کراوە بووین بەرەو خەستەخانە کەوتینەڕێ. لە دەرگای نەخۆشخانەکەوە دەرگەوان هاتە دەرەوە تا یارمەتیم بدا بەدارشەقەکەوە خۆم ڕاگرم. پارەی پەیتوونەوانم دا.

بەبەرزکەرەوەکەوە سەرکەوتینە سەرەوە، لە نهۆمی دووەم کە سستەرەکانی تیا دەژیا کاترین دابەزی و منیش بۆ نهۆمی خۆم سەرکەوتم و بەدارشەقەکەوە دابەزیمە ناو هۆڵەکە بۆ ژوورەکەم ڕۆیشتم. هەندێ جار بەڕووتی درێژ دەبووم و هەندێ جاریش لەبانێژەکەوە دادەنیشتم، قاچیشم لەسەر کورسییەکی ترەوە دادەنا و تەماشای پەڕەسێلکەکانم دەکرد و چاوەڕوانی هاتنی کاترین دەبووم. کاتێ بەپێبلکە سەرکەوتبایە وا هەستت دەکرد لە گەشتێکی دوور و درێژ هاتۆتەوە. منیش بەیارمەتی دارشەقەکانم لەگەڵ ئەو بەناو هۆڵەکەدا دەڕۆیشتم قاچم بۆ هەڵدەگرت و لە دەرەوە دەوەستام و هەندێ جاریش لەگەلّی دەچوومە ژووری نەخۆشەکان، ئەمەش دەوەستایە سەر ئەو پەیوەندییەی لەنێوان ئێمە و





نەخۆشەکاندا هەبوو. پاش ئەوەی لەسەردانی نەخۆشەکان تەواو دەبووین لە دەرەوەی ژوورەکەم لە بانێژەکەدا دادەنیشتین، پاشان دەچوومە سەر جێگاکەم دوای ئەوەی هەموو نەخۆشەکان دەخەوتن و مسۆگەری دەکرد کە کەس داوای ناکا دەهاتەوە ژوورەکەم. حەزم دەکرد پرچی بکەمەوە و دایگرمە خوارەوە. ئەویش بێ جوولە لە تەنیشتم دادەنیشت. تەنیا لەو کاتەدا نەبێ دەکەوتە جوولەوە کە خۆی دادەهێنایەوە تاوەکو ماچم بکا. منیش خەریکی ئەوەبووم تۆقەکانی سەریم دەکردەوە لەسەر چەرچەفی جێگەکەمم دادەنا تاوەکو قژەکەی بەتەواوی بێتەوە دیقەتی خۆ لە گوورە نەبردنی ئەویشم دەکرد.

پاشان دوا دوو تۆقەیم لێ دەکردەوە پرچی بەتەواوی بەردەبۆوە، ئەویش بەهێواشی سەری خۆی نەوی دەکرد لەناو پرچەکەیدا دەشاردراینەوە و تیایدا بزر دەبووین وەکو لەناو ڕەشماڵێک بین یا کەوتبینە پشت تاڤگەیەکەوە. کاترین پرچێکی جوانی هەبوو هەندێ جار کە لەبەر تیشکی ئەو ڕووناکییەی لە دەرگاکراوەکەدا دەهاتە ژوورەوە پاڵدەکەوتم، پرچەکەی دەهۆنیەوە و دەیکردن بەکەزی. لە شەوانیشدا هەروەکو چۆن ئاو بەر لە گزنگدان دەدرەوشێتەوە ئاوا دەدرەوشایەوە. ڕوویێکی شیرین و لەشێکی خڕین و پیستێکی نەرم و بێگەرد و لووسی هەبوو. زۆرجار کە پێکەوە درێژ دەبووین سەرپەنجەم بەسەر و نێوچەوان و بن چاو و گەردنی دادەهێنا.

دەمگوت: «وەکو کلیلی پیانۆ نەرم و نۆلّ و بێگەردی.»

ئەویش پەنجەکانی دەگەیاندە چەناگەم و دەیگوت: «وەکو سمپارەیە، بۆ پیانۆ زۆر زۆر ڕەق و دڕە.»

– «توخوا ئەمە دڕە؟»

– «نەخێر، خۆشەویستم تەنیا گاڵتەت لەگەڵ دەکەم.» شەوەکان خۆش بوون.

ئەگەر دەستی یەکێکمان بەر ئەوی تر کەوتبایە زۆر دڵشاد دەبووین. سەرەڕای ئەوکاتە زۆرەش گەلێ ڕێگەی ترمان هەبوو تا خۆشەویستی خۆمان بۆ یەکتری پێ دەربڕین، کاتێ لە ژووری جیاواز دەبووین هەوڵمان دەدا بیری یەکتر بکەین. پێدەچوو لەم کارە سەرکەوتووبین، چونکە هەرچۆنێ بوایە بیرمان لە هەمان شت دەکردەوە.

بەیەکترمان دەگوت ئێمە هەر لەو ڕۆژەوە کە ئەو پێی ناوەتە نەخۆشخانەوە یەکترمان خواستووە. ئێستاش وا ئەو مانگانە دەژمێرین کە بەسەر زەماوەندمان تێپەڕبووە، من دەمویست ببێتە خوازبێنییەکی ڕەسمی و ڕاستەقینە بەلام کاترین گوتی گەر وا بکەین ئەوا کاترین لە نەخۆشخانە دووری دەخەنەوە ئەگەر هەر بەزاریش بێ ئەوە بکەین دەخرێینە ژێر چاودێرییەوە بەوەش ژیانمان لێ تاڵ دەکەن و لێکترمان دەکەن. دەبوایە ئێمە تەدارەکی خوازبێنیمان بەپێی یاسا سازدابایە، ئەمەش ڕۆتینێکی زۆر بێ مانایە. لەڕاستیدا من دەمویست یەکتر خوازتنمان شێوەیەکی ڕاستی وەرگرتبایە، چونکە ئەوەی لێی دەترسام و بیرم بۆی دەچوو ئەوەبوو کە منداڵمان بێ.

بەلام ئێمە خۆمان وا بۆ یەکتری نیشان دا کە هەموو شتێ تەواو بووە و بڕاوەتەوە،

بۆیە زۆر بیرمان لە خوازبێنی نەدەکردەوە و باکمان نەبوو، خۆشم لە ڕاستیدا بەیەکتر نەخواستنمان کەیفخۆش بووم. دێتەوە یادم کە شەوێ لەم بارەیەوە قسەمان کرد. کاترین گوتی:

– «بەڵام، خۆشەویستم، دوورم دەخەنەوە.»

– «لەوانەیە وا نەکەن.»

– «بۆ وەناکەن لە دەستیان دێ، ڕەوانەی وڵاتەکەم دەکەنەوە ئەو وەختەش تا کۆتایی شەڕ لەیەکتر دادەبڕێین.»

– «ئەوکات منیش مۆڵەت وەردەگرم و بەدوات دادێم.»

– «بەچەند ڕۆژێکی مۆڵەت ناتوانی بێیتە سکوتلەندە و بگەڕێیتەوەش، بەڵام سەرەڕای ئەمەش دڵم نایێ بەجێت بێڵم. بەڵام پێم ناڵێی گەر ئێستاش یەکتر بخوازین چی قازانج دەکەین؟ وا ئێمە یەکتریمان بەڕاستی خواستووە ناشتوانم و ناشکرێ زیاتر لە جارێ زیاتر خۆم بەمارەکردن بدەم.»

– «ئەوەی من مەبەستمە تەنیا لە بەرژەوەندی تۆیە.»

– «هیچ شتێ نییە ناوی من بێ. من تۆم. لە خۆتم جیا مەکەوە.»

– «من هەر لەو باوەڕەدا بوومە کە کچ بەهیوای شووکردنن.»

– «بەڵێ، ئەوان وان، بەڵام خۆشەویستم، من شووم بەتۆ کردووە. ئایا من ژنێکی باش نیم بۆ تۆ؟.»

– «تۆ ژنێکی دڵگری.»

– «خۆشەویستم، خۆ چاک دەزانم کە من جارێ لەمەوبەر چاوەڕێی مارە بڕین بووم.»

– «نامەوێ هیچ شتێکم لەم بارەوە گوێ لێ بێ.»

– «خۆ تۆ دەزانی. من لە تۆ بەولاوە هیچ کەسێکم خۆش ناوێ. نابێ ئەمەت لەبەر دڵ بێ. گەر یەکێکی تر منی خۆشویستبێ.»

– «نەخێر، ئەوەم لەبەر دڵ نییە.»

– «کەوابێ نابێ دەماری پیاوەتیت بەمرۆڤێکی مردوو بجوولێنی، لەو کاتەی کە لە هیچ شتێکت کەم نییە.»

– «نەخێر، لە هیچ شتێکم کەم نییە. بەڵام نامەوێ هیچ شتێکم دەربارەی دەزگیرانی پێشووت گوێ لێ بێ.»

– «ئەی خۆشەویستی هەژارم! من دەزانم تۆ لەگەڵ هەموو جۆرە کچێ ڕاتبواردووە کەچی ئەوەم لەلا گرنگ نییە.»

– «ئاخۆ ناتوانین بەڕێگایەکی تایبەتی زەماوەندمان بگێڕین؟ باشە ئەی گەر شتێکم بەسەر هات یان تۆ منداڵێکت بوو.»





– «لە ڕێگای کڵێسە و دەوڵەت بترازێ هیچ ڕێگایەکی تر نییە بۆ مارە بڕین کەوابێ ئێمە بەڕێگایەکی تایبەتی مارەکراوین تۆ دەبینی. خۆشەویستم، ئەوە هەموو شتێ دەگەیێنێ بۆ من، ئەگەر ئایینێکم هەبوایە بەڵام من فرم بەئایینەوە نییە.»

– «بەڵام تۆ وێنەی مەدالیای قەشە ئەنتۆنیۆت دا بەمن.»

– «ئەمە تەنیا بۆ چەپارە دان بوو، یەکێ ئەوەی دابوو بەمن.»

– «کەوابێ هیچ شتێ لەمەڕ خوازبێنیمان پەشۆکاوت ناکا.»

– «تەنیا گەر لێت دوورکەومەوە. تۆ ئایینمی، تۆ هەموو شتێکی.»

– «زۆر چاکە ئەو ڕۆژەی تۆ دایدەنێی من ئامادەم بتخوازم.»

– «بەم شێوەیە قسە مەکە وەک بڵێی دەتەوێ بمکەی بەئافرەتێکی داوێن پاک، خۆشەویستم من ئافرەتێکی زۆر داوێن پاکم نابێ شەرم لە هیچ بکەی، گەر تۆ کەیفخۆشی و شانازیم پێوە دەکەی ئایا تۆ بەختیار نی؟.»

– «بەمەرجێ تۆ لە پێناوی هیچ کەسێکی دی بەجێم نەهێڵی.»

– «نەخێر، خۆشەویستم، لە پێناوی هیچ کەسێکی تر بەجێت ناهێڵم. هەموو شتێکی دڵتەزێنم بۆ خۆمان داناوە، بەڵام لەمەڕ ئەم مەسەلەیە دڵت هیچ نەکا.»

– «دڵم هیچ ناکا، تۆم زۆر خۆش دەوێ، بەڵام هەرچەندە تۆ لە پێش من یەکێکی ترت خۆشویستووە.»

– «چی بەسەر هات؟.»

– «مرد»

– «ئەگەر نەمردبایە من بەتۆ شاد نەدەبووم، بەڵام لەگەڵ ئەوەش بێ وەفا نیم. خۆشەویستم، هەڵەی زۆرم هەیە، بەڵام زۆر دڵسۆزم گەر تۆ لە پێناوی من بسووتێی منیش دڵسۆزتر دەبم.»

– «بەم زووانە بۆ بەرەی جەنگ دەگەڕێمەوە.»

– «تا نەڕۆیتەوە بیری لێ مەکەوە، تۆ دەمبینی وا دڵشادم، ماوەیەکی دوور و درێژە خۆشیم نەبینیوە کاتێکی خۆش بەسەر دەبەین. کاتێ تۆم بینی خەریک بوو شێت بم، لەوانەیە شێت بووبم. بەڵام وا هەردووکمان دڵخۆشین، یەکتریمان خۆش دەوێ، دەبا هەر لەم خۆشییەدا بژین، ئایا تۆ دڵخۆش نیی؟ هیچ شتێکم کردووە بێ دڵی تۆ بێ؟ ئایا دەتوانم هەر ئێستا شتێ بکەم دڵخۆشت بکا؟ حەز دەکەی پرچم بەردەمەوە؟ حەز دەکەی دەست لەملانی بکەین؟»

– «بەڵێ، وەرە سەر قەرەوێڵەکە.»

– «زۆر باشە، بەڵام لە پێشا دەبێ سەرێ لە نەخۆشەکان بدەم.»

## 19

بەم شێوەیە هاوین بەسەرچوو. زۆر بەچاکی ڕۆژگارەکانیم نایەتەوە یاد، تەنیا ئەوەندە نەبێ کە ڕۆژەکانی گەرم بوون، چەند سەرکەوتنەکیش لە ڕۆژنامەکاندا باس کرابوون، تەندروستیم باش بوو قاچەکانیشم بەماوەیەکی کەم سارێژ بوونەوە. لەسەر دارشەقەکە ئەوەندە نەماوە تا توانیم فرێی بدەم و لەجیاتی ئەو بەگۆچان بڕۆم. پاشان لە نەخۆشخانەی (ماگییۆری) بۆ چەماندنەوەی چۆک دەستم بەچارەسەری میکانیکی کرد، بەدانانی لەنێو سندووقێکی ئاوێنەدار کە تیشکی بنەوشەیی بەهێزی تیابوو، هەروەها شێلان و گەرماوکردن. لە پاش نیوەڕۆیان دەچوومە نەخۆشخانەی ماگییۆری لە دوای ئەمە لەمەیخانە پشیەکم دەدا و پێکم هەڵدەقوڕاند و ڕۆژنامەم دەخوێندەوە. بەهیچ جۆرێ ئارەزووی سووڕانەوەی ناو شارم نەبوو، بەڵکو ویستم زوو بەزوو لە مەیخانەکەوە خۆم بگەیێنمەوە هەوارگەکەی خۆم لە نەخۆشخانە. ئەوەی من مەبەستم بوو دیتنی کاترین بوو، لەوێ بەدواوە خوا خوام بوو کاتەکە بچێتە سەر. زۆربەی بەیانیان تا درەنگی ڕۆژێ هەر دەخەوتم و لەدوای نیوەڕۆیانیش، جار ناجار دەچوومە دیار تەڕاتێن. لە پاشان بۆ چارەسەری میکانیکی...، هەندێ جاریش لەیانەی (ئەنگلۆ) ئەمریکی هەڵوێستەکم دەکرد و لەسەر کورسییەکی چەرمداری بەرپەنجەرەوە دادەنیشتم و گۆڤارم دەخوێندەوە.

پاش ئەوەی دارشەقم فڕێدا ڕێگەیان نەداین پێکەوە بچینە دەرەوە. چونکە بۆ ئەو سستەرە جوان نییە لەگەڵ نەخۆشێ بچێتە دەرەوە بۆ یارمەتیدانی بێ ئەوەی پێویستی بەیارمەتی بێ. بۆیە لە پاش نیوەڕۆیان زۆر پێکەوە نەبووین. هەرچەندە هەندێ جار گەر (فێرگسۆن)مان لەگەڵ هاتبایە دەمانتوانی پێکەوە بۆ شێوان چووباینە دەرەوە. خانم (ڤان کامپن) وای لێ هات بەدوو هاوڕێی گیانی بەگیانی یەکترمان دابنێ. چونکە کاترین زۆربەی زۆری کارەکانی لەجیاتی ئەو ئەنجام دەدا. لەو باوەڕەش دابوو کە کاترین لە بنەماڵەیەکی خانەدانە. هەر ئەمەش بوو وای لێ کرد سەرەنجام ببێتە لایەنگیری کاترین. خانم (ڤان کامپن) گرینگییەکی زۆری بەبنەماڵەوە دەدا. خۆشی لە بنەماڵەیەکی خانەدانەوە بوو. نەخۆشخانەش جمەی لە نەخۆشەکان دەهات. ئەمەش وای لێ کردبوو کە بەسەرقاڵی بمێنێتەوە. هاوینێکی گەرم بوو زۆر کەسم لە میلانۆ دەناسی. بەڵام بەپەرۆش بووم تا دەگەڕامەوە نەخۆشخانە. بەتایبەتی کە ئێوارە دادەهات. هەروا لە بەرەکانی جەنگدا هێزەکانی ئیتاڵیا لەناوچەی (کارسۆ) بەرەو پێشەوە دەچوو. دەستیان بەسەر ناوچەی (کۆک)ی بەرامبەر (پلاڤا)وە داگرت، خەریک بوون بانی (بانسیێترا)ش داگیر بکەن، بەرەی ڕۆژئاوا ئەم دەنگەی نەبوو. ئەمەش بەڵگەی ئەوەبوو کە شەڕ بەردەوام و درێژخایەن دەبێ. ئێمەش[١]

(١) مەبەست، لەوڵاتی هێنرییە. کە ئەمریکایە.





کەوتبووینە ناو شەڕ و، بەڵام لەو باوەڕە دابووم کە ماوەیساڵێکی ڕەبەقیان دەوێ تا بتوانن ژمارەیەکی زۆری لەشکر بۆ شەڕ مەشق بدەن. ساڵی داهاتوو ساڵێکی نالەبار دەبێ، خۆ لەوانەشە لەباربێت. ئیتاڵییەکان ژمارەیەکی زۆر سەربازیان فڕێدایە نێو جەنگەوە. لەمە تێنەگەیشتم چۆن ئەم بارە وا بەردەوام دەبێ. ئەگەر هات و بانی (بانسیێترا) و چیای (سان گابرێل)یشیان داگیرکرد، خۆ هێشتا کۆمەڵە چیایێ، لەدواوە لەژێر چنگی نەمساوییەکاندا دەمێنێ. ئەم چیایانەم بینیوە. هەموو چیا گەردەنکەشەکان کەوتبوونە دواوە. لەلای (کارسۆ)وەش سوپا بەرەو پێشەوە دەچوو. بەڵام لەلای خوارەوە، لە دەوروبەری دەریاوە، زەلکاوی و زەنگاوی بوون. ناپلیۆن نەمساوییەکانی لە دەشتەکاندا دارکاری کرد، هەرگیز لە ناوچەی چیاییدا شەڕی لەگەڵ نەمساوییەکاندا نەکرد. ڕێگەی دان بەدوای بێنە خوارەوە و لە (ڤیرونا) دەست و بازووی خۆی لێ هەڵکردن و دارکاری کردن. تا ئێستا لە ناوچەکانی ڕۆژئاوایی بەرەی جەنگ کەس کەسی دارکاری نەکردووە. لەوانەش بوو هیچ سەرکەوتنێکی تر بەدەست نێت. خۆ لەوانەش بوو شەڕ هەتا هەتایە بەردەوام بێت. خۆ دەشبوو ئەم شەڕەش شەڕێکی تری سەد ساڵی[١] بوایە.

ڕۆژنامەکەم لەسەر ڕەفەکە دانایەوە، یانەکەم بەجێهێشت. زۆر بەوریایی لە پایەکان هاتمە خوارەوە. چوومە سەر شەقامی (ڤیامانزۆن) لەبەردەم ئوتێلی (گران هوتێل) لەگەڵ پیرە (میارز) پێکگەیشتین. خێزانەکەشی لەگەڵابوو. لە پەیتوون دادەبەزین. لە تەڕاتێنی ئەسپ دەگەڕانەوە هاوسەرەکەی ئافرەتێکی سینگ پان بوو جلێکی (سەتانی) ڕەشی پۆشیبوو. خۆشی پیرێکی کورتەباڵا و سمێڵ سپی بوو. پانەوپان. بەگۆپاڵ دەڕۆیی هاوسەرەکەی تۆقەی لەگەڵ کردم؛ گوتی: «چۆنی؟ چۆن؟»

میارزیش گوتی: «ڕۆژ باش.»

- «تەڕاتێنەکان چۆن بوون؟.»
- «باش بوو. دڵگربوو. سێ گرەوم بردەوە.»
- «باشە، ئەی تۆ چیت بەچی کرد؟.»
- «باش بوو، بەشی من گرەوێ بوو.»

پاشان هاوسەرەکەی گوتی: «نازانم ئەو چۆن بووە هەرگیز قسەم بۆ ناکا.»

میارز پڕ بەدڵ گوتی: «زۆر چاکم، بەڵام پێویستە تۆ لە نەخۆشخانە دەربچی.» کە قسەی لەگەڵت دەکرد، وا دەهاتە بەرچاو، کە میارز سەیری تۆ ناکا وەیا تۆ بەکەسێکی تر تێدەگا.

گوتم: «دەردەچم.»

(١) شەڕی سەد ساڵی: شەڕێکی درێژخایەن بووە لە نێوان فەرەنسا و بەریتانیا ڕووی داوە. نزیکەی (١٠٠) ساڵی خایاندووە.

خاتوو میارز گوتی: «لە نەخۆشخانە سەرێکت لێ دەدەم. هەندێ شت بۆ کوڕەکانم دێنم. ئێوە هەمووتان ڕۆڵەی منن، هەمووتان جەرگی منن.»

– «ئەوانیش بەدیتنت دڵخۆش دەبن.»

– «ئەوان ڕۆڵەی ئازیزی منن، تۆش یەکێکی لە کوڕەکانم.»

– گوتم: «دەبێ بگەڕێمەوە نەخۆشخانە.»

– «سڵاوم بەڕۆڵەکانم بگەێنە، دەبێ زۆر شتتان بۆ بێنم، هەندێ (مارسیلیا) و کێکی نایابم بۆ داناون.»

– «خواحافیز بەدیتنت دڵشاد دەبین.»

گوتی: «خواحافیز. وەرە (گالیریا)، خوانی من پێدەزانی، ئێمە هەموو پاش نیوەڕۆیێ لەوێ دادەنیشین.»

هاتمە سەر ڕێگاکە، ویستم هەندێ شت لە کۆڤا بکڕم تا بۆ کاترینی ببەم. لە ژوورەوەی کۆڤادا قوتوویێ چوکلاتم کڕی، لەو کاتەی کچەکە خەریکی پێچانی قوتووەکە بوو بەرەو لای مەیخانە کشام. دوو بەریتانی و چەند فڕۆکەوانێ لەوێ بوون، تەنیا پێکی (مارتینی)م خواردەوە، پارەکەیم دا، چوکلاتەکەم لەسەر کاونتەر هەڵگرت و ڕێگەی خۆم گرتە بەر، بەرەو ژوورەکەی نەخۆشخانە ڕۆیشتم. لە دەرەوەی مەیخانۆکەیەکی سەر شەقامەکەوە، لە سەرووی (سکالاوە) هەندێ کەس دانیشتبوون. ناسیانم یەکێکیان جێگری شابەندەربوو، دووی تر هونەرمەند بوون دەرسی هونەری گۆرانی گوتنیان دەخوێند و (ئیتۆر مۆرتی)یان لەگەڵابوو. کابرایەکی ئیتاڵی بوو لە (سان فرانسیسکۆ) دادەنیشت و لە سوپای ئیتاڵی بوو. لەگەڵیانم خواردەوە یەکێ لە گۆرانیبێژەکان ناوی (ڕالف سیمۆنز) بوو، نازناوی هونەری (ئێرنیکۆ دیل کریدوی) بۆ خۆی هەڵبژاردبوو، نەم دەزانی کە خۆشی دەیگوت یان نەء. بەڵام بەسۆزێکی وا بەجۆشەوە گۆرانی دەگوت، دەتگوت ئێستا نا ئێستا شتێکی گرینگ ڕوودەدات. سیمۆنز کابرایەکی قەڵەو بوو، وا پێدەچوو دەم و لووتی نەخۆشی تاپەلەی گرتبێ لە (بانێسترا) لە گۆرانی گوتن گەڕابووەوە گۆرانی (تۆسکای) گوتبوو، لە گوتنیدا زۆر سەرکەوتووانە بووبوو. گوتی: «هەڵبەت، گوێت لێ نەبووە گۆرانی بڵێم؟»

– «کەی لێرە گۆرانی دەڵێی؟»

– «پایزێ، لە سکالا شتێ پێشکەش دەکەم.»

ئیتۆر گوتی: «گرەو دەکەم ئەسکەملت تێدەگرن. بۆیان نەگێڕایەوە لە (مۆدینا) چۆن ئەسکەملیان تێ گرتبوو؟.»

– «ئەمە بوختانە.»

ئیتۆر گوتی: «ئەسکەملیان تێگرت. خۆم لەوێ بووم. من بەدەستی خۆم شەشم تێگرتووە.»





– «تۆ ئیتاڵییەکی فرسکویی. ئیتاڵییەکی باش نییە. ڕووی لە هەر کوێ بکا ئەسکەملیی تێدەگرن.»

چاوەشەکەی تر گوتی: «پیاسێنزا پیسترین جێگا باکووری ئیتاڵیایە. بڕوام پێ بکە. جێگایەکی بچووکی پیسە بۆ گۆرانی گوتن ناشێ.» ئەم گۆرانیبێژە ناوی (ئیگار ساوندر) بوو بەنازناوی هونەری (ئیدواردۆ گیوڤانی) گۆرانی دەگوت.

ئیتۆر گوتی: «خوا وا بکا لەوێ بم، تا بەچاوی خۆم بیبینم چۆن ئەسکەملت تێدەگرن. ناتوانی بەئیتاڵی گۆرانی بڵێیی.»

ئیدگار ساوندەر گوتی: «گەلحۆیە، هەر ئەوەندە دەزانێ. بڵێ ئەسکەملم تێدەگرن.»

ئیتۆر گوتی: «کە هەردووکتان پێکەوە گۆرانی دەڵێن، هەر ئەوەندەتان پێدەکرێ. پاشان کە گەڕانەوە ئەمریکا دەبێ سەرکەوتنەکانتانیان لە (سکالا) بۆ بگێڕنەوە. ڕێگەتان نادەن گۆرانی یەکەمتان تەواو بکەن.» سیمۆنز گوتی: «لە تشرینی یەکەم، لە سکالا گۆرانی (تۆسکا) دەڵێم.»

ئیتۆر بەجێگری باڵیۆزی گوت:

– «ئێمە دەچین، وانییە؟ پێویستیان بەهەندێ کەسە پارێزگاریان بکەن.»

جێگری باڵیۆز گوتی:

– «لەوانەیە سوپای ئەمریکی لەوێ بێ تا پارێزگاریان بکەن. چی تر دەخۆیەوە، سیمۆنز؟ ساوندەر، دەخۆیتەوە؟.»

ساوندروز گوتی: «بۆ ناخۆمەوە.»

ئیتۆر پێی گوتم: «بیستوومە مەدالیای زیوی وەردەگری. جا بۆ خۆت چ ڕێزێکت دەبێ؟»

– «نەمزانیوە، نەمزانیوە مەدالیا وەردەگرم.»

– «مەدالیا بۆ خۆت وەردەگری گەنجۆ. جا کچانی کوڤا لەو باوەڕەدا دەبن کە تۆ پیاوێکی کۆکی. لەو باوەڕەدا دەبن کە تۆ دوو سەت نەمساویت کوشتووە، سەنگەرێکت بەتەواوی داگیرکردووە. باوەڕ بکە دەبێ منیش بۆ مەدالیاکانم هەوڵ بدەم.»

جێگری باڵیۆز لێی پرسی: «ئیتۆر ئەی تۆ چەند مەدالیات وەرگرتووە. ئەو ئەو کوڕەیە کە ئەوان ئەم شەڕە لە پێناوی ئەودا دەگێڕن.»

ئیتۆر گوتی: «دوو مەدالیای بڕۆنزی و سێ زیویم وەرگرتووە. بەڵام تەنیا کاغەزی یەکێکیانم بەدەست گەیشتووە.» سیمۆنز پرسی: «ئەی ئەوانی تر چیان بەسەر هاتووە؟» ئیتۆر گوتی: «ئیشەکە سەرکەوتوو نەبوو. هەر کاتێ ئیشەکە سەرکەوتوو نەبێ مەدالیاکان دەگێڕنەوە.»

– «چەند جار بریندار بووی، ئیتۆر؟»

– «سێ جار بەسەختی. ئەوەتا سێ مۆری برینداریم پێوەیە دەبینی؟.»

باسکی خۆی هەڵکرد هەر سێ مۆرەکە لەگەڵ هێڵە زیوەکانی سەر بەرگە ڕەشەکەی تەریب بوون ک بەنزیکی هەشت گرێ لە خوار شانییەوە بوو. ئیتۆر پێی گوتم: «تۆش یەکێکت پێوەیە. بڕوام پێ بکە گەر سێ مۆرت پێوە بێ مانای وایە شتێکت دەستکەوتووە. تۆ تەنیا یەک مۆرت پێوەیە، یەک جار برینداربووی، بەسایەی ئەوەوە سێ مانگ لە نەخۆشخانە لێت پاڵدایەوە.»

جێگری باڵیۆز پرسی: «ئیتۆر کێندەرت بریندار بووە؟.»

ئیتۆر باسکی خۆی هەڵکرد. قەتماغەیەکی سۆری لەسەر قۆڵی نیشان دا. گوتی: «ئێرەم، قاچیشم لێرەوە، ناتوانم ئەوەی قاچمت نیشان بدەم چونکە بەلەک پێچم لێ پێچاوە. هەروەها ئێسکێکی مردووی بۆگەنیش لە پێم دایە. هەموو بەیانییەک پرووسکی بچووکی لێ دەردێنم و بەردەوام بۆنی بۆگەنە.»

سیمۆنز: «بەچی بریندار بووی؟.»

– «بەنارنجۆکی دەستی. یەکێک لە پەتاتە وردوخاشکەرەکان بەشێکی تەواوی لە قاچم پەڕاند.» ڕووی خۆی لەمن کرد «خۆ دەزانیت ئەو پەتاتە وردوخاشکەرانە چین؟.»

– «بەڵێ، دەزانم.»

ئیتۆر گوتی: «کوڕی ئەو سۆزانیانەم بینی کە تێی دەگرتین، بەئەرزی دادام. وام زانی مردووم و یەکسەر گیانم دەرچووە. بەڵام ئەم پەتاتە وردوخاشکەرە نەفرەت لێکراوە هیچی تیا نەبوو، منیش کوڕی دەڵەسەگم دایە بەر ئاگری تفەنگەکەم. قەت بێ تفەنگ نیم. تفەنگ لەگەڵ خۆم هەر هەڵدەگرم تا نەزانن ئەفسەرم.»

سیمۆنز پرسی: «باشە ئەو چی بەسەر هات؟.»

– «ئەو تەنیا ئەو نارنجۆکەی هەبوو، بەڵام نازانم بۆچی هاویشتی؟ لەو باوەڕەم کە مەڕەقی بووە نارنجۆکێ بهاوێ. لەوانەیە هیچ شەڕێکی ڕاستەقینەی نەدیتبێ، منیش نەمکردە نامەردی زۆر بەچاکی دەمودەست ئاگربارانم کرد.»

سیمۆنز: «کە ئاگر بارانت کرد چی بەسەرهات؟»

ئیتۆر گوتی: «خۆزیا چاوی دەرهاتبێ و ملی شکابێ. جا من چزوانم. هەر ئەوەندە دەزانم گوللەکانم ئاراستەی زگی کرد. نەوێرام نیشانە لەسەری بگرم چونکە لەوە دەترسام نیشانەکە نەپێکێنم.»

– «ئیتۆر چەند دەبێ بووی بەئەفسەر؟»

– «دوو ساڵە. دەبم بەکاپتن. تۆ چەند ساڵە لیونانتی؟»

– «بۆ سێ ساڵ دەچێ.»

– «تۆ نابی بەکاپتن، چونکە ئیتاڵی بەچاکی نازانی. دەزانی قسە بکەی بەڵام ناتوانی بەچاکی بخوێنیتەوە و بنووسی. دەبێ ڕۆشنبیرییەکی چاکت هەبێ تاکو ببی





بەکاپتن. بۆچی نەچوویتە ڕیزی سوپای ئەمریکی؟»

– «لەوانەیە بچم.»

– «ئەی خوایە چەند بەپەرۆشی ئەوەم، لاوۆ، مانگانەی کاپتن چەندە، ماک؟»

– «بەتەواوی نازانم. بەڵام لەو باوەڕەم دەگاتە نزیکەی دووسەد و پەنجا دۆلارێ.»

– «ئەی مەسیح چ لەو دووسەد و پەنجا دۆلارە بکەم! واچاکە زۆر بەپەلە خۆت بگەیەنیتە سوپای ئەمریکی، فرێد، بزانە ناتوانی کارێکی وا بکەی منیش ببەیتە ڕیزی ئەوانەوە.»

– «زۆر چاکە.»

– «من دەتوانم بەئیتاڵی فەرمان بەکۆمەڵێ بکەم. دەتوانم ئەوەش بەئاسانی بەئینگلیزی فێربم.»

سیمۆنز گوتی: «دەشبیت بەجەنەراڵ.»

– «نەخێر، چونکە بای بوون بەجەنەراڵ نازانم، جەنەراڵ دەبێ زۆر شت بزانێ. ئێوە سەیرن وا دەزانن شەڕ گاڵتەیە. ئێوە بای ئەوەندەش هۆشتان نییە بکرێن بە باشچاوشی پلەی دوو.»

سیمۆنز گوتی: «سوپاس بۆ خوا نەبووم بەکاپتن.»

– «دەشێ ڕۆژێ بێ پێویستت پێی بێ، گەر ئێوەی تەوەزەلیان هەموو ڕاپێچدا. گوە! گەنجینە چەند حەز دەکەم هەردووکتان لە پەلی من بووانە. هەروەها تۆش (ماک). دەزانی دەمکردی بەهاوەڵی خۆم (ماک).»

ماک گوتی: «تۆ مرۆڤێکی مەزنی، ئیتۆر، بەڵام لەوە دەترسم تۆ گیانێکی سەربازیت تیابێ.»

– «بەر لەوەی شەڕ کۆتایی بێ دەبم بەکۆلۆنێل.»

– «گەر نەتکوژن.»

– «نامکوژن.»

ئەو پەنجەی دۆشاومژەی بەسەر ئەستێرەکانی سەر یەخەی خۆی داهێنا؛ گوتی:

«دەبینی چی دەکەم؟ کاتێ یەکێ لە گۆڕەپانی جەنگدا ناوی کوژران بێنێت دەست لە ئەستێرەکانی سەر شانمان دەدەین.»

ساوندەرز هەستایە سەرپێ و گوتی: «با بڕۆین سیم.»

– «باشە.»

گوتم: «خوا حافیز. منیش دەبێ بڕۆم.»

بەگوێرەی کاتژمێری مەیخانەکە شەشی چارەگێ کەم بوو.

– «چاوو– ئیتۆر.»

ئیتۆر: «چاو، فرێد. دڵخۆشم بەوەی مەدالیای زیوی وەردەگری.»

– «جا نازانم وەردەگرم یان نا.»

– «بێ گومان وەردەگری، فرێد، گوێم لێ بووە وەریدەگری.»

– گوتم: «باشە، خواحافیز. ئیتۆر خۆت لە گێچەڵ بپارێزە.»

– «خەمی منت نەبێ. من ناخۆمەوە. وەک سەگی پێ خواسیش ناسوورێمەوە و ئارەقخۆر نیم و مێبازیش نیم. خۆم دەزانم چی بۆ من باشە.»

گوتم: «خوا حافیز، پێ خۆشحاڵم بەوەی دەبی بەکاپتن.»

– «چاوەڕێی ئەم پایە پێدانە نیم. مافی خۆمە لە پاداشتی ئەم شەڕە ببم بەکاپتن. تۆ دەزانی سێ ئەستێرە و دوو شیری تێک پەڕیوو و تاجێکیشی لەسەربێ، ئەوە منم.»

– «بەخت یارت بێ.»

– «بەخت یارت بێ. کەی بۆ بەرەی جەنگ دەگەڕێیتەوە؟»

– «بەم زووانە.»

– «باشە لەوێ دەتبینم.»

– «خواحافیز.»

– «خواحافیز. خۆت لە خراپە بپارێزە.»

چوومە سەر ئەو شەقامەی پشتەوە، کە بەقەدبڕی بۆ نەخۆشخانە دەچێ. ئیتۆر بیست و سێ ساڵان ببوو. لە سان فرانسیسکۆ لەلای مامێکییەوە گەورە ببوو. کاتێ بڕیاری شەڕدرا بەسەردان هاتبووە لای دایک و باوکی کە لە (تۆرینۆ) بوون. خوشکێکی هەبوو لەگەڵ ئەو ڕەوانەی ئەمریکا کرابوو تا لەگەڵ مامی بژی. لەوانەیە ئەمساڵ خوێندن تەواو بکات. ئەو لەو پاڵەوانانە بوو کە خولق و خووی خۆش نەبوو. هەر کەسێک بیدیبایە لێی بێزار دەبوو (کاترین)یش لە وزەی دانەبوو هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکا.

کاترین گوتی: «ئێمەش پاڵەوانی وامان هەیە، بەڵام ئەوان زۆر هێمنترن ئازیزم.»

– «من گوێی پێ نادەم.»

– «خۆ منیش ئەوەندە گوێم پێی نەدەدا، گەر ئەوەندە لە خۆی بایی نەبووایە و منی بێزار نەکردبایە، نەکردبایە، بێزار نەکردبایە.»

– «خۆ منیش بێزار دەکا.»

– «ئەوەشت لە دڵنەرمی خۆتە بۆم، ئازیزم، بەڵام تۆ پێویستیت بەوە نییە. خۆ تۆ دەزانی.»

– «لە بەرەی جەنگدا حاڵی چ حاڵە. هەرچەندە بەکەلکیش دێ. بەڵام ئەو لەو گەنجانەیە کە ڕقم لێیانە.»

– «دەزانم.»





– «زۆر چاکە، کە ئەمە دەزانی. هەوڵ دەدەم خۆشم بووێ. بەڵام ڕەزای گرانە. بەڕاستی کوڕێکی ڕەزا گرانە.»

– «ئەم ئێوارەیە گوتی، دەبێتە کاپتن.»

کاترین گوتی: «پێ خۆشحاڵم. هەڵبەت ئەوە کەیفخۆشی دەکا.»

– «حەز دەکەی منیش پایەیەکی بڵندترم هەبێ؟.»

– «نەخێر، تەنیا ئەو پایەیەم لە تۆ دەوێ کە بتوانین بچینە باشترین چێشتخانە.»

– «ئەوە ئەو پایەیە کە ئێستا هەمە.»

– «پایەکی مەزنت هەیە، نامەوێ هیچ پایەیی تر وەربگری، ڕەنگە پایەیی بەرزتر هەوات بەرزتر بکا. ئازیزم، چەند کەیفخۆشم بەوەی کە لە خۆبایی نی، خۆ ئەگەر لە خۆش بایی بی هەر شووم پێ دەکردی. بەڵام ئەوەی ئارامی دەخاتە دڵی ئافرەتەوە ئەوەیە کە پیاوەکەی لەخۆبایی نەبێ.»

زۆر بەنەرمی و لەسەرخۆ لە باڵکۆنەکەدا قسەمان دەکرد، دەبوایە مانگەشەو بوایە. بەڵام تەم و مژ شاری داپۆشیبوو، لەبەر ئەوە مانگ هەڵنەهات. پاش ماوەیێ دایگرتە نمەی باران و هاتینە ژوورەوە لە پاشا بوو بەرێژنە. گوێمان لە ترپەی باران بوو کە بەسەر بانەکە دەکەوت، هەستامە سەرپێ، لە دەرگاوە ڕاوەستام تا بزانم داخوا باران دێتە ژوورەوە یان نا. نەدەهاتە ژوورەوە بۆیە دەرگاکەم لەسەر گازی پشت بەجێ هێشت.

کاترین: «کێی ترت بینی؟»

– «میارز و خێزانەکەی.»

– «ئەوانە زۆر سەیرن.»

– «ئەگەر لە وڵاتی خۆی بوایە دەبوایە لە بەندیخانە بوایە. بەڵام بەرەڵایان کردووە تا بمرێ.»

– «لەوکاتەوە زۆر بەختیارانە لە میلانۆوە دەژی.»

– «نازانم، تا چ ڕادەیێ دڵخۆشە.»

– «وابزانم، لەوکاتەوە کە لە بەندیخانەوە پێی هاتۆتە دەر لە ڕادە بەدەر دڵخۆشە.»

– «خاتوو میارز هەندێ شت بۆ ئێرە دێنێ.»

– «شتی چاک دێنێ. ئایا تۆ کوڕی ئازیزی. ئەوی؟»

– «یەکێکم لە کوڕەکانی.»

– «ئێوە هەمووتان کوڕی ئەون، کوڕی خۆشەویستی ئەون. گوێ لە شووڕەی باران بگرە.»

– «بارانێکی بەگوڕە.»

– «تۆ هەردەم منت خۆش دەوێ. وا نییە؟»

– «بەڵێ.»

– «ئایا باران بێ و نەبێ جیاوازە؟»

– «نەخێر.»

– «ئەمە شتێکی باشە. چونکە لە باران دەترسم.»

– «لەبەرچی؟»

خەو چاوی گرتبووم، لە دەرەوەش باران بەتوند دەباری. «ئازیزم، نازانم بۆچی هەردەم لەباران ترساوم.»

– «دەنا من حەز لە باران دەکەم.»

– «حەز دەکەم لەژێر باران گەشت بکەم. بەڵام باران لەگەڵ خۆشەویستی زۆر بێ بەزەییبیە.»

– «من هەر تۆم دەوێ.»

– «من تۆم لە بەفر و باران و تەزرەدا خۆش دەوێ.»

– «چی تریش؟»

– «نازانم هەست دەکەم خەوم دێ.»

– «برۆ بخەوە، هەرچۆنێ بێ تۆم خۆش دەوێ.»

– «ئایا تۆ بەڕاستی لە باران دەترسی؟»

– «نەخێر، گەر لەگەڵ تۆ بم.»

– «بۆچی لێی دەترسی؟»

– «نازانم.»

– «پێم بڵێ.»

– «زۆریم لێ مەکە.»

– «دەبێ پێم بڵێی.»

– «نەخێر پێت ناڵێم.»

– «پێم بڵێ.»

– «باشە پێت دەڵێم. لە باران بۆیە دەترسم، چونکە زۆرجار مەرگی خۆمی تیا دەبینم.»

– «نەخێر، لەبەر ئەمە نییە.»

– «هەندێ جار مەرگی تۆشی تیا دەبینم.»

– «ئەمەیان پێ دەچێ.»





– «نەخێر، خۆشەویستم، ئەمەیان وانییە، چونکە دەتوانم بەسەلامەتی بتپارێزم، دەزانم ئەو توانایەم هەیە بتپارێزم، بەڵام هیچ کەسێ ناتوانێ خۆی بپارێزێت.»

– «تکایە با بەس بێ. نامەوێ ئەمشەو لێم ببیتە سکوتلەندی و خۆت شێت و وێت بکەی. زۆرمان پێکەوە نەماوە.»

– «نەخێر من سکوتلەندیم و شێتم. بەڵام بێدەنگ دەبم، ئەمانە هەمووی قسەی حەلەق و بەلەقن.»

– «هەمووی بێ مانایە. لە بێ مانایی بەولاوە هیچی تر نین. من لە باران ناترسم. لە باران ناترسم. ئۆ، ئۆ خوایە حەز دەکەم لێی نەترسم.»

کاترین دەستی بەگریان کرد. ئارامم کردەوە، لەگریان وەستا بەڵام لە دەرەوە باران هەر دەباری.

## 20

پاش نیوەڕۆیەک من و کاترین چووین بۆ تەڕاتێنی ئەسپ. فێرگسۆنیش هات هەروەها (کرۆل رۆجەر)یش، ئەو گەنجەی کە بەتەقینەوەی سەری کومپارە چاوی بریندار بووبوو. پاش نانی نیوەڕۆ کچەکان خۆیان ڕێکپۆش کرد تا بۆ تەڕاتێن بەرێ کەوین. من و کرۆل لە ژوورەکەی کرۆل لە سەر قەرویڵەکەی دانیشتبووین، ئەنجامی پێشووی تەڕاتێن و پێشبینی تەڕاتێنمان لە ڕۆژنامەدا خوێندەوە. کرۆل سەری بەستراببووەوە، بۆیە تەڕاتێنەکەی ئەوەندە لا گرینگ نەبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەش لە ڕۆژنامەی تەڕاتێندا بەبەردەوامی دەنگوباسی تەڕاتێنی دەخوێندەوە. هەروا پێبەپێ ئاگاداری هەموو ئەسپێ بوو. مەبەستی لەمەش ڕزگاربوون بوو لە بێ ئیشی. گوتی: «ئەسپەکان ئەوەندە باش نین بەڵام چار ناچار هەر ئەو ئەسپانە هەن کە گرەویان پێ بکەین. پیرەمیارزی کرۆلی زۆر خۆش دەویست بۆیە هەندێ زانیاری تایبەتی و بەسوودی دایە کرۆل. میارز لە زۆربەی تەڕاتێنەکاندا دەیبردەوە. بەڵام حەزی نەدەکرد. هیچ زانیارییێ بدا بەکەس چونکە نرخەکەی دادەشکاند. تەڕاتێنەکە زۆر قەڵەبالغ بوو. ئەو پیاوانەی لە هەموو سووچێکی دونیادا لە تەڕاتێن دەرکرابوون. ڕێیان پێ درابوو لە ئیتالیا بەشداری بکەن. زانیاری میارز زۆر بەسوود بوو، بەڵام حەزم نەدەکرد لێی بپرسم چونکە هەندێ جار وەڵامی نەدەدایەوە. دەتتوانی هەست بەوە بکەی کە پرسیارەکەت ئازاری دەدا، وای هەستدەکرد کە زۆری لێ کراوە لەبەر چەند هۆیێ پێمان بڵێ. بەڵام بۆ کرۆل ئەوەندە پێ سەرگران نەدەبوو. چاوەکانی کرۆل ئازاریان پێ گەیشتبوو. چاوێکی زۆر خراپ ئازاری پێ گەیبی بوو، (میارز)یش چاوەکانی ناتەواو بوون. جا بۆیە کرۆلی خۆش دەویست. میارز هەرگیز بەخێزانەکەی نەدەگوت کە گرەو لەسەر کام ئەسپ دەکا. لەگەڵ ئەوەش خێزانەکەی دۆڕاندن و بردنەوەی هەبوو، زۆربەی جار بەشی دۆڕاندن بوو. زمانیشی لە

قسە نەدەکەوت. ئێمە هەر چوارمان بەپەیتوونێکی سەرکراوە بەرەو (سان سیرۆ) کەوتینە ڕێ. ڕۆژێکی خۆش بوو. بەباخچەیەکدا تێپەڕین شان بەشانی هێڵی ترام ڕۆیشتین، لە شار چووینە دەرەوە، ڕێگاکانی دەرەوەی شار تۆزاوی بوون، ساختمانی پەرژین ئاسن و باخچەی فراوان و جۆگەلەی تیابوو ئاویان پیادا دەڕۆیی لەگەڵ چەند باخچەی سەوزی شینایی کە گەڵاکانیان تۆزاوی بوون. دەمانتوانی لە دەشتەکەوە تەماشای ئەو بەری بکەین کە کێڵگەی سەوز و پڕ بەروبوومەکان و دێراو و چیاکانی ڕووەو باکوریش ببینین. گەلێ پەیتوونی تر لەسەر ڕێگاکەوە بوون کە بەرەو گۆڕەپانی تەڕاتێنەوە دەڕۆیشتن.

پیاوانی بەر دەرگا ڕێگەی ئێمەیان دا بێ پلیت بچینە ژوورەوە چونکە جلی سەربازیمان پۆشیبوو.

پەیتوونەکەمان بەجێهێشت. پرۆگرامی تەڕاتێنمان کڕی بەنێو فرینرێکی ئەستووری لووس ڕۆیشتین بەلای گۆڕەپانەکەوە چووینە لای (پادۆک)ەکەوە. سەکۆکان کۆن بوون لە دار دروست کرابوون. (کوشک)ەکانی گرەوکردن لەژێر سەکۆکان هەڵکەوتبوون و بریتی بوون لە ڕیزێک لە نزیکی تەویلەکان. کۆمەڵێ سەربازیش بەدەوری پەرژینی باخچەی ناوەوە داندرابوون. (پادۆک)ەکە پڕی خەڵک بوو، ئەسپەکان لە دەوری گۆڕەپانێکی ئەڵقەیی لەژێر دارەکانی پشت سەکۆکەوە دەسوورانەوە. هەندێ ناسیاومان بینی دوو کورسیمان بۆ فێرگسۆن و کاترین هێنا و سەیری ئەسپەکانمان کرد. ئەسپەکان یەک لەدوای یەک، سووڕانەوە و سەریان شۆڕکردبوونەوە، مەیتەرەکان تێیان دەخوڕین. ئەسپێ ڕەنگەکەی ئەرخەوانییەکی ڕەش بوو، کرۆل سوێندی خوارد کە ئەم ئەسپە بۆیە کراوە.

تەماشامان کرد، پێی دەچوو وابێ. ئەم ئەسپە تاوێ پێش لێدانی زەنگی سواربوون هاتەدەر کاتێ لە پرۆگرامی تەڕاتێندا، بەدوای نمرەی ئەسپەکە گەڕاین، پشتمان بەنمرەی سەر قۆڵی مەیتەرەکە بەست، بۆمان دەرکەوت ئەسپەکە ناوی (چاپالاک)ە. ئەم تەڕاتێنە بۆ ئەو ئەسپانە بوو کە هەرگیز گرەوی هەزار لیر یا زیاتریان نەبردبۆوە. کاترین لەو باوەڕە بوو کە ڕەنگی ئەسپەکە گۆڕاوە فێرگسۆنیش گوتی ئەو ناتوانێ قسەی لێ بکا. منیش لێی کەوتبوومە گومانەوە. هەمووومان ڕێکەوتین گرەوی لەسەر بکەین. بەسەد لیر گرەومان لەسەر کرد. لە پرۆگرامی بەرنامەی گرەودا وا جاڕدرابوو، لەکاتی بردنەوە. هەر لیرێ سیی و پێنج لیر دەباتەوە. کرۆل چوو پلیتی کڕی، ئێمەش سەیری سوارەکانمان دەکرد، لە جارێ زیاتر سووڕانەوە. پاشان لەژێر دارەکانەوە بۆ گۆڕەپانێ چوون، ئینجا بەتاودان بۆ شوێنی یاری دەست پێکردنەوە دەرپەڕین.

لەسەر سەکۆکەوە وەستاین تا سەیری تەڕاتێنەکە بکەین. لە (سان سیرۆ) بەربەستی نەرمیان نەبوو. بۆیە ئەو هێڵانەی کە ئەسپەکان لە نزیکەوە دەستیان بەغارێن کرد، زۆر بچووک دیاربوون. پاشان ڕێگەی دەرچوونیان پێدرا. بەلێدانی قامچییەکی درێژەوە





دەستی پێکرد. بەلامـاندا تێپەڕین، ئەسپی ڕەش بەماوەیەکی باش لە بەرایی هەموویانەوە بوو، لە گەڕانەوەش بەدوورییەکی زۆر لە پێش ئەوانی تری کردبۆوە لە بەرەکەی ترەوە لە دوورەوە بەدووربین تاقیبی ئەسپەکانم کرد. سوارەکەیم بینی، خەریک بوو تاوی ئەسپەکەی کەم دەکردەوە، بەڵام نەیتوانی کەم کاتەوە تا لە پێچەکە سووڕانەوە ئەسپی ڕەش بەپازدە مەوداوە لە بەرایی ئەوانی ترەوە بوو، کاتێ لە سووڕانی دیاریکراوی خۆشی تەواو بوو لە دەوری پێچەکە لە سووڕانەوە هەر بەردەوام بوو. کاترین گوتی:

– «ئەی ئەمە باش نەبوو؟ سێ هەزار لیر دەبەیتەوە، دەبێ ئەسپێکی چاک بێ.»

کرۆل گوتی: «بەحەزرەتی ئەوەم ڕەنگەکەی نەچێتەوە بەر لەوەی پارەکە وەرگرین.»

کاترین گوتی: «بەڕاستی ئەسپێکی دڵگرە، دەبێ میارز بەناوی خۆی گرەوی لەسەر نەکردبێ؟»

بەدەنگێکی بەرز بەمیارزم گوت: «ئەرێ گرەوت بردەوە؟» ئەویش سەری خۆی لەقاند.

خاتوو میارز گوتی: «من نەم بردەوە، ڕۆڵەکانم لەسەر کام ئەسپ گرەوتان کرد؟»

– «چاپالاک.»

– «بەڕاستتە؟ ئەو یەک بە(٣٥)ە.»

– «ڕەنگەکەیمان کەوتە بەردڵ.»

– «حەزم نەکرد گرەو بەو بکەم. لەو باوەڕەدا بووم کە نەخۆش بێ و هیچ تێنی تیا نەبێ.» پێیان گوتم: گرەو لەسەر ئەو نەکەم.»

میارز گوتی: «قازانجی زۆر نییە.»

گوتم: «لە پرۆگرامدا هەر لیرێ (٣٥) لیری بۆ داندراوە.»

میارز: «دەسکەوتەکەی ئەوەندە نییە لە دوا دوایی یارییەکەدا بەپارەیەکی زۆر گرەویان لەسەر کردووە.»

– «کێ کردوویەتی؟»

– «کامپتۆن و منداڵەکانی. دوو لیریش نادەن بۆ لیرێ.»

کاترین گوتی: «کەوابێ سێ هەزار لیرمان دەستکەوت نابێ. حەز لەیاری وا بەفڕ و فێڵ ناکەم.»

– «دوو سەد لیرمان دەستکەوت دەبێ.»

– «ناکاتە هیچ. ئەم پارەیە هیچمان بۆ ناکا. وام زانی سێ هەزار لیر وەردەگرین.»

فێرگسۆن گوتی: «ئەمە فڕوفێڵێکی چەپەڵە.»

– «هەڵبەت وایە. گەر بمانزانیایە ئەم فڕوفێڵەی تیایە هەرگیز گرەومان بەوە نەدەکرد.

من چاوم لە سێ هەزار لیرەکە بوو.»

کرۆل گوتی: «بابڕۆینە خوارەوە شتێ بخۆینەوە. تابزانین بۆ هەر لیرێ چەند دەدەن.»

لەسەکۆکەوە دابەزینە خوارەوە. چووینە ئەو جێگەیەی نمرەکانیان لێ چەقاندبوو، زەنگی پارەدان لێدرا. نمرەی ١٨،٥٠ لە دوایی چاپالاک داندرابوو، ئەمەش مانای ئەوەبوو کە هەر لیرێ دوو لیری کەمتر بەردەکەوێ. چووینە مەیخانەی ژێر سەکۆکەوە وێسکی و سۆدەمان خواردەوە، چووینە لای دوو ئیتالّی ناسیاو (ماک ئادەمز)ی جێگری بالّیۆز. کاتێ گەڕاینەوە لای کچەکان وەگەلّمان کەوتن ئیتالّییەکان ڕەوشت بەرزبوون.

(ماک ئادەمز) قسەی لەگەلّ کاترین کرد، لەو کاتەی چووینە خوارەوە تا بۆ جارێکی تر گرەو بکەینەوە. میارز لە نزیک کوشکی گرەوەوە ڕاوەستابوو. بەکرۆلم گوت: «لێی بپرسە داخوا بەکام ئەسپ گرەو دەکا؟»

میارز پرۆگرامی دەرهێنا، بەقەلّەم ژمارە پێنجی دەستنیشان کرد.

– «ڕێگەی ئێمەش دەدەی گرەوی لەسەر بکەین؟»

– «خێراکە، خێراکە، بەلاّم بەخێزانەکەم نەلّێی من ڕێگەم داوی.»

لێم پرسی: «دەخۆیتەوە؟»

– «نەخێر، سوپاس. هەرگیز ناخۆمەوە.»

بەهیوای بردنەوە سەد لیرمان لەسەر ئەسپەکە دانا، سەد لیری ترمان بەشوێن دا. دوایی پێکێکی تر کۆکتێلی ویسکی و سۆدەمان خواردەوە. هەستم بەخۆشییەکی زۆر کرد. لەگەلّ دوو ئیتالّی لێک ڕاست هاتین، سەرو پێکیان لەگەلّ ئێمە خواردەوە، دوایی گەڕاینەوە لای کچەکان. ئەم دوو ئیتالّییەش زۆر ڕەوشت بەرز بوون، لە باشی لە دووی پێشوو تێیان پەڕاندبوو. پاش ماوەیەکی کەم، کەس نەیتوانی دابنیشێ منیش پلیتەکەم دایە دەست کاترین.

– «ئەمە چ ئەسپێکە؟»

– «نازانم، میارز هەلّی بژاردووە.»

– «هەتا ناویشی نازانی.»

– «نەخێر، دەتوانی لە پرۆگرامەکەدا ناوی بدۆزیتەوە، وا بزانم ئەسپی نمرە پێنجە.»

کاترین گوتی: «تۆ بڕوات پێی هەیە؟»

ئەسپی نمرە پێنج گرەوی بردەوە. بەلاّم شتێکی وایان نەدا. میارز تووڕە بوو.

– «دەبێ دووسەد لیر بدەی تا بیست لیر قازانج بکەی. دوازدە لیر بۆ دە لیر. ئەوە ئەوەندە ناهێنێ. خێزانەکەشم لەم لاوە بیست لیری دۆڕاندووە.»

کاترین پێی گوتم: «لەگەلّت دێمە خوارەوە.» ئیتالّییەکان هەستانە سەرپێ لە





سەکۆکە دابەزین. لە پادۆکەکە دوورکەوتینەوە.

کاترین لێی پرسیم: «ئەمەت بەدلّە؟»

– «بەلّێ.»

کاترین: «دەزانم زۆر باشە و بەدلّتە. بەلاّم ئازیزم، من ناتوانم ڕووبەڕووی ئەو هەموو خەلّکە ببمەوە.»

– «ئێمە ئەوەندە خەلّکە نابینین.»

– «نەخێر، بەلاّم میارز و خێزانەکەی و ئەو پیاوەی بانق لەگەلّ خێزانەکەیی و کچەکەی...»

گوتم: «ئەو هەموو جار حەوالّەکەم خورد دەکاتەوە.»

– «بەلّێ، بەلاّم گەر ئەویش نەیکا، ئەوا فەرمانبەرێکی تر دەتوانێ ئەوە بکا. سەرەڕای ئەمانەش ئەو چوار گەنجەی دوایی مرۆڤی هیچ بوون.»

– «دەتوانین لێرە بمێنین و لە پەرژینەکەوە سەیری تەڕاتێنەکە بکەین.»

– «ئەوەم بەدلّە، ئازیزم، دەبا بە ئەسپێ گرەو بکەین کە هەرگیز گوێمان لەناوی نەبووبێ. ئەسپێ بێ کە میارز گرەوی لەسەر نەکردبێ.»

– «زۆر باشە.»

گرەومان لەسەر ئەسپێ کرد ناوی (لایت فۆڕمی) بوو لە نێو پێنج ئەسپاندا چوارەم بوو. خۆمان بەپەرژینەکەوە دابوو. سەیری ئەسپەکانمان کرد، بەنزیکمانەوە ڕەت دەبوون، تەقە تەقی سمەکانیان کە تێپەڕ دەبوون درینگەی دەهات، چیایە دوورەکانمان لێ دیاربوو، (میلانۆ)ش لە دواوەی درەخت و کێلّگەکانەوە بوو.

کاترین: «ئێستا وا هەست دەکەم کە بەکەیفترم.»

ئەسپەکان لە دەرگاکەوە بەلەشی تەڕ و ئارەقەوە گەڕانەوە سوارەکانیان هێوریان دەکردنەوە. بۆ ژێر دارەکانەوە تێیان خوڕین.

– «حەز لە خواردنەوە دەکەی؟ دەتوانین لێرە بخۆینەوە و سەیری ئەسپەکان بکەین.»

گوتم: «باشە، دەچم دوو پێک دێنم.»

کاترین گوتی: «شاگردەکە دەیان هێنێ.»

دەستی خۆی بەرزکردەوە. شاگردەکە لە مەیخانەی پادۆکای تەنیشت تەویلەکەوە هاتە دەرەوە. لەسەر مێزێکی خڕی ئاسن دانیشتین.

– «توخوا کاتێ بەتەنیاین زیاتر زەوق و جۆش لە خواردنەوە وەرناگری؟»

گوتم: «بەلّێ.»

– «هەستم بەتەنیاییەکی لە ڕادەبەدەر دەکرد کە ئەوان هەموویان لەوێ بوون.»

– «وابزانم ئێرە جێگایەکی باشە.»

– «بەڵێ، بەڕاستی تەراتێنێکی خۆشە.»

– «زۆر خۆشە.»

– «ڕێگەم مەدە لە زەوقت بکەم. ئازیزم هەر کاتێ ویستت دەگەڕێینەوە.»

گوتم: «نەخێر، لێرە دەمێنین و بۆ خۆمان دەخۆینەوە، دوایی دادەکشێینەوە خوارەوە تا لای قەڵبەزەکان دەچین. تا غارغارێنی سەر بەربەستان ببینین.»

کاترین گوتی: «تۆ زۆر باشی بۆ من.»

– «پاش ئەوەی تاوێ بەتەنیایی ماینەوە، حەزمان کرد بگەڕێینەوە لای هاوڕێکانمان کاتێکی خۆشمان بەسەربرد.»

## 21

لە ئەیلولدا شەوانی فێنکی داهاتن. پاشان ڕۆژەکانیشی فێنک بوون پەلکی دارەکانی باخچەی گشتی ڕەنگیان گۆڕا و زانیمان هاوین بەسەرچوو. شەڕ لەبەرەی جەنگ بەرەو دژواری چوو. نەیان توانی (سان گبریل) داگیر بکەن. شەڕی دەستبەسەرداگرتنی بانی (بانسێنزا) بەسەرچوو و هەر لە ناوەڕاستی ئەم مانگەشدا بوو شەڕی دەستبەسەرداگرتنی (سان گبریل) ئاشبەتاڵی لێ کرا. نەیانتوانی داگیری بکەن. ئیتۆر گەڕایەوە بەرەی جەنگ ئەسپەکانیشی گەڕانەوە ڕۆما و تەڕاتێن نەما. (کرویل)یش گەڕایەوە ڕۆما تا لەوێوە ڕەوانەی ئەمریکا بکرێتەوە، لە شاریش خۆپیشاندان دژی بەردەوامبوونی شەڕ دووجار تەقیەوە. مەترسیترین خۆپیشاندان لە (تیورین)بوو؛ مێجەرێکی ئینگلیزی پێی گوتم ئیتاڵییەکان سەد و پەنجا هەزار سەربازیان لە دەشتی (بانسێنزا) و (سان گبریل) لەدەست داوە، سەرەڕای ئەوەش چل هەزاری تریشیان لە دەوروبەری (کارسۆ) لێ کوژراوە. بەیەکەوە خواردمانەوە، ئەو قسەی کرد. شەڕ ئەمساڵ لێرە تەواو بوو، هەروا گوتی ئیتاڵییەکان قەمپارێکی لەوە گەورەتریان لێداوە کە پێیان بجوورێ. هەروا گوتی: هێرشی (فلاندەر)یش بەرەو سەرکوتکردن و شکستییە، ئەگەر بەقەد ئەوەندەی تر سەربازیان بکوژرێ کە لەم پایزە لێیان کوژراوە ئەوا ساڵێکی تر نابا هاوپەیمانەکان دەڕووخێن. گوتی ئێمە هەموومان ڕووخاوین بەڵام بەوە باشە هەرچەند وا بمێنێ بەسەر خۆمان ناهێنین. هەموویان ڕووخاون.

گرینگ ئەوەیە ئەو ڕاستییە دەرنەخەین. ئەو وڵاتەی دوایی هەموو وڵاتێ هەست بەو ڕووخانە دەکا، شەڕ دەباتەوە. پێکی ترمان تێ هەڵکرد ئاخۆ ئەبێ من لەگەڵ سەرکردایەتی شەڕ ببووم؟ نەخێر، ئەو لەگەڵ سەرکردایەتی شەڕ بوو، ئەمەش هەمووی فشقیاتە. ئێمە بەتەنیا لەیانەکە لەسەر قەنەفەیەکی چەرمینی گەورە دانیشتبووین پۆتینە سەربازییەکەی پیستەیەکی ڕەنگ تێر و لووس و بۆیەکراو بوو. پۆتینەکانی زۆر جوان بوون. گوتی ئەمە هەمووی فشقیاتە. تەنیا بیریان لە تیپەکان و دابەشکردنی





هێزی مرۆیی دەکردەوە. هەموویان لەسەر تیپەکان شەڕیان کرد و ئەگەر چیان بە چ کردبا ئەوا هەموویان دەکوشتن. هەموویان ڕووخابوون، ئەڵمانییەکان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، بەخوا سەربازبوون نەک گەمە. پیرە (هۆن) سەرباز بوو. بەڵام ئەوانیش هەر ڕووخابوون. لە بارەی ڕوسیاوە پرسیارم لێ کرد. گوتی؛ ئەوانیش ماوەیەک بوو ڕووخابوون. ڕەنگە لەو ماوەیەدا ڕووخانیان بەدەرکەوێ.

نەمساوییەکانیش ڕووخاون ئەگەر هیمدادی تیپەکانی (هۆن)یان بگاتێ لەوانەیە ڕزگاریان ببێ. ئایا ئەو لەو باوەڕەیە کە ئەڵمانیا و هاوپەیمانەکانی بتوانن ئەم پایزە هێرش بەرن؟ هەڵبەت دەتوانن ئیتاڵییەکان ورەیان بەرداوە، هەموو کەسێ دەزانێ ورەیان بەردابوو. پیرە (هۆن) لە (ترنیتۆ)وە دادەبەزن و هێڵی ئاسنی لەسەر (ڤێسێنزا) دەبڕن، ئەوکات جا ئیتاڵییەکان قوڕی کوێ دەکەن بەسەر خۆیان، سەر بۆ کوێ هەڵدەگرن؟ گوتم، لە ساڵی ١٩١٦ ئەمەیان تاقی کردۆتەوە. نەک لەگەڵ ئەڵمانییەکان گوتم، بەڵێ. گوتی، بەڵام ئەو قەت لەو باوەڕەدا نییە کە وایان کردبێ ئەمە زۆر ئاسانە. ئەوان شتی گران و ئاڵۆز تاقی دەکەنەوە لە دواییدا چاک دەڕووخێن. گوتم دەبێ بڕۆم. دەبێ بگەڕێمەوە نەخۆشخانە گوتی (خواحافیز) پاشان بەشادمانییەوە گوتی: «بەخت یارت بێ.» جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ڕەشبینییە جیهانییەکەی و بەزەوقییە کەسایەتییەکەیدا هەبوو.

لەسەرتاشخانەیێ وەستام. ڕیشی خۆم تراشی و گەڕامەوە نەخۆشخانە. قاچم گەلێ باش ببوو. سێ ڕۆژ لەمەوبەر تێم ڕوانیبوو. بەر لەوەی نەخۆشخانەی ماگێوری بەجێبێڵم پێویستی بەچارەسەری هەر مابوو. لەسەر شۆستەکەدا هەوڵم دا بەڕێکی نەک بەشەلە شەل بڕۆم. پیاوێکی پیرم دی لەژێر تاقێکەوە ساوێنەی دروست دەکرد. هەڵوێستێکم کرد تا سەیری بکەم. دوو کچ خۆیان وەستابوون، ئەویش ساوێنەکەی پێکەوەیی بۆ هەردووکیان دەکێشا. بەپەلە ساوێنەکەی دەگرت و سەیری وانی دەکرد. سەری لەلایێ بوو کچەکان حریتە حریتیان گرتبوو، بەر لەوەی ساوێنەکانی لەسەر کاغەزی سپی قایم بکا و بیداتەوە دەست کچەکان، نیشانی دام و گوتی: «زۆر جوانن، تۆ دەڵێی چی. گەر ڕەسمێکت بۆ بگرم، تێنیتا؟» کچەکان ڕۆیشتنە ڕێی خۆیان، سەیری وێنەکەیان دەکرد و پێدەکەنین زۆر جوان بوون، یەکێکیان لەمەیخانەکەی بەرامبەر نەخۆشخانە کاری دەکرد.

گوتم: «زۆر باشە.»

– «شەپقەکەت لەسەر بکەرەوە.»

– «نەخێر، با لەسەرم بێ، وێنەکەم پێی بکێشە.»

گوتی: « بەوە جوان دەرناچێ، بەمە بەسەربازان دەچی.» ڕووی گەش بووەوە. وێنەکەی لەسەر کاغەزێکی ڕەش هەڵبڕی، پاشان دوو چینی ئەستووری لێک جیاکردەوە. وێنە تەنیشتییەکەی لەسەر مقەبایێ گیرکرد و دایە دەستم.

– «دەستحەقت چەند دەکا؟.»

دەستی خۆی هەژاند و گوتی: «ناوی پارە مەهێنە، بۆ تۆم دروست کردووە.» هەندێ کۆپەرم دەرهێنا گوتم: «تکایە وەرگرە، هەر بۆ هەوەس وەریبگرە!»

– «نەخێر، ئەوەم بەهەوەس بۆ تۆ کردووە تا بیدەیتە دەزگیرانەکەت.

– «زۆر سوپاس خواحافیز»

هاتمەوە نەخۆشخانە، هەندێ نامە لەوێ هەبوون، یەکێکیان ڕەسمی بوو، هەندێکی تریش بوون، سێ هەفتەی تر مۆڵەتی بووژانەوەم بۆ درێژ کرابووەوە، بەڵام پاش تەواو بوونی مۆڵەتم دەبوا بگەڕێمەوە بەرەی جەنگ. زۆر بەوردی خوێندمەوە. باشە ئەمەیان ئەوەبوو. مۆڵەتی بووژانەوەم لە چواری ئۆکتۆبەردا دەستی پێکرد لەو ڕۆژەی پێداویستی چارەسەرکردنم تەواو بوو. سێ هەفتە دەکاتە بیست و یەک ڕۆژ. مانای وایە مۆڵەتەکەم لە بیست و پێنجی مانگدا تەوا دەبێ. پێم ڕاگەیاندن بۆ نانی شێوان لێرە نابم. چوومە چێشتخانەیێ کەمێ لەسەرەوەی شەقامەکەی نزیک نەخۆشخانەوە بوو. نامەکانم لەوێ خوێندەوە، یەکیان لە باپیرمەوە بوو، دەنگوباسی ماڵەوە و هاندانی بیری نیشتمانپەروەری هەڵگرتبوو چەکێکی دووسەد دۆلاری و هەندێ پارچە ڕۆژنامەی تیابوو. هەروەها نامەیەکی سارد و سڕم لە قەشەی هاوڕێی تیپەکەمەوە بۆ هاتبوو، یەکێ تریشم لە برادەرێکی فڕۆکەوان لە سوپای فەرەنسییەوە بۆ هاتبوو کە باسی کاروباری ئەو تیپەی دەکرد کە خۆی یەکێکە لە ئەندامەکانی، نامەیەکی تریشم لە ڕینالدییەوە بۆ هاتبوو. لێمی پرسی بوو ئاخۆ تا چەند مانگی تر خۆم لە میلانۆ مات دەکەم، پرسیبووی دەنگوباس چ باسە؟ داوای لێ کردبووم کە قەوانی فۆگرافی بۆ بێنم. لیستەیەکی لەگەڵ ڕەوانە کردبوو. قاپێکی بچووکی (شانتی)م لەگەڵ نانخواردن خواردەوە لە دوابەدوای ئەمەوە پێکێ (کۆنیاک)م خواردەوە لە خوێندنەوەی ڕۆژنامە بوومەوە، نامەکانم خستە گیرفانمەوە، ڕۆژنامەکە و چێشتانەم لەسەر مێزەکە بەجێهێشت، لە ژوورەکەی خۆم، بێجامە و ڕۆبم لەبەرکرد، پەردەی ئەو دەرگایەم دادایەوە کە بەسەر باڵەکۆنیدا دەڕوانی، لەناو جێگەی خۆم لێ دانیشتم و ڕۆژنامەی (بۆستن)م لەناو ئەو قۆمەتەی دەرێنا کە خاتوو میارز لە نەخۆشخانە بۆ کوڕەکانی بەجێهێشتبوو. لەو هەواڵانە (شیکاگۆ وایت سۆکس) ئاڵای کۆمەڵەی ئەمریکای بەدەست هێنا... (نیویورک جەنتس) سەرکردایەتی کۆمەڵەی نیشتمانی دەکا (بایب ڕۆث) یاری بۆ (بۆستن) دەکا. هەواڵەکانی ڕۆژنامەکان زۆر بێزارکەر بوون، هەواڵەکان ناوخۆیی و کۆن بوون و هەندێ کۆنە هەواڵی شەڕی تیابوو. هەواڵەکانی ئەمریکاش تەنیا دەربارەی ئۆردووگاکانی مەشق پێکردن بوون. دڵخۆش بووم بەوەی لە ئۆردووگایێکی مەشق پێکردن نەبووم. دەنگوباسی یاری بێیبول تاقە هەواڵێ بوو کە مەیلی خوێندنەوەیم کرد، لەگەڵ ئەوەش ئەم هەواڵانە هیچ خۆشییەکیان نەخستە دڵمەوە. خوێندنەوەی ئەم هەموو ڕۆژنامانە بەوردی پیاوی خۆی دەویست، چونکە





ڕۆژنامەکان هی ئەوە نەبوون کاتیان پێ بکوژی، بەڵام چاوێکم هەر پێداگرتن. لە خۆمم پرسی ئاخۆ ئەمریکا چووەتە ناو شەڕەوە، ئاخۆ دەبێ یەکێتییە وەرزشییەکان دابخەن؟ لەوانەیە وا نەکەن. تەڕاتێن لە (میلانۆ) هەر لەسەر بەزمی خۆی بوو، شەڕیش گەیشتۆتە ڕادەیێ کە چاوەڕوانی خراپتری لێ نەدەکرا. تەڕاتێن لە فەرەنسا کە (چاپالاک)ی لێوە هاتبوو وەستێنرا. کاترین تا سەعات نۆ بێ ئیش بوو، کە نۆرەی داهات و ئەرکی وەرگرت گوێم لە خشەی پێی بوو، جارێک بینیم بەهۆڵەکەدا تێپەڕی سەری لە چەند ژوورێ دا، لەدواییدا هاتە ژوورەکەم.

گوتی: «ئازیزم، دواکەوتم. ئیش زۆربوو ئەتۆ چۆنی؟» باسی نامەکان و مۆڵەتی نەخۆشیم بۆ کرد.

گوتی: «شتی چاکە، ئەو ماوەیە لە کوێ بەسەردەبەی؟.»

– «لەهیچ شوێنێ. لێرە دەمێنم.»

– «کارێکی بێ عەقلانەیە. شوێنێ هەڵبژێرە. منیش لەگەڵت دێم.»

– «چۆن دەتوانی لەگەڵم بێی؟»

– «نازانم، بەڵام ڕێگایێ دەدۆزمەوە.»

– «تۆ زۆر جوان و دڵگری.»

– «نەخێر، وا نیم، بەڵام کە هیچت نەبێ لەدەستی بدەی ژیان ناخۆش نییە.»

– «مەبەستت چییە.»

– «هیچ نییە تەنیا بیر لەو تەنگوچەڵەمە بچووکانە دەکەمەوە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان وا گەورە دەهاتە بەرچاو.»

– «وا تێبگەم زۆر زەحمەتە ئەم کارە ئەنجام بدەی.»

– «نەخێر، زەحمەت نییە. ئازیزم، گەر پێویست بێ بەئاسانی ئیشەکە بەجێ دێڵم. بەڵام مەسەلەکە ناگاتە ئەو ڕادەیە.»

– «چ شوێنێ بەباشی دەزانی ڕووی تێ بکەین.»

– «بەلامەوە گرینگ نییە. هەر جێگەیێ بتەوێ، هەر شوێنێ خەڵکی تیا نەناسین.»

– «هەر شوێنێ بێ بەلاتەوە گرینگ نییە؟»

– «نەخێر، هەر شوێنێ بێ، بەدڵم دەبێ.» ئەمەی گوت و شێوا و پەشۆکا.

– «چ خێرتە، کاترین؟.»

– «هیچ، هیچم نییە.»

– «بەڵێ، شتێکتە.»

– «نەخێر، هیچم نییە. بەڕاستی هیچ نییە.»

– «دەزانم شتێکتە. ئازیزم پێم بڵێ، دەتوانی پێم بڵێی.»

- «هیچ نییە.»
- «پێم بڵێ.»
- «پێت ناڵێم، دەترسم بێ کەیف و نیگەرانت بکا.»
- «نەخێر، نیگەرانم ناکا.»
- «سووری لەسەر ئەمە؟ من نیگەران ناکا، بەڵام لەوە دەترسم نیگەرانت بکا.»
- «منیش نیگەران ناکا، گەر تۆ نیگەران نەکا.»
- «نامەوێ پێتی بڵێم.»
- «پێم بڵێ.»
- «هەر دەبێ بیڵێم.»
- «بەڵێ.»
- «ئازیزم، منداڵم دەبێ. زگم سێ مـــانگانە. نیگەران نەبووی. نیگەران بووی؟! تکایە نیگەران مەبە. نابێ نیگەران بی.»
- «زۆر باشە.»
- «بەڕاستتە.»
- «هەمـوو شتێکم کردووە، هەمـوو داودەرمانێکم تاقی کردۆتەوە، بەڵام هەمـووی بێ داد بووە.»
- «نیگەران نیم.»
- «نەمتوانی خۆمی لێ ڕزگار بکەم، ئازیزم، منیش نیگەران نیم، نابێ نیگەران بی و هەست بەناخۆشی بکەی.»
- «تەنیا لەبەر تۆ پەشێواوم.»
- «بڵێ وا. نابێ خۆت سەخڵەت بکەیت. ئافرەت سکی هەر دەبێ. هەموو ئافرەتێ منداڵی دەبێ، ئەمە کارێکی سروشتییە.»
- «بەڕاستی دڵگری.»
- «نەخـێـر، وانیم بـەڵام نابێ گـوێی بدەیتێ، هەوڵ دەدەم کـە ناخـۆشـیت بۆ پەیدا نەکەم. دەزانم ئێستا ناخۆشیم بۆت پەیدا کردووە. بەڵام ئایا تاکو ئێستا کچێکی چاک نەبوومە. تۆ هەرگیز نەتزانیوە! وانییە؟»
- «نەخێر.»
- «کەوابێ هەمـووی بەم شێوەیە دەبێ. ئەوەی لە تۆ پێویستە نیگەران نەبی، دەتوانم نیشانەی نیگەرانیت لێ بەدی بکەم. وازی لێ بێنە. بیری لێ مەکەوە.»
- «ئازیزم حەز لە خواردنەوە دەکەی؟ دەزانم کە خواردنەوە هەردەم دڵخۆشت دەکا.»





- «نەخێر، هەست بەکەیفخۆشی دەکەم. تۆش زۆر جوان و دڵگری.»
- «نەخـێـر، وانیم، بـەڵام هەمـوو شـتێ لە پێناوی پێکەوەمـانمان دەکـەم گـەر تۆش شوێنێ بدۆزیتەوە بۆی بچین. هەواش لەمانگی ئۆکتۆبەر (تشرینی یەکەم)دا خۆش دەبێ و کـاتێکی خـۆشـمـان دەبێ. کـە گـەڕایەوە بەرەی جەنگ دەربارەی هەمـوو شـتێکت بۆ دەنووسم.»
- «لەکوێ دەبی؟»
- «هێشتا نازانم، بەڵام شوێنێکی خۆش. چاوم لەوەیە.»

ماوەیێ بێ دەنگ بووین. قسەمـان نەکرد. کاترین لەسەر قەروێڵە دانیشتبوو، منیش سەیرم دەکرد. بەهیـچ جۆرێ دەستـمـان لەدەستی یەکتری نەدا. لەیەکـتری دوور بووین. هەروەک بلـێـی یەکێ بێـتـە ژوورەوە و ئێـمـەش بشـێـوێین. کـاترین دەسـتی درێژکـرد و دەستمی گرت. گوتی: «خۆ تووڕە نەبووی، ئازیزم؟.»

- «نەخێر.»
- «هەست بەوە ناکەی کەوتوویبیە ناو تەڵەیەکەوە؟»
- «لەوانەیە کەمێ، بەڵام نەک بەهۆی تۆوە.»
- «ناڵێم بەهۆی منەوە. گێل مەبە. هەر چ داوێک بێت.»
- «تۆ هەردەم هەست بەتەڵەیەکی بـایـولـوجی دەکـــەی. نـەجـــوولایەوە، دەســـتی نەکێشایەوە. بەڵام هەستم کرد کە خەیاڵی ڕۆییوە و دوور ڕۆیشتووە زۆر دوور. گوتی: «وشەی (هەردەم) وشەیەکی جوان نییە.»
- « ببوورە.»
- «ئەمـە زۆر ڕاسـتـە، بـەڵام تۆ دەزانی کـە هـەرگـیـز نـەبووە و هیچ کـەسـێکم خـۆش نەویستووە. هەوڵم دا ئەو ڕێگەیە بگرمە بەر کە تۆ دەتەوێ. ئێـستـاش دەربارەی هەردەم قسە دەکەی.»

گوتم: «ئامادەم زمانم ببڕم.»

لە خەیاڵە دوورەکەی گەڕایەوە. گوتی:

«ئۆ، دڵدارەکەم، نابێ قسەکانم بەئەوەندە هەڵبگری.»

جارێکی لێک نزیک بووینەوە پەژارەمان نەما.

- «بەڕاسـتی ئێـمـە وەکـو جـارانین. هەر یەک کـەسین. نابێ بەهەڵە لە یەکـتـری بگەین.»
- «وا ناکەین.»
- «بەڵام خـەڵک وا دەکـەن یەکـتـریان خـۆشـدەوێ و بەهەڵە لەیەکـتـری دەگـەن و ناخۆشیان دەبێ، لە دواییش نابنەوە یەک.»

- «بەڵام ئێمە بەشەڕ نایێین و ناخۆشیمان نابێ.»
- «نابێ بەشەڕ بێین، چونکە ئێمەی دوان لەم جیهانەدا تاقانەیین. خەڵکی تریش هەن. گەر هەر شتێ بکەوێتە نێوانمان ئەوان لێکمان دەکەن و ئێمە دەبینە هی ئەوان.»

گوتم: «ناتوانن لێکمان بکەن. چونکە تۆ بەجەرگی. چاونەترسان هیچیان بەسەردا نایێ.»
- «هەڵبەت دەمرن.»
- «بەڵام جارێ.»
- «نازانم کێ ئەم قسەیەی کردووە؟»
- «ترسنۆک هەزار جار دەمرێ، بەڵام ئازا جارێ.»
- «هەڵبەت. کێ ئەمەی گوتووە؟»
- «نازانم.»
- «بێ گومان ئەوەی ئەمەی گوتووە ترسنۆک بوو زۆری دەربارەی ترسنۆکان زانیوە. بەڵام هیچی دەربارەی ئازایان نەزانیوە. ئازاش گەر زیرەک بێ دوو هەزار جار دەمرێ، بەڵام باسیان ناکا.»
- «نازانم، بەڵام زۆر زەحمەتە بزانی چ لە مێشکی ئازایاندا هەیە.»
- «بەڵێ، ئەوان ئاوا خۆ دەردەخەن و ئەو ڕێگەیە دەگرن.»
- «تۆ دانای.»
- «تۆ ڕاستی، ئازیزم، شایستەی ئەوە بووم.»
- «تۆ ئازای.»

گوتی: «نەخێر، بەڵام حەز دەکەم ئازابم.»

گوتم «بەڵام من حەز ناکەم. خۆم دەناسم. ژیان بای ئەوەندەی فێرکردووم. من وەکو یاریزانێکی بێیسبۆڵم کە (٢٣٠) خاڵ دەگرێ دەزانێ قازانجی ئەوی تیا نییە.»
- «ئەمە چ یاریزانێکە (٢٣٠) خاڵ دەگرێ؟ ئەمە زۆر ترسێنەرە.»
- «نەخێر، ئەوە مانای وایە یاریزانێکی مام ناوەندییە.»
- «بەڵام یاریزانێکی گورج وەشێنە.»
- «لەو باوەڕەم کە هەریەک لە ئێمە لە خۆی بایییە. بەڵام تۆ ئازای.»
- «نەخێر، بەڵام بەو هیوایەم ئازابم.»

گوتم: «هەردووکمان ئازایین، بەڵام کاتێ دەخۆمەوە ئازاتر دەبم.»

گوتی: «ئێمە مرۆڤی مەزنین.»

بۆ لای دۆڵابەکە کشا کۆنیاک و پەرداخێکی بۆ هێنام، گوتی: «بخۆوە، تۆ زۆر





ڕووخۆشی.»
- «لە ڕاستیدا، حەز لە خواردنەوە ناکەم.»
- «تەنیا پێکێ.»
- «زۆر باشە.»

سێیەکی پەرداخێکی پڕ کۆنیاک کرد و بەجارێ فڕم کرد.

گوتی: «ئەم فڕە زۆر گەورەبوو، دەزانم کە براندی بۆ پاڵەوانانە، بەڵام نابێ پێی لێ هەڵبرێت.»
- «ئەی پاش شەڕ لە کوێ بژین؟»

کاترین: «لە خانووی پەککەوتووان. سێ ساڵە وەکو منداڵ چاوەڕوانین، شەڕ لە جەژنی لەدایکبوون کۆتایی بێ. بەڵام ئێستا چاوەڕوانی ئەوەین کەی منداڵەکەمان دەبێ بەئەفسەر.»
- «لەوانەیە ببێ بەجەنەڕاڵ.»
- «گەر شەڕێکی سەد ساڵی بێ، ماوەی دەبێ هەردوو پایە بەخۆیەوە ببینێت.»
- «چیتر ناخۆینەوە؟»
- «نەخێر، هەردەم کەیفخۆشت دەکا، ئازیزەکەم، منیش گێژ دەکا.»
- «قەت براندیت خواردۆتەوە؟»
- «نەخێر، ئازیزم، من هاوسەرێکم زۆر کۆن باوم.»

دەستم بۆ بوتڵەکە درێژکردە خوارەوە. بۆ چوارەمین جار پەرداخەکەمم پڕکرد.
- «واچاکە بچم سەرێ بەژووری نەخۆشەکان دابگرم. لەوانەیە تۆش ڕۆژنامە بخوێنیتەوە تاوەکو دەگەڕێمەوە.»
- «هەردەبێ بچی؟»
- «هەر دەبێ بچم، ئێستا بێ یا دوایی.»
- «زۆر باشە، ئێستا بڕۆ.»
- «پاشان دەگەڕێمەوە.»

گوتم: «تا دێیتەوە لە خوێندنەوەیان تەواو دەبم.»

## 22

ئەوێ شەوێ دونیا سارد داگەڕا و ڕۆژی پاشتریش باران دایکرد. لە نەخۆشخانەی ماگیۆری بۆ ژوورەکەم دەگەڕامەوە، بارانێکی بەتین باری، تاگەیشتمە جێ باش تەڕ بووم. لەسەرەوە لە ژوورەکەم بووم، لە دەرەوە باران بەتوندی دەباری. بەباڵکۆنەکەدا

دەهاتە خوارەوە (با)ش بارانەکەی لە پەنجەرەکەوە دەکوتا. جلەکانم گۆڕی و کەمێ براندیم خواردەوە. بەڵام براندییەکە تامی خۆش نەبوو. شەو هەستم بە نەساغی کرد، بەیانی پاشتر دڵم تێک هەڵدەهات. دکتۆر گوتی:

«هیچ گومان لەوەدا نییە! خانم سەیری سپینەی چاوی بکە.»

خانم گاج سەیری چاوی کردم. داوایان لێ کردم لە ئاوێنەوە سەیری چاوم بکەم. سپینەی چاوم زەرد هەڵگەڕابوون، تووشی نەخۆشی زەرتک ببووم دوو هەفتە هێخستمی. لەبەر ئەم هۆیە مۆڵەتی بووژانەوەم لەگەڵ (کاترین) نەبردەسەر. دامان نابوو بچینە (پالانزا لاگۆ ماگێور). ئەوێ جێگایەکی خۆشە بەتایبەتی لە پایزدا کە پەلکەدار ڕەنگی زەرد دەبێ. پیاسەی خۆشە، تۆ دەتوانی پیاسە بکەی و دەتوانی ماسییەخاتوونە لە گۆمەکە ڕاوبکەی. چوونە (پالانزا) لە (ستریزا) چاکتربوو. چونکە خەڵکێکی کەمتری لێ بوو. لەمیلانۆ بەئاسانی دەتوانی بچیتە (ستریزا) هەر لەبەر ئەوەشە خەڵکەکەی وێ دەناسین.

گوندێکی قەشەنگ لە (پالانزا)دا هەیە، لەوێوە بەسواری بەلەم دەتوانین بۆ ئەو دوورگانە بچین کە ماسیگرەکان ژیانیان تیا بەسەردەبەن. چێشتخانەیەکیش لە گەورەترین دوورگەدا هەیە. بەڵام ئێمە نەچووین. ڕۆژێ کە بەهۆی نەخۆشی زەرتکەوە لەنێو جێگە کەوتبووم. خانم (ڤان کامپن) هاتە ژوورەکەم، دەرگای دۆلابەکەمی کردەوە چەند بوتڵێکی بەتاڵی بەرچاوکەوت. زۆر بوتڵی ترم بەدەرگەوان ناردبووە خوارەوە. لەو باوەڕەم لەڕێوە بوتڵەکانی بەدەرگەوان بینیبێ، جا بۆیە هاتووتە سەرەوە تا هەندێکی تریش لە ژوورەکەمدا ببینێ. زۆربەی بوتڵەکانیش هی (ڤێرمۆث) و (مارسالا) و (کاپری) و (شانتی)ی گۆزەیی و چەند بوتڵێکی کۆنیاک بوون. کابرای دەرگەوان بوتڵە گەورەکانی بردبووە دەرەوە کە بریتی بوون لە بوتڵی (ڤێرمۆث) و (سترا) و (شانتی) گۆزەیی. بوتڵەکانی براندی بۆ دواجار بەجێهێشتبوو. ئەم بوتڵانەی خانم (ڤان) دۆزیبیەوە چەند بوتڵێکی براندی بوون. بوتڵێکیان لەسەر شێوەی ورچ بوو. شەرابی (کوحێل)ی تیابوو. ئەو بوتڵە ورچییە ڕقی هەڵساند. ورچەکە لەسەر قونان دانرابوو. پێیەکانی لە ئاسمان بوو تەپەدۆرێکی دەزارکیدا هەبوو. لە ژێرەوەشی دەنکە تلێی کریستاڵی پەیدابیوو دامە پێکەنین و گوتم:

«شەرابی (کوحێل) بوو. باشترین چەشنی کوحێل لەناو ئەم بوتڵە ورچیانەوە لە ڕوسیاوە دێت.»

ڤان پرسی: ئەمانە هەمووی بوتڵی براندین. وا نییە؟»

گوتم: «ناتوانم هەموویان ببینم. بەڵام بەمەزەندەم هەموویان هەون.»

- «چەند دەبێ ئەم چەشنە شەرابە دەخۆیتەوە؟»

گوتم: -«خۆم کڕیومن. خۆشم هێناومن بۆ ئێرە، ئەفسەرە ئیتاڵییەکان ناوەناوە دێنە سەردانم، منیش بۆیە براندیم داناوە تا پێشکەشیان بکەم.»





- «ئەی بەخۆت نەتخواردۆتەوە؟»

- «بەڵێ، خۆشم، هەمیشە خواردوومەتەوە.»

ڤان گوتی: «براندی، یازدە بوتڵی بەتاڵی براندی. ئەی ئەمەی ورچەکەیان؟»

- «کوحێلە.»

- «یەکێ دەنێرم بێ لێرەیان لابەرێ. هەر ئەوەندە بەتاڵەت لا هەیە؟.»

- «حاڵی حازر هەر ئەوەندەم لایە.»

- «لێت ناگرین. بەزەییم پیات دەهاتەوە. تووشی زەرتک بوویت، بەڵام بەزەیی پیاهاتنەوە بێ هوودەیە.»

- «سوپاس.»

- «باوەڕناکەم کەس لە نەگەڕانەوەت بۆ بەرەی جەنگ گازندەت لێ بکا. بەڵام گەر هەوڵ بدەی هەندێ شتی زیرەکانەتر ئەنجام بدەی باشترە لەوەی خۆت بەئەلکهول تووشی زەرتک بکەی.»

- «بەچیی»

- «بەئەلکهول. وابزانم زۆر باش گوێت لێ بوو چیم گوت.»

نقەم لێوە نەهات.

- «بزانە هیچ بیانووی تر نادۆزیتەوە بەرلەوەی لە زەرتک چاک ببیتەوە. چونکە پاش چاکبوونەوە دەبێ بگەڕێیتەوە بەرەی جەنگ. لەو باوەڕدانیم کە خۆتووشکردنت بەزەرتک کارێکی وا بکا تا مۆڵەتی بووژانەوەی پێ وەربگری.»

- «باوەڕناکەی؟.»

- «باوەڕناکەم.»

- «خانم ڤان هیچ جارێ تووشی زەرتک بووی؟»

- «نەخێر، بەڵام ژمارەیەکی زۆرم لە تووشبووان دیوە.»

- «ئایا هەستت بەداد و بێدادی نەخۆشەکان لەدەست نەخۆشییەکانیان کردووە؟.»

- «وابزانم، نەخۆشییەکە لەبەرەی جەنگ چاکترە.»

- «خانم ڤان قەت زانیوتە پیاو بەخۆی خۆی پەککەوتوو بکا، لەقە لەگونی خۆی بدا.»

خانم ڤان خۆی لەم پرسیارە گێل کرد، خۆ هەر دەبوایە خۆی گێل کردبایە یا چووبایە دەرەوە. جا لەبەرئەوەی ئامادە نەبوو ژوورەکە بەجێ بێڵێ و ماوەیەکی لەمێژە ڕقی لێمە. وا ئێستاش حەقی ڕقەکەی پێم دەداتەوە. گوتی: «زۆر پیاو دەناسم بۆ خۆدەربازکردن لەبەرەی جەنگ خۆیان بریندار کردووە.»

- «پرسیارەکەم ئەوە نییە. منیش ئەم دیاردەیەم بینیوە. من ئەوەم لێ پرسی ئاخۆ

کەس دەناسی بەخۆی خۆی پەککەوتوو کردبێ و لەقە لەگونی خۆی بدا؟ چونکە ئەمە نزیکترین هەستکردنە بۆ تووشبوونی زەرتک. وابزانم ئەو هەستە لەلای ژمارەیەکی زۆر کەم لە ئافرەتەوە نەبێ نەناسراوە. لەبەر ئەوە ئەم پرسیارەم لێ کردی ئایا ڕۆژێ لە ڕۆژان تووشی زەرتک بووی، چونکە...»

خانم ڤان ژوورەکەی بەجێهێشت. لە دواییدا گاج وەژوورکەوت: «چیت بەڤان کامپن گوتووە؟ زۆر تووڕە بووە.»

– «بەراوردکاریمان لەنێوان دوو هەستدا دەکرد. دەمویست لێی بپرسم کە هەرگیز ژانی منداڵی گرتووە.»

گاج گوتی: «بەخوا بێ عەقڵی. ئەو دەیەوێت سەرت بخوا.»

– «سەرمی خوارد. مۆڵەتەکەمی لەدەستدام و دەیەوێ بۆ دادگای سەربازی ڕامکێشێ، بەوە تاوانبارم بکا بەئەنقەست خۆم نەخۆش کردووە. بەخوا هیچ و پووچە.»

گاج گوتی: «هەرگیز تۆی خۆش ناوێ. ئەمە لەسەرچییە؟»

– «پێی گوتم بەخواردنەوە خۆم تووشی زەرتک کردووە تانەگەڕێمەوە بەرەی جەنگ.»

– «پەه، سوێند دەخۆم کە تۆ دەمت لە فڕێ نەداوە، هەموو کەس سوێند دەخوا دەمت بەر قومێ نەکەوتووە.»

– «ئەو چاوی بەچەند بوتڵێک کەوت.»

– «سەد جار پێم گوتی ئەم بوتڵانە لای خۆت گل مەدەوە ئێستاکە لەکوێنە؟»

– «لەناو دۆڵابەکەدا دانە.»

– «جەنتات هەیە؟»

– «نەخێر، لەناو ئەم هەگبەیان دانێ؟»

خانم گاج بوتڵەکانی لەناو هەگبەکە دانا.

گوتی: «دەیان دەم بەدەرگەوان.»

بەرەو دەرگاکە چوو.

ڤان دەرگەوانی لەگەڵ خۆی هێنابوو. لە دەرگا تووشی گاج بوو. گوتی: «دەقەیێ من ئەو شتانە دەبەم. زەحمەت نەبێ هەڵیان بگرە تا ڕاپۆرتەکەم بنووسم و نیشانی دکتۆری بدەم.»

بەدالانەکە چووە خوارەوە، دەرگەوانەکەش هەگبەکەی هەڵگرت. دەرگەوان دەیزانی چی تیایە.

هیچ ڕووی نەدا تەنیا مۆڵەتەکەمی لەدەست چواند.





# 23

لەو شەوەی بڕیار وابوو بگەڕێمەوە بەرەی جەنگ دەرگەوانم نارد شوێنێکم لە شەمەندەفەر بۆ بگرێ کە لە (تۆرین)ەوە دەهات. ئەم شەمەندەفەرە لە نیوەی شەو لە ئێستگەوە دەرچوو، لە (تۆرین)ەوە بەڕێ دەکەوت، لە سەعات دە و نیوی شەو دەگەیشتە (میلانۆ). تا کاتی دەرچوونی لە ئێستگە دەما. لەکاتی هاتنی شەمەندەفەر بۆ شوێنگرتن دەبوایە خۆت لەوێ بوای. دەرگەوان برادەرێکی لەگەڵ خۆی برد، تۆپچی بوو، لە مۆڵەتدا بوو، لە دوکانی بەرگدروویێ ئیشی دەکرد. دڵنیای کردم کە بەهەردووکیان دەتوانن شوێنێکم لە نێوان خۆیان بۆ بگرنەوە. پێم گوتن کەلوپەلەکانیشم ببەن کە هەگبەیەک و دوو جۆرک بوون. لە دەوروبەری سەعات پێنج خواحافیزیم لەوانەی نەخۆشخانە کرد هاتمە دەرەوە، دەرگەوانەکە شتەکانی لە ژووروچکەکەی خۆی دانا. پێم گوت پێش نیوەشەو لە ئێستگە دەبم. خێزانی دەرگەوانەکە پێی گوتم (سیگنۆرینو)و دایە پرمەی گریان.

چاوەکانی سڕینەوە و تەوقەمان کرد جارێکی تر گریانەوە. دەستێکم لەپشتی دا ئەم جارە بەگوڕتر گریا. ئەو جلەکانمی دەدوورییەوە. ئافرەتێکی قوتەخنەی خرپنی ڕووخۆشی پرچ سپی بوو. کاتێ دەستی بەگریان کرد دەموچاوی خەت خەت بوو. بۆ لای ئەو کونجە چووم کەمەیخانەی تیابوو.

لە جامخانەی مەیخانەکەوە سەیری دەرەوەم کرد و چاوەڕێی (کاترین) بووم. دەرەوە تاریک و سارد و تەم و مژ بوو. پارەی قاوە و گراپیم دا. لە جامخانەکەوە سەیری ئەو کەسانەم دەکرد کە لەبەر ڕووناکی جامخانەکانەوە بەلای مەیخانەکەوە تێپەڕدەبوون. لەجامخانەکەوە چاوم بەکاترین کەوت، تەقەم لە جامخانەکەوە هێنا. ئاوڕی دایەوە تا پێی بگەم. چارۆگەیەکی شینی تۆخی لەبەرابوو. شەپقەیەکی نەرمیشی لەسەرکردبوو. پێکەوە بەشۆستەکەوە ڕۆیشتین. بەلای مەیخانەکاندا تێپەڕین، پاشان مەیدانی بازاڕەکەمان بڕی و چووینە سەرەوەی شەقامەکە و بەلای تاقەکەوە چووینە گۆڕەپانی کاتدرائیە. چەند هێڵێکی تراموای لێ هەبوو، کاتدرائیە کەوتبووە دواوەی ئەمانەوە. کاتدرائیەکە سپی بوو لەبەر تەم و مژ تەڕ ببوو. لە هێڵی تراموا پەڕینەوە لای چەپی کاتدرائیە چەند دوکانێکی تیا هەڵکەوتبوو جامخانەی دوکانەکان و دەروازەی گالەرییەکانیش ڕووناک بوون. گۆڕەپانەکە تەمی زۆربوو. کە لە بەری پێشەوەی کاتدرایەکە نزیک بووینەوە. کاتدرائیەکە زۆر گەورەبوو. بەردەکانی بەخوناو بوون.

– «حەز دەکەیت بچینە ژوورەوە؟.»

کاترین: «نەخێر»

لە ڕۆیشتن بەردەوام بووین. سەربازێ خۆی و دەزگیرانەکەی لەبەر سێبەری پالەوانەیەکی بەردینی پێشمان ڕاوەستابوون. بەلایاندا تێپەڕین. توند پشتی خۆیان

بەبەردی پاڵەوانەکە دابوو، چاکەتەکەی خۆی لە دەزگیرانەکەی وەرێنابوو.

گوتم: «ئەوانیش وەکو ئێمەن.»

کاترین بەخەفەتبارییەوە گوتی: «هیچ کەسێ نییە وەکو ئێمە بێ.»

– «خۆزیا شوێنێکیان هەبوایە بۆ خۆیان ڕوویان تێکردبایە.»

– «لەوانەیە ئەمەش دادیان نەدا.»

– «جا ئەوە نازانم، بەڵام پێویستە هەموو کەسێ شوێنێکی هەبێ ڕووی تێ بکا.»

کاترین: «ئەوان کاتدرائیەیان هەیە.»

ئێستاکە بەبەردەم کاتدرائیەکە تێپەڕبووین. بەپیاسە تاکۆتایی گۆڕەپانەکە چووین، ئاوڕمان لە کاتدرائیەکە دایەوە. کاتدرائیەکە لەناو دەمدا زۆر جوان بوو. لەبەردەم دوکانێکی قایش فرۆش ڕاوەستاین. پێڵاوی سواری و جانتای پشتێ و پێڵاوی بەفرە خلیسکێ لەناو جامخانەکەیدا هەبوو، هەریەک لەمانە وەک پارچەیەکی سەربەخۆ نیشان درابوو، جانتاکە لە ناوەڕاستەوە بوو. پێڵاوی سواریش لەلایێ و پێڵاوی بەفرە خلیسکێش لەلایەکەی ترەوە بوو. ڕەنگی قایشەکە تۆخ و چەورکراو و لووس بوو، لە زینێکی بەکارهاتوو دەچوو. تیشکی گڵۆپەکان لەسەر ئەو قایشە تاریک و چەورەدا دەبریسکایەوە.

– «ڕۆژێ دێ لەسەر بەفر خلیسکانێ دەکەین.»

کاترین: «پاش دوو مانگی تر، لە مۆڕن یاری بەفرەخلیسکێ دەست پێدەکا.»

– «با بچنە وێندەر.»

– «زۆر باشە.»

بەبەردەم جامخانەی دوکانەکانی تردا تێپەڕین، بۆ شەقامێکی لاپەڕ پەڕینەوە.

– «هەرگیز نەهاتوومەتە سەر ئەم ڕێگایە.»

ئەم ڕێگایە ڕێگایەکی تەسک بوو، لەلای دەستەڕاستدا ڕۆیشتین. خەڵکێکی زۆر بەناو تەمدا دەهات و دەچوون. دوکانێکی زۆری لێ بوو. گڵۆپەکانی جامخانەکانیان دەسووتان. لە جامخانەیەکەوە سەیری کۆمەڵە پەنیرێکمان کرد.

لەبەردەم دوکانی چەک فرۆشێ ڕاوەستام گوتم: «دەقەیێ وەرە ژوورەوە. دەمەوێ چەکێک بکڕم.»

– «چ جۆرە چەکێ؟»

– «دەبانچەیێ.»

چووینە ژوورەوە. قایشەکەم کردەوە، لەگەڵ کیفی بەتاڵەکەی دەبانچەکەم لەسەر مێزی دوکاندارەکەم دانا، دوو ئافرەت لە دواوەی مێزەکەوە بوون، ئافرەتەکان ژمارەیێ دەبانچەیان هێنا.»





گوتم: «دەبێ بۆ ئەم کیفە بشێ؟»

کیفەکەم کردەوە، قایشێکی بۆری هەبوو. خۆم بەنیوداشی لەدەست کڕیبووم تا لەشاردا لە لاتریزەمی ببەستم.

کاترین: «ئاخۆ دەبێ دەبانچەی باشیان هەبێ؟»

گوتم: «هەموویان وەکو یەکن.»

لە ئافرەتەکەم پرسی: «دەتوانم ئەم دەبانچەیە تاقی بکەمەوە؟»

ژنەکە گوتی: «شوێنی گوللە تەقاندنمان نییە، بەڵام دەبانچەیەکی زۆر باشە. هیچ نیشانەیێ لەبەردەستی قورتار نابێ.»

سوارم کرد دەستم لەسەر پەلاپیتکە دانا. هەرچەند سپرینگەکەی بەهێز بوو بەڵام بەنەرمی کاری دەکرد، جارێکی تر سوارم کرد و تەقاندم. ئافرەتەکە گوتی: «چەکێکی نیو داشە، هی ئەفسەرێکی نیشانشکێن بوو.»

– «خۆت پێت فرۆشتبوو؟»

– «بەڵێ»

– «ئەی چۆن کەوتۆتە بەردەستت؟»

– «لەیاوەرەکەوە.»

گوتم: «لەوانەیە هی منیشت لابێ. بەچەندە؟»

– «پەنجا لیر، زۆر هەرزانە.»

– «زۆر باشە. دوو فیشەکدان و قردوێ گوللەشم دەوێ.»

لەژێر مێزەکەوە بۆی دەرهێنام.

– «شمشێرت دەوێ. هەندێ شمشێری بەکارهاتووی هەرزانمان هەیە.»

گوتم: «دەگەڕێمەوە بەرەی جەنگ.»

– «ئاه، بەڵێ، کەوابێ پێویستت پێی نییە.»

پارەی گوللەکان و دەبانچەکەم دا. یەدەگەکەم پڕ گوللە کرد و لە جێگەی خۆیم دانا و دەبانچەکەشم لەناو کیفە بەتاڵەکە دانا. یەدەگە زیادەکانیشم پڕ گوللە کرد لە شوێنی فیشەکدانی سەر ڕەختەکەم دانا. قایشەکەم بەست.

دەبانچەکە لەسەر قایشەکەوە قورس دیاربوو. تا ئەو دەقەش لە دڵی خۆمدا دەمگوت واباش بوو دەبانچەیەکی نیزامیم هەبێ. فیشەکی هەردەم لە نەبڕانە و دەستدەکەوێ.

گوتم: «ئێستا وا تەواوی چەکدارم، ئەمە تاقە شتێکە نابێ لە بیری بکەم. لەکاتی خۆیدا کە چووم بۆ نەخۆشخانەیەکی دەستی لەدەبانچەکەی پێشووم گر کردبوو بردی.»

کاترین: «بەو هیوایەم دەبانچەیەکی چاک بێ.»

ئافرەتەکە پرسی: «هیچی ترت ناوێ؟»

– «باوەڕناکەم هیچی ترم پێویست بێ.»

ئافرەتەکە گوتی: «دەبانچەکە پەتی خۆی هەیە بۆ بەستنەوە.»

– «تێبینی ئەوەم کردووە.»

ئافرەتەکە مگێزی ئەوەبوو شتی ترم پێ بفرۆشێ.

– «فیتفیتەت ناوێ؟»

– «نەخێر.»

ئافرەتەکە خواحافیزی کرد. ئێمەش هاتینە سەر شۆستی. کاترین لە جامخانەکەوە سەیری کرد. ئافرەتەکەش لە ژوورەوە سەیری دەرەوەی کرد و خۆی بۆ دانەواندین.

– «ئەم ئاوێنە بچووکانە بۆچی لە دارگیراون؟»

– «بۆ ڕاکێشانی باڵندەیە لە کێڵگەکاندا دەیان سووڕێنن. کە کڵاوکوڕە ئەمانە دەبینن بۆ لایان دەکشێن و ئیتاڵییەکانیش ئاگریان دەدەن و ڕاویان دەکەن.»

کاترین گوتی: «ئیتاڵییەکان زیرەکن، وا بزانم ئێوە لە ئەمریکا کڵاوکوڕە ناکوژن، ئازیزم؟»

– «نەخێر، بەئەنقەست نایکوژین.»

لە شەقامەکە پەڕینەوە، لەبەرەکەی تر دەستمان بەڕۆیشتن کرد.

کاترین گوتی: «ئێستاکە وا هەستدەکەم باشترم، کاتێ دەستمان بەڕۆیشتن کرد هەستم بەترسێ دەکرد.»

– «هەردەم پێکەوە هەست بەباشی دەکەین.»

– «کەوابێ هەر پێکەوە دەبین.»

– «بەڵێ، بەڵام لە نیوەی شەو لێت دوور دەکەمەوە.»

– «بیر لە دوورکەوتنەوە مەکەوە، ئازیزم.»

بەشەقامەکەدا شۆڕبووینەوە. گڵۆپەکان لەبەر تەم و مژ زەرد هەڵگەڕابوون.

کاترین پرسی: «ماندوو نەبووی؟»

– «ئەی تۆ؟.»

– «نەخێر، پیاسەکردن شتێکی خۆشە.»

– «بەڵام نابێ درێژەی بدەینێ.»

– «نەخێر، درێژەی پێ نادەین.»

بۆ شەقامێکی لاڕێ سووڕاینەوە، ڕووناکی چییە تیای نەبوو، لە شەقامەکەوە ڕۆیشتین. ڕاوەستام کاترینم ڕامووسی، کاتێ ماچم کرد. هەستم کرد دەستی خستە سەرشانم چاکەتمی ڕاکێشا و بەخۆی دادا تا هەردووکمانی داپۆشی. لە شەقامەکەدا





ڕاوەستاین پشتی خۆمان بەدیوارێکی بەرزدابوو.

گوتم: «با بچین بۆ شوێنێ؟»

کاترین گوتی: «باشە.»

بەشەقامەکەدا ڕۆیشتین تا لە شەقامێکی بەرینتر لە تەنیشت جۆبارێک هاتینە دەرەوە. لەبەرەکەی تری شەقامەکەدا دیوارێکی کەرپووچی و چەند ساختمانێکی تیا قیت ببووەوە. لەوسەری شەقامەکەدا ترامێکم بینی لە پردێکەوە دەپەڕینەوە.

گوتم: «لەسەر پردەکە دەتوانین سواری پەیتوونێ ببین.»

لەسەر پردەکەدا لەنێو تەمدا بەدیداری پەیتوونێ ڕاوەستاین، ژمارەیێ ترام تێپەڕین. هەمووی پڕ خەڵک بوو بەرەوماڵەوە دەگەڕانەوە.

پاشان پەیتوونێ هات. بەڵام یەکێکی تیابوو تەمەکە بوو بە نمەباران.

کاترین گوتی: «دەکرێ بەپێ بڕۆین یا سواری ترام بین.»

– «پەیتوونێکی تر هەر دێ. پەیتوونەکان لێرەوە تێپەڕ دەبن.»

گوتی: «ئەوە یەکێکی تر هات.»

پەیتوونچییەکە ئەسپەی وەستاند. نیشانە میتالیە پارە ژمێرەکەی هێنایە خوارەوە. چەتری پەیتوونەکەش بەرزبوو. چەند دڵۆپە بارانێ کەوتبووە سەر چاکەتەکەی و شەپقەکەشی لە تەڕیان دەدرەوشایەوە. لەسەر کورسی دواوە بەدووقۆڵی لێی دانیشتین. چەترەکەی ناوەوەی پەیتوونەکەی کردبووە شەوە ڕەشە.

– «پێت گوتووە، بۆ کێ بچێ؟»

– «بۆ ئێستگە، لە بەرامبەر ئێستگەکە ئوتێلێ هەیە. دەتوانین بچینە وێندەر.»

– «جا بەم حاڵە و بەبێ کەلوپەل دەتوانین بچینە وێندەر؟»

گوتم: «بەڵێ.»

بەسواری پەیتوون و لەبەر باران، ماوەی ڕێگاکە بۆ ئێستگە دووربوو.

کاترین پرسی: «شێو نەکەین؟ دەترسم برسیم بێ.»

– «لە ژووری ئوتێلەکە نان دەخۆین.»

– «هیچم نییە لەبەری بکەم. جلی شەوانەشم نییە.»

– «دانەیێ پەیدا دەکەین.»

بەپەیتوونچییەکەم گوت: «بڕۆ سەر شەقامی مازۆنی.»

پەیتوونچییەکە سەری خۆی لەقاند بۆ لای چەپی سووچەکەی تر سووڕاینەوە. لەشەقامێکی گەورە کاترین چاوی لە دووکانێ دەگێڕا.

گوتی: «ئەمەتە دوکانێ.»

منیش پەیتونچییەکەم ڕاگرت. کاترین دابەزی و شۆستەکەی بڕی و چووە دووکانەکەوە. منیش لەناو پەیتوونەکە دانیشتم و چاوەڕێم کرد باران بوو. هەستم بەبۆنی تەڕایی شەقامەکە کرد. ئەسپەکەش هەڵمی لێ هەڵدەستا. کە گەڕایەوە گورزەیەکی بچووکی بەدەستەوە بوو سواری پەیتوونەکە بووەوە. دەستمان بەڕۆیشتن کرد.

- «دەستم زۆر بڵاوە. بەڵام شەوێکی جوانە.»

لەبەردەم ئوتێلەکە داوام لە کاترین کرد لەناو پەیتوونەکە بمێنێ. منیش چووم قسەم لەگەڵ ئوتێلچییەکە کرد. ئوتێلەکە ژووری زۆری تیابوو. ئەوجا گەڕامەوە پەیتوونەکە و پارەی پەیتوونچییەکەم دا. من و کاترین پێکەوە چووینە ئوتێلەکە. مێردمنداڵێک گورزەکەی لە دەستم وەرگرت و ئوتێلچییەکەش خۆی بۆمان دانەواند و تا لای بەرزکەرەوەکە لەگەڵمان هات. ژمارەیێ پلاکی مسی مەخمەلی سووری تیابوو. ئوتێلچییەکە لەگەڵمان سواری بەرزکەرەوەکە بوو.

- «حەز دەکەن لە ژوورەکەتان نانی ئێوارە بخۆن؟»

- «بەڵێ، زەحمەت نەبێ لیستەی خواردنمان بۆ نانێرییە سەرەوە؟»

- «بۆ نانی ئێوارە دڵتان خواردنی تایبەتی وەکو باڵندەی ڕاوکراو یان سۆفیلە دەبا؟»

بەرزکەرەوەکە سێ نهۆمی بڕی لەهەر نهۆمێ قرتەیەکی لێوە دەهات دواجار قرتەیەکی لێوە هات و وەستا.

- «لە فڕەندەی ڕاوکراو چیتان هەیە؟»

- «کەڵەشێری کێوی و کەڵەشێری دارستان[1]؟»

بەناو ڕاڕەوی ئوتێلەکەدا ڕۆیشتین ئەو بەڕەی ڕاڕەوی ئوتێلەکەی پێ ناوپۆش کرابوو، شڕ ببوو. ژمارەیێ دەرگای زۆریشی تیابوو، کارگێڕەکە هەڵوێستێکی کرد، دەرگایەکی بەکلیل کردەوە و خستیە سەرپشت.

- «ئەمە ژوورەکەتانە. ژوورێکی دڵڕایە.»

مێردمنداڵەکەش گورزەکەمانی لەسەر مێزی پێشەوەی ژوورەکەی دانا. ئوتێلچییەکەش پەردەی ژوورەکەی لادا و گوتی:

«دەرەوە تەمە.»

کەلوپەلی ژوورەکە بەمەخمەلێکی سوور ڕووپۆش کرابوو. چەند ئاوێنەیەک و دوو کورسی و چوارپایەکی گەورەی تیابوو. چوارپایەکە بەقوماشی (ساتان) ڕووپۆش کرابوو. دەرگایەکی تیابوو. بۆ سەر شۆرک دەچوو. ئوتێلچییەکە گوتی: «لیستەی

(١) کەڵەشێری کێوی: باڵندەیەکی جوانی کلک درێژە و لەکەڵەشێر و تاوس دەچێ (چرپۆڕ).
کەڵەشێری دارستان: باڵندەیەکی گۆشت خۆری قاوەیی مەیلەو ڕەشی چاو گەورەی دەنووک درێژە.





خواردنتان بۆ دەنێرم.»

خۆی بۆ دانەواندین و چووە دەرەوە. چوومە لای پەنجەرەکەوە. تەماشای دەرەوەم کرد. پەتی پەردە مەخمەلییە سوورە ئەستوورەکەم ڕاکێشا. کاترین لەسەر چوارپایەکە دانیشتبوو تەماشای چلچرای کریستاڵی دەکرد.

شەپقەکەی لەسەر کردبۆوە، پرچی لەژێر ڕووناکی دەبریسکایەوە. خۆی لە ئاوێنەیەکدا بینی. دەستی خۆی بۆ پرچی بەرزکردەوە. منیش ئەوم لە سێ ئاوێنەی تردا دەبینی. هیچ نیشانەیەکی کەیفخۆشی لێ دیار نەبوو. چاڕۆگەکەشی کەوتە سەر چوارپایەکە.

- «چیتە، ئازیزم؟»

گوتی: «هەرگیز درکم بەوە نەبردووە کە وەکو سۆزانی بم.»

منیش گەڕامەوە لای پەنجەرەکەوە پەردەکەم لادایەوە و سەیری دەرەوەم کرد. لەو باوەڕەدا نەبووم ڕیسەکەم لێ ببێتەوە خوری و هەڵوەشێتەوە.

- «بەڵام تۆ سۆزانی نی؟»

- «دەزانم، بەڵام کارێکی زۆر گرانە کە هەست بکەیت وایت.»

دەنگی وشک و کپ دەهاتە بەرگوێ.

- «ئەمە باشترین ئوتێلە کە دەتوانین ڕووی تێ بکەین.»

ئەمەم گوت و سەیری دەرەوەم کرد. لە بەرامبەر گۆڕەپانێکەوە گڵۆپەکانی ئێستگە دیار بوون. پەیتوونیش بەنزیک ئوتێلەکە بەسەر شەقامەکەدا تێپەڕ دەبوون، دار و درەختی باخچەکەشم بینی، گڵۆپی ئوتێلەکەش لەسەر شۆستە تەڕەکەدا دەبریسکانەوە. لە دڵی خۆمدا گوتم:

«ئۆهـ، جەهەنەم، ئێستا کاتی ئەوەیە ئەم کاتە بەم گفتوگۆیە بەرمەسەر.»

کاترین گوتی: «تکایە، وەرە سەر ئێرە.»

لەگەڵ ئەم قسەیە ڕووگرژی سەروسیمای بەتەواوی بزر بوو.

- «تکایە وەرە لام، جنەکانم لا نەمان[1]، بوومەوە کچێکی باش.»

سەیرم کرد زەردەخەنەیەکی گرت. منیش چوومە سەر چوارپایەکە و لەتەنیشتی دانیشتم و ماچم کرد.

- «ئایا تۆ دەزگیرانی باشی منی؟»

- «بێ گومان من دەزگیرانی تۆم.»

پاش نانخواردن هەستم بەچاکبوونەوە کرد. پاش کەمێکی تر هەستمان بەکەیفخۆشی کرد. دوایی ئەوەندەی نەبرد وا هەستمان کرد کە ژوورەکە وەکو ژووری خۆمانە، ژوورەکەم لە نەخۆشخانە هی خۆمان بوو، بەهەمان چەشن ئەم ژوورەش ژووری خۆمانە.

(١) جنەکانم: لەجیاتی (گەڕامەوە) بەکارهاتووە.

لەو کاتەی نانمان خوارد کاترین کورتەکی منی بەسەر شانی خۆی دادابوو. زۆرمان برسی بوو، خواردنەکە جەمێکی باش بوو بوتڵێک کاپری و بوتڵێ (سات ئیسف)مان خواردەوە. من زۆربەی زۆریم خواردەوە. بەڵام کاترین کەمێکی خواردەوە. ئەمەش وای لێ کرد جۆش و خرۆش بیگرێت، نانی ئێوارەشمان بریتی بوو لە گۆشتی کەڵەشێری ناسراو بەکەڵەشێری دارستان لەگەڵ پەتاتە و سوفیلە و سەلاتە.

دوایش (زابلیۆنی) لە جیاتی شیرینی.

کاترین گوتی: «ژوورێکی خۆشە، دڵگرە، دەبوایە بەدرێژایی مانەوەمان لە (میلانۆ) لێرە بواینە.»

– «ژوورێکی سەیرە، بەڵام دڵگرە.»

کاترین گوتی: «خراپە شتێکی سەیرە، ئەو کەسانەی تیای ژیاون دەبێ تامیان چەشتبێ، ئەم مەخمەلییە سوورە جوانە. ئەمەش شتێکە ئاوێنەکانیش بەڕاستی سەرنج ڕاکێشن.»

– «تۆ کچێکی دڵگری.»

نازانم ئەم ژوورە بۆ بێداربوونەوەی بەیانیان چۆنە، بەڵام پیاو حەق بڵێ ژوورێکی خۆشە.»

پەرداخێکی ترم (سات ئستنێف)م تێ کرد.

کاترین: «خۆزیا، گوناهێکی بەڕاستیمان کردبا. تاکو ئێستا هەرچییەکی کردوومانە لەوە دەچێ سادە و بێ گوناه بێ، باوەڕناکەم خراپەمان کردبێ.»

– «کچێکی مەزنی.»

– «هەست بەبرسییەتی دەکەم، برسییەتیەکی ترسناک.»

– «تۆ کچێکی سادە و ئێسک سووکی.»

– «کچێکی سادەم، جگە لە تۆ تائێستا کەس نەیزانیوە.»

– «لەو ڕۆژەوەی کە تۆم بینی، پاش نیوەڕۆیەکم بەخەیاڵی تۆوە بردە سەر بیرم لەوە دەکردەوە ئاخۆ چۆن دەکرێ ڕۆژێ من و تۆ پێکەوە بچینە ئوتێلی (کاڤۆڕ)، ئەگەر بچین دەبێ ئەو وەختە هەست بەچی بکەین؟.»

– «ئەمەش لە ئازایەتی خۆتە، بەڵام خۆ ئەمە ئوتێلی (کاڤۆڕ) نییە. وانییە؟»

– «نەخێر، ڕێگەمان نادەن بچینە ئوتێلی (کاڤۆڕ).»

– «ڕۆژێ دێ ڕێگەمان بدەن. بەڵام ئێمە زۆر جیاوازین، ئازیزم من بیر لە هیچ ناکەمەوە.»

– «هەرگیز بیری لێ ناکەمەوە؟»

– «بەدەگمەن بیری لێ دەکەمەوە.»





– «بەڕاستی کچێکی بەردڵی.»

پێکێ مەییم تێ کرد.

– «کچێکی زۆر سادەم.»

– «لەسەرەتادا وا بیرم کردەوە وام دەزانی کە شێتی.»

– «کەمێ سەرشێتم، پلەی شێتاتیم بەو ڕادەیە ئاڵۆز نییە، هیچ جارێ سەرم لە تۆ تێکنەداوە، وا نییە گیانەکەم؟»

– «مەی شتی باشە، هەموو شتی خراپ لە بیر دەبا.»

– «بەڕاستی بەتامە. بەڵام باوکمی تووشی نەخۆشی گۆتی کرد.»

– «باوکت ماوە؟»

– «بەڵێ، تووشی نەخۆشی گۆتی بووە. پێویست ناکا بیبینی. ئەدی تۆ باوکت نەماوە؟»

گوتم: «نەخێر زڕباوکم هەیە.»

– «ئەرێ گەر بیبینم دەکەوێتە بەر دڵم؟»

– «پێویست ناکا بیبینی.»

کاترین: «ئێمە بەختیارین. لەوە زیاتر بیر لە هیچ شتی تر ناکەمەوە. زۆر خۆشحاڵم کە شووم بەتۆ کردووە.»

خزمەتکارەکە شتەکانی بردەوە. تا ماوەیێ بێدەنگ بووین. گوێمان لە دەنگی باران بوو. لە خوارەوەش دید و هۆڕی ئوتومبیلان ڕۆژە ڕێیەک دەڕۆیی.

گوتم: «هەردەم لە دواوە گوێم لێیە.»

گالیسکە باڵدارەکەی کات، وا تاو دەدات.»

کاترین گوتی: «ئەو هۆنراوەیە دەزانم. هی (مارڤێلە) بەڵام دەربارەی ئەو کچەیە کە لای پیاو نامێنێتەوە.»

مێشکم ساف بوو، هەستم کرد دەبێ دەربارەی ڕاستییەوە قسە بکەم.

گوتم: «منداڵەکەت لەکوێ ببێ؟»

– «نازانم، باشترین شوێن بتوانم بیدۆزمەوە.»

– «باشە چۆن ئەمە ئەنجام دەدەی؟»

– «بەباشترین ڕێگە کە بتوانم ئەنجامی بدەم، نیگەران مەبە، ئازیزم لەوانەیە بەر لەوەی شەڕ تەواو بێ، ژمارەیێ منداڵمان ببێ.»

– «کاتی ڕۆیشتنە.»

– «دەزانم گەر مەیلی ڕۆیشتنت هەیە، هەر ئێستا دەتوانین بڕۆین.»

– «نەخێر.»
– «کەوابێ تەنگاو مەبە، ئازیزم، تائێستا باش بووی ئێستاش دڵتەنگ مەبە.»
– «دڵتەنگ نیم. مانگێ چەند جار نامەم بۆ دەنووسی؟»
– «هەموو ڕۆژێ. شتەکانت دەخوێننەوە؟»
– «ناتوانن بەو ڕادەیە ئینگلیزی بخوێننیتەوە، تا ئازاری خەڵکی پێ بدەین.»
– «نامەکانم بەدەستخەتێکی ناخۆش دەنووسم.»
– «بەڵام زۆر ناخۆش نەبێ.»
– «کەمێ بەدەستخەتێکی ناخۆش دەیاننووسم.»
– «دەترسم کاتی ڕۆیشتنم هاتبێ.»
– «زۆر باشە، ئازیزم.»
– «چەندم لە دڵ گرانە ماڵە جوانەکەم بەجێ بێڵم.»
– «منیش وەک تۆ.»
– «بەڵام دەبێ بڕۆین.»
– «ڕاستە، بەڵام زەمانە قەت وای نەکردووە بەینێکی خۆش پێکەوە بمێنین.»
– «ڕۆژێ دێ پێکەوە دەمێنینەوە.»
– «تا دەگەڕێیتەوە ماڵێکی خۆشت بۆ ئامادە دەکەم.»
– «کێ دەزانێ، لەوانەیە دەستبەجێ بگەڕێمەوە.»
– «لەوانەیە پێت کەمێ بریندار ببێ.»
– «نەخێر، دەمەوێ گوێیەکانت سەلامەت بن.»
– «ئەی پێیەکانم. حەز ناکەی وەکو خۆیان ساغ بن.»
– «ئاخر، قاچەکانت برینینان تائێستا وشک نەبوویتەوە.»
– «گیانەکەم دەبێ بڕۆین.»
– «باشە تۆ لە پێشدا بڕۆ.»

## 24

لەجیاتی ئەوەی بەبەرزکەرەوە دابەزین، بەپێبلکە دابەزینە خوارەوە. ئەو ڕایەخەی پێبلکەکەی پێ داپۆشرابوو شڕ ببوو. پارەی نانی ئێوارەم دا کە بۆیان هێنابووینە سەرەوە.

ئەو خزمەتکارەی خواردنەکەی هێنایە سەرەوە لەسەر کورسی لە نزیک دەرگاوە دانیشتبوو هەستایە سەر پێ و خۆی بۆ دانەواندین، لەگەڵی چوومە ژوورێکی لاپەڕە





کرێی ئوتێلم دایێ وا پێدەچوو ئوتێلچییەکە بەبرادەرێکی خۆیم تێگەیبێ. بۆیە نەیهێشت پێشەکی پارە بدەم. بەڵام کاتێ زانیویەتی بەهەڵەچووە خزمەتکارەکەی لەبەردەرگا داناوە نەبادا بێ پارەدان بچمە دەرەوە، لەم باوەڕەدام ئەم حاڵەتە ڕوویدابێ. هەتا لەگەڵ هاوڕێکانی خۆشی. خۆ شوکر پیاو لە ڕۆژگاری شەڕدا دۆست و برادەری گەلێ زۆرە.

داوام لە خزمەتکارەکە کرد پەیتوونێکمان بۆ بگرێ. خزمەتکارەکە گورزەکەی کاترینی لێ وەرگرتم، کە من هەڵمگرتبوو. بەسەیوانێ چووە دەرەوە. لە پەنجەرەوە بینیمان لە شەقامەکەدا لەژێر باران دەپەڕییەوە لە ژووی تەنیشتیەوە ڕاوەستاین. لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەی کرد.

– «کات، چیتە؟»
– «خەوم دێ.»
– «هەست بەبرسییەتی دەکەم.»
– «چیت هەیە بیخۆی؟»
– «بەڵێ، لەناو جۆرکەکەمە.»

پەیتوونێکی بینی هێروە هات، ڕاوەستا. ئەسپەکەش لەبەر باران سەری خۆی شۆڕکردبۆوە. خزمەتکارەکەی تیا دابەزی. سەیوانەکەی هەڵدا، بەرەو لای ئوتێل هات. لە دەرگاوە گەیشتنە یەک. هەر بەسەیوانەکەی ئەوەوە هاتینە دەرەوە. بۆ لای پەیتوونەکە ڕۆیشتین کە لەوبەری ڕێگاکەوە ڕاوەستابوو. ئاو بەجۆگەلەکاندا دەڕۆیی.

خزمەتکارەکە گوتی: «گورزەکەت لەسەر کورسی پەیتوونەکەیە.»

لەبن سەیوانەکەوە ڕاوەستا تا سواری پەیتوونەکە بووین. هێشتا نەمدا خزمەتکارەکە.

گوتی: «زۆر سوپاس، گەشتێکی خۆش.»

پەیتوونچییەکە جڵەوی بەرزکردەوە، ئەسپەکە دەستی بەڕۆیشتن کرد، خزمەتکاریش لەژێر سەیوانەکەوە گەڕایەوە ئوتێلەکەوە. بەشەقامەکاندا چووینە خوارەوە بەرەو لای چەپ سووڕاینەوە، دوایی بەرەو لای ڕاست... بەرەو ئێستگە، هاتینە بەردەم ئێستگە. دوو پۆلیسی قەرەبینی لە شان لەژێر ڕووناکی لەبەر باران ڕاوەستابوون.

لەبەر تیشکی گڵۆپەکانی ئێستگەوە سەرکڵاوەکانیان دەبریسکایەوە. بارانەکە ڕوون و بلەورین بوو، کۆڵهەڵگرێ لەژێر کەپەنگی ئێستگەوە هاتە دەرەوە، لە ترسی باران سەروملی وێک هێنابووەوە.

گوتم: «نەخێر، سوپاس پێویستم پێت نییە.»

گەڕایەوە دواوە و چووەوە ژێر کەپەنگی تاقەکەوە، ڕووم بۆ لای کاترین وەرسووڕاند، سیمای کەوتبووە ژێر تارمایی چەتری پەیتوونەکەوە.

– «دەتوانین خوا حافیزی لەیەکتری بکەین.»

– «نابێ منیش بێمە ژوورەوە؟»

– «نەخێر.»

– «خواحافیز، کات.»

– «دەتوانی ناونیشانی نەخۆشخانەی بدەیتێ؟»

– «بەڵێ.»

ناونیشانی تەواوی نەخۆشخانەم دایە پەیتوونچییەکە تا بیگەیەنێتە نەخۆشخانە، پەیتوونچییەکە سەری ڕەزامەندی لەقاند.

– «خواحافیز، زۆر ئاگاداریی خۆت و کاترینی بچووک بە.»

– «خواحافیز ئازیزەکەم.»

گوتم: «خواحافیز.»

لە پەیتوونەکە دابەزیم و هاتمە بەر باران. پەیتوونەکە ئۆغری کرد. کاترین خۆی لە پەیتوونەکە هێنایە دەرەوە، لەبەر ڕووناکییەوە سیمایم بینی بزەیەکی هاتێ، دەستی لێ هەڵشەقاندم. پەیتوونەکە چووە سەر شەقامەکە. کاترین دەستی خۆی بۆ تاقی ئێستگەوە ڕاکێشا. ئاوڕم دایەوە، چاوم بەدوو قەرەبینا لەشانەکان و تاقەکەوە کەوت، تێگەیشتم مەبەستی ئەوەبوو لەژێر باران نەوەستم، چوومە ژێر کەپەنگی تاقەکەوە. لەوێ وەستام. تەماشای پەیتوونەکەم کرد. تا لە سووچەکەوە وەرسووڕایەوە. ئینجا منیش بۆ ناو ئیستگە ڕۆیشتم، لەسەر پیادە ڕێیەکە بۆ لای شەمەندەفەرەکە چووم. کابرای دەرگەوان لەسەر شۆستییەکە وەستابوو، بەدوام دەگەڕا. بەدوای ئەوەوە چوومە ناو شەمەندەفەرەوە بەنێو خەڵکێکی زۆردا تێپەڕیم. تا لە دەرگایێ چوومە ژوورەوە. کابرای تۆپچی لە هۆبەیەکی پڕ خەڵک هەڵقونجابوو. هەگبەکەم و جۆڕکەکەم لەسەر ڕەفکەی تایبەت بەهەگبەوە لەسەر سەرییەوە داندرابوون. زۆر کەسی تر لە نێوان ڕاڕەوی ڤارگۆنەکەوە بەپێوە وەستابوون. پیاوانی ناو ڤارگۆنەکەش زەق زەق تەماشای ئێمەیان کرد، کاتێ هاتینە ژوورەوە. ژمارەی کورسییەکانی شەمەندەفەرەکە تێڕای ئەو حەشاماتەی ناو شەمەندەفەرەکەی نەدەکرد و هەموو کەس لەگەڵ یەک دوژمنانە بوون. تۆپچییەکە هەستایە سەرپێ تا لە شوێنەکەی دانیشم، یەکێ دەستی لەسەر شانم دانا. ڕووم تێ کرد و چاوێکم دایێ چیم دی؟! بینیم کاپتنێکی تەژەندەی تۆپچی. قەتماغەیێ لەسەر چەناگەکەیەوە بوو لە بەرامبەرم وەستا. تومەز کاتێ لە ڕاوەکەوە بووین، لە جامەکەوە، سەیری کردووە، دوایی هاتووتە ژوورەوە.

لێم پرسی: «فەرموو، چیت دەوێ؟»

کە خۆم سووڕاند و ڕووبەڕووی بووم لەمن کەڵەگەتتر بوو، دەموچاویشی لەژێر سێبەری کڵاوەکەی سیسی ڕەقەڵەبوو. قەتماغەکەش تازەبوو دەبریسکایەوە، هەموو خەڵکەکەی ئەوێ تەماشیان دەکردم.

– «ناتوانی وا بکەیت، ناتوانی سەربازێ ڕاسپێری شوێنت بۆ بگرێ.»





– «ئەوە وام کرد.»

تفی قوت دایەوە، گرێی قوڕقوڕاگەیم بینی، بەرز بووەوە، دوایی دابەزییەوە خوارەوە تۆپچیش لە پێش شوێنەکە ڕاوەستا، خەڵکی تریش لە جامەکەوە سەیریان کرد. هیچ کەسێکی ناو ڤارگۆنەکە لێوی نەبزاڤت و نقەی لێوە نەهات.

مافی ئەوەت نییە وا بکەی. دوو سەعات بەر لە هاتنی تۆوە لێرە وەستاوم.»

– «ئێستا چیت دەوێ؟»

– «کورسییەک.»

– «منیش وەکو تۆ کورسیم دەوێ.»

سەیری سەر و سیمایم کرد. توانیم هەست بەوە بکەم کە ئەو هەموانەی لەناو ڤارگۆنەکە دژی منن. گلەییم لێیان نەدەکرد. مافی خۆی بوو. بەڵام منیش کورسیم پێویستە. هیچ کەسێ نقەی لێوە نەهات «ئەی دۆزەخ» لەدڵی خۆمدا وام گوت.

ناچار گوتم: «دانیشە سپیورکابیتانۆ.»

تۆپچییەکە ڕێگای بۆ کاپتنی کەڵەگەت کردەوە. لە شوێنم دانیشت، سەیری منی کرد. ئاگر لە چاوی دەباری بەڵام هەرچۆنێ بێ کورسییەکەی گرت بەتۆپچییەکەم گوت: «شتەکانم بێنە.»

چووینە ڕاڕەوەکەوە. شەمەندەفەر جمەی دەهات. زانیم تازە جێگام دەست ناکەوێ. دە لیرەم دا بەهەریەکەیان. بەناو ڕاڕەوەکەوە ڕۆیشتن و دابەزینە خوارەوە. لەدەرەوە لەسەر شۆستەکە لەجامەکەوە سەیری ناوەوەیان دەکرد. هیچ شوێن نەبوو. دەرگەوان گوتی: «لەوانەشە ژمارەیەکی پتر لەوێ سواری شەمەندەفەربن.» تەوقەم لەگەڵ کردن و خواحافیزیم لێ کردن و ڕۆیشتن، بەڵام هەردووکیان هەستیان بەپەژارەیی کرد. کاتێ شەمەندەفەرەکە دەستی بەڕۆشتن کرد، ئێمە هەموومان لەناو ڕاڕەوەکەی شەمەندفەرەوە، ڕاوەستابووین سەیری گڵۆپەکانی ئێستگە و گۆڕەپانەکەم کرد، لەدەرەوەش باران بەردەوام بوو. زوو بەزوو پەنجەرەکان باراناوی بوون، ئیتر نەم دەتوانی دەرەوە ببینم. دوایی چار ناچار لەسەر عاردی ڕاڕەوەکەوە کەوتمە خەو. بەر لە خەوتن پارە و دەفتەری تێبینییەکانم لەناو گیرفانی کراس و پانتۆڵم دانا کە دەگەیشتە دەلینگم. بەدرێژایی شەو کەوتمە شیرین خەوەوە، کاتێ خەڵک لە (بریسکا) و (دڤیرۆنا) سواری شەمەندەفەر بوون بێدار بوومەوە. بەڵام هەندی بلێیی یەک و دوو لێکەوتمەوە خەو. سەرم بەجۆڕکێک کردبوو باسکیشم لەوی تر وەرینابوو. هەستم بەگرانی جۆڕکەکە دەکرد. هەر کەسێ بیویستبایە پێم لێ نەنێ، دەیتوانی بەسەرم پازی دابایە، خەڵکێکی زۆر بەدرێژایی ڕاڕەوەکەوە لەسەر عاردەکەوە نوستبوون، هەندێکی تریش خۆیان بەئاسنی پەنجەرەکەوە گرتبوو یان پاڵیان بەدەرگاوە دابوو. ئەم شەمەندەفەرە هەمیشە وا جەنجاڵ بوو.

# کتێبی سێیەم

## 25

لە پایزدا دارەکـان ڕووت بوون و ڕێگاکـانیش قـوڕاوی بوون. لە (ئۆدینەوە) بەسـواری لۆریێ بۆ (گوریزیا) کەوتمەڕێ. لۆرییەکانی تری سەر ڕێگاکەمان بەجێهێشت. سەیری پێـدەشـتی دەوروبەرم کـرد. دارتووەکـان ڕووت بـوونەوە کـێـڵگەکـانیش قـاوەیی بوون ڕێگاکە گـەڵای تەڕی وەریوی لەسـەر بوو کـە لە ڕیزەدارە ڕووتبـووەکـان هەڵوەریبـوون و ژمـارەیێ کـرێکاریشی لەسـەر بـوو. کە لە ڕێگاکـە کـاریان دەکـرد. جـێی تایەی سـەر ڕێگاکـەیان بەو پەلەبەردانە پڕ دەکـردەوە کـە لـە نێـوان دارەکـانی هەردوولای ڕێگاکـەوە قـۆمـەت کـرابوون. شـاری (گـوریزیا )مـان لێ بەدیارکـەوت. تەمـومـژ باڵی بەسـەردا کـێشـابوو، چیـاکـانیشی لەبەرچاوان ڕوون کـردبوو. لە ڕووبارەکـەوە پەڕینەوە ئاوەکـەی بەخوڕ دەڕۆیشت. لە چیاکاندا باران بوو. هاتینە ناوشار، بەلای کارگـەکـان تێپـەڕین، پاشـان بەخـانووەکـان و سـاخـتـمـانـەکـان. ژمارەی خـانووە پێکراوەکـان لە جـاران زۆرتر ببوون. لەشەقامێکی تەسکدا بەلای ئوتومبێلێکی فریاگوزاری خاچی سووری بەریتانی تێپـەڕین. شـوفـێـرەکە شـەپقـەیەکی لەسـەر نابـوو، دەمـوچاو سـیس و لەکـەداربوو. ئەوم نەدەناسی. لە گۆڕەپانێکی گەورە لەبەرامبەر خانووی مێجەری شار لە لۆرییەکە دابەزیمە خـوارەوە. شـوفـێـری لۆرییـەکـە جـانتـاکـەی پشـتـمی دایە دەسـتم و بەکـۆڵم دادا. دوو جۆرکەکەی تریش بەدەستەوە تەکە تەکی بوو ملم لەڕێ نا، ڤێلاکەمانم گرتەبەر. هەستم بەجۆشی بەرەوماڵ بوونەوە نەدەکرد. بەسەر ڕێگا چەورپێژەکەی ئۆردووگاوە شۆڕبوومەوە. لە نێـوان دارەکاندا سەیری ڤـێلاکەمـانم دەکرد. پەنجـەرەکانی هەمـوو داخرابوون، بەڵام دەرگاکەی لەسـەر پشت بوو چوومە ژوورەوە مێـجەرم بینی لەسەر مـێـزی ژوورێکی بێ کـەلوپەل، کـە نەخـشـە و بەیاننامـەی چاپکراوی لەسـەر دیـوارەکـانی هەڵواسـرابوو، دانیشتبوو.

گوتی: «ڕۆژ باش، چۆنی؟»

کابرا پیرتر و وشکتر دەهاتە بەر چاوم.

گوتم: «باشم، دەنگوباس چییە؟»

– «هەموو شتێ دوایی هات شتەکانت دابنێ و دانیشە.»

گورزەکەمم دانا و، دوو جۆرکەکەشم لەسەر زەوی دانا. شەپقەکەشم لەسەر گورزەکەم دانا، کورسییەکەی ترم لەلای دیوارەوە هێنا و لە نزیک مێزەکەوە لەسەری دانیشتم.

مێجەر پرسی: «هاو بێزار بوو، ئەرێ هاتوویتەوە سەرخۆت؟»

– «بەڵێ.»





– «ئاخۆ ئافەرینی ئازایەتیت وەرگرتووە؟»

– «بەڵێ... وەرم گرتوون. زۆر سوپاس.»

– «دەبا بیانبینم.»

زریزەی چاکـەتەکـەمم داکـێشـا، چاکـەتەکـەم وەلادا، تاتوانی هەردوو شـەریتـەکـە ببینی.

– «ئەی مەدالیات وەرگرتووە؟»

– «نەخێر، تەنیا فرمانەکەیم بەدەست گەیشتووە.»

– «مەدالیاکان دوایی دەگەنە دەستت. ماوەی دەوێ.»

– «چ خزمەتێکت هەیە ئەنجامی بدەم.»

– «ئوتومـبـیلەکـان هەمـوویان لەبەرەی جەنگن. شـەشـیـان لە باکوورن لە ناوچەی (کارپۆرتیون)ن، (کارپۆرتیون) پێدەزانی؟»

– «بەڵێ.»

هاتەوە بیرم. (کارپۆرتیون) شارێکی مەیلەو سپییە. کەوتۆتە دۆڵێکەوە. قوللەی زەنگی تێدایە. شارۆچکەیەکی خاوێنە و قەڵبەزەیەکی جوان لە گۆڕەپانەکەیدا هەیە.

– «لەوێ کار دەکەن. ژمارەیێ نەخۆشی لێیە. شەڕیش لەوێ کۆتایی هاتووە.»

– «ئەی ئوتومبیلەکانی تر لەکوێن؟»

–«دوو لەسـەر چیـاکـانن، چواریش هێـشـتـا لە (بێنێـزا) مـاونەتەوە دوو تیـپـی فریاگوزاری تریش لەگەڵ سوپای سێیەم لە (کارسۆن) کاردەکەن.»

– «هیچ فەرمایشتێکت هەیە ئەنجامی بدەم؟»

– «گـەر ئارەزووت لێـیە دەتوانی بچیت چوار ئوتومـبـیلەکەی (بێنێـزا) وەربگریت. (گینۆ) ماوەیەکی زۆرە لەوێیە. تۆش ئەو ناوچەیەت نەدیوە. دیوتە؟»

– «نەخێر، نەم دیوە.»

– «ناوچەیەکی تووشە، سێ ئوتوموبیلمان لەوێ لێ فەوتاوە.»

– «ئەوەم زانیوە.»

– «بەڵێ. ڕینالدی بۆی نوسیبووی.»

– «ئەی ڕینالدی لە کوێیە؟»

– «لێرە، لە نەخۆشخانەیە، هاوین هات و پایز چوو ئەو هەر لێرە بووە.»

– «پێت باوەڕ دەکەم.»

– «بارودۆخ زۆر ناخۆش بوو، لەوانە ڕادەی تووشی و ناخۆشییـەکەی باوەڕ ناکەی، وا هەست دەکەم تۆ بەختت هەبوو کە لەوێ بریندار کرای.»

- «دەزانم. بەختم هەبوو.»

- «ساڵی ئایندە، تووشتر دەبێ، لەوانەیە هەر ئێستا هێرش بێنن. بڕیاری ئەوەیان داوە کە هێرش دەست پێبکەن. بەڵام باوەڕ ناکەم. وەختێ ئەوە بەسەر چووە، ڕووبارەکەت بینی چۆن بوو؟»

- «بەڵێ، زیادی کردبوو.»

- «باوەڕناکەم لەو ناوەختەدا هێرش بەرن. باران دەستی پێکردووە بەفریش هەر بباری دەبارێ. ئادەی شتێکم دەربارەی هاوولاتییە ئەمریکییەکانتم پێ بڵێ. ئاخۆ دەبێ کەسی ئەمریکی تری وەکو تۆمان لەگەڵ کار بکا؟»

- «سوپایەکی ئەمریکی دە ملیۆنی مەشق دەدەن.»

- «بەو هیوایەم هەندێکمان لەوانە بەرکەوێ. بەڵام فەرەنسا هەمووی دەکا هیچی بەر ئێمە ناکەوێ. باشە، تۆ ئەمشەو لێرە دەمینێی بەیانی لەگەڵ ئوتومبیلێکی بچووک بچۆ (گینۆ) بنێرەوە. یەکێکی شارەزای ڕێگاکەت لەگەڵ دەنێرم. (گینۆ) هەموو شتێکت پێ دەڵێ. هەرچەندە ناوبەناویش تاکوتەرا تۆپ دەهاوێشترێن. بەڵام شەڕ کۆتایی هاتووە. تۆش حەزدەکەی (بانیسێنزا) ببینی؟»

- «خۆشحاڵم بەدیتنی (بانیسێنزا) و شادمانم بەگەڕانەوەم بۆ لای جەنابت، مایگێڕۆ.»

بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی: «لە چاکە و لوتفی خۆتە، ئەوەی ڕاستی بێ لەم شەڕە بێزار بوومە. گەر دوورکەومەوە هەرگیز باوەڕناکەم بگەڕێمەوە.»

- «بارودۆخ بەو ڕادەیە بەدە؟»

- «بەڵێ ئەوەندە خراپە و پتریش، بڕۆ سەرکەوە خۆت بشۆ، ڕینالدی هاوڕێت بدۆزەوە.»

چوومە دەرەوە و جانتاکانم هەڵگرت و بەپێپلکە سەرکەوتم. ڕینالدی لە ژوورەوە نەبوو، بەڵام شتەکانی لەوێ بوون. منیش لەسەر قەروێڵە دانیشتم، بەلەکپێچەکەم کردەوە و پێڵاوی ڕاستەمم لەبەرکردەوە، پاشان لەسەر گازی پشتێ لەسەر قەروێڵەکە لێ پاڵکەوتم. ماندووبووم، پێی ڕاستەمم بەئازار بوو، پاڵکەوتنم لەسەر جێگە بەتاکە پێڵاوەکەوە شتێکی ناشرین بوو. بۆیە هەستامەوە قەیتانی تاکی چەپیشم شل کردەوە، پێڵاوەکەم فڕێدایە سەر زەوی. پاشان لەسەر پەتۆکە جارێکی تر پاڵکەوتمەوە. هەوای ژوورەکە لەبەر داخرانی پەنجەرەوە بۆگنخاو ببوو. بەڵام لەبەر شەکەتی توانای هەستان و کردنەوەیم نەبوو شتەکانم هەموو لە قوژبنێکی ژوورەکەوە دانرابوون. تاریکی باڵی بەسەر دەرەوە داکێشابوو، لەنێو جێگە پاڵکەوتم و کەوتمە بیرکردنەوە لە (کاترین). چاوەڕێی ڕینالدی بووم. خۆم وام دانابوو کە شەو بەر لە نوستن نەبێ، بیر لە (کاترین) نەکەمەوە. بەڵام لەبەرئەوەی زۆر ماندوو بووم و هیچ شتێ نەبوو خۆمی پێوە خەریک





بکەم. بۆیە هەر لەسەر قەروێڵە ڕاکشان و بیرکردنەوەم یەک بوو. کە (ڕینالدی) بەژوورکەوت بیرم لە (کاترین) دەکردەوە، ڕینالدی هەروەکو خۆی مابووەوە. بەڵام کەمێ لاواز ببوو.

ڕینالدی گوتی: «باشە. ڕۆڵە»

لەسەر جێگە هەڵسامەوە. بەرەو لام هات. لەسەر قەروێڵە دانیشت و دەستی لەملم کرد، گوتی: «پیرەکۆر، باسەیرێکی چۆکت بکەم.»

شەپێکی توندی لە پشتم دا، منیش دەستەکانیم گرت.

گوتم: «دەبێ پانتۆڵەکەم لەبەر بکەمەوە.»

- «ڕۆڵە لەبەری بکەوە، ئێمە هەموو لێرە برادەری یەکترین. دەمەوێ بزانم چ ئیشێکیان بۆت کردووە.»

هەستامەوە سەرپێ پانتۆڵەکەمم لەبەرکردەوە، شاشی سەربرینەکەم کردەوە. ڕینالدی لەسەر زەوییەکە دانیشت، چۆکمی بۆ پاش و پێش چەماندەوە پەنجەکانی زۆر بەخێرایی بەسەر قەتماغەکەدا برد، ئینجا بەپەنجە گەورەکانی هەردوو دەستی، کڵاوەی ئەژنۆمی بەهێواشی جوولاندەوە.

- «هەر ئەوەندە دەچەمێتەوە؟»

- «بەڵێ.»

- «تاوانە تۆ ڕەوانەی جەنگ دەکەنەوە، دەبوایە بەتەواوی بچەمابایەوە.»

- «لە پێشتر زۆر چاکترە، جاران ڕەق بوو وەک تەختەدار وابوو.»

ڕینالدی قاچمی زیاتر چەماندەوە. منیش تەماشای دەستەکانیم دەکرد، دەستێکی نژدارانەی چاپووکی هەبوو. تەماشای تەوقی سەریم کرد، پرچی دەدرەوشایەوە. بەچاکی شانەی کردبوو. ئەمجارە قاچمی یەگجار چەماندەوە.

گوتم: «ئۆخ!.»

گوتی: «دەبوایە بەئامێر زیاتر چارەسەری کرابایە.»

- «لەجاران چاکترە.»

- «ئەوە دەزانم، ئەوە شتێکە، من لەتۆ زیاتری لێ دەزانم.»

هەستایە سەرپێ لەسەر تەختەکە دانیشت.

خەریکی تەواو بوون بوو گوتی:

- «چۆکت ئێشەکەی پوختەیە. دەربارەی هەموو شتێ قسەم بۆ بکە.»

- «هیچ شتێ نییە باسی بکەم. ڕۆژگارێکی خامۆشم بردەسەر.»

- «وەکو پیاوێکی ژندار دەجوولێیتەوە. چییە؟»

ڕینالدی دەستی لە ئەژنۆی خۆی وەرێنا.

- «ئەم شەڕە دەمکوژێ. ئەم شەڕە غەمباری کردووم.»

- «گوتم: «ئاه.»

- «مەسەلە چییە؟ بۆچی نابێ هەست و نەستێکی مرۆڤایەتیم هەبێ؟»

- «نەخێر، دەتوانم، دەتوانم ڕەنگوڕووی خۆشیت لێ بەدی بکەم، ئادەی پێم بڵێ؟.»

- «بەدرێژایی هاوین و پایز نەشتەرگەریم کردووە. لە ئیشدا بوومە. ئیشی هەموو کەسێکم ڕاپەڕاندووە. بەخوا ڕۆڵە، هەر ئەوەندەت زانی بووم بەنژدارێکی بەناوبانگ.»

- «ئەوەم بەدڵە.»

- «قەت بیرناکەمەوە. نەخێر، بەخوا بیرناکەمەوە. تەنیا ئیشی نەشتەرگەری دەکەم.»

- «ئەمە ڕاستە.»

- «بەڵام ئێستا ڕۆڵە وا هەموو شتێ دوایی هات. نەشتەرگەری ناکەم ئەمەیە تەنگی پێ هەڵچنیوم و بێزاری کردووم. شەڕێکی ترسناکە. باوەڕم پێ بکە. ئێستا تۆ ورەی منت بەرز کردۆتەوە. ئاخۆ ئەو قەوانەی پێم ڕاسپاردبووی بۆت هێناوم.»

- «بەڵێ.»

قەوانەکان بەقاقەز پێچرابوون لەناو کارتۆنی ناو هەگبەکەم دانابوون. بەڵام زۆر شەکەت بووم توانای دەرهێنانیانم نەبوو.

- «ئەی تۆ ڕۆڵە هەست بەخۆشی ناکەی؟»

- «هەست بەدۆزەخ دەکەم.»

ڕینالدی: «ئەم شەڕە زۆر سامناکە. وەرە ژوورەوە. با هەردووکمان خۆمان مەست و سەرخۆش کەین و کەیفخۆش بین، ناخۆشی لە مێشکمان دوورخەینەوە، ئەوکات هەست بەخۆشی دەکەین.»

- «نەخۆشی زەرتکم هەیە ناتوانم بخۆمەوە.»

- «ئۆه، ڕۆڵە تۆ چۆن بۆم گەڕایتەوە. بەماندی و جگەرێکی نەخۆشەوە بۆم گەڕایتەوە. وا پێت دەڵێم ئەم شەڕە شتێکی بەد و خراپە کەوابێ لەبەرچی ئەم شەڕەمان هەڵگیرساند؟»

- «پێکێ دەخۆینەوە. نامەوێ سەرخۆش بم. بەڵام پێکێ دەخۆینەوە.»

ڕینالدی بەرەو لای مێزی دەستشۆر چوو، دوو پەرداخ و قاپێ کۆنیاکی هێنا.

- «کۆنیاکی نەمساوییە. نیشانەی حەوت ئەستێرەیە. ئەوە تاقە شتێکە لە (سان گبریل) دەستیان بەسەردا گرتبێ.»

- «لەوێ بووی؟»

- «نەخێر، لێرە بترازێ پێم بەهیچ شوێنێ نەکەوتووە. هەر لێرە بوومە و ئیشی





نەشتەرگەریم کردووە. سەیرکە ڕۆڵە ئەمە قالکی کۆنە فلچەی ددانتە. هەڵمگرتووە تا یادی تۆی پێ بکەمەوە.»

- «تا وەبیرت بێتەوە ددانت بشۆی.»

- «نەخێر، هی خۆشم لایە. بۆیە هەڵمگرتووە تا بەیانیانت بهێنمەوە یادم کە هەوڵت دەدا پاشماوەی (ڤیلارۆزا) لەسەر ددانەکانت لابەریت کە سوێندت دەخوارد و ئەسپیرینت قووت دەدا جنێوت بەسۆزانییەکان دەدا هەر کاتێ ئەم قالکە دەبینم ئەوەم دێتەوە یاد کە هەوڵت دەدا ویژدانی خۆت بەفلچەی ددان پاکژ کەیتەوە.»

ڕینالدی بۆ لای تەختەکەم هات و گوتی: «ماچێکم بکە، پێم بڵێ بەڕاستیت نەبووە.»

- «ماچت ناکەم. تۆ مەیموونی.»

- «دەزانم، تۆ خورتێکی ئەنگلۆسەکسۆنی باشی. چاک دەزانم، دەزانم تۆ کوڕێکی پەشیمان بۆوەی. دەبێ چاوەڕێ کەم تا بەچاوی خۆم ببینم کە ئەنگلۆسەکسۆنی بەفلچەی ددان سۆزانێ دوور دەخاتەوە.»

- «کەمێ کۆنیاک لە پەرداخەکە بکە.»

پەرداخەکانمان لێکدا و خواردمانەوە، ڕینالدی پێم پێکەنی و گوتی: «سەرخۆشت دەکەم، جگەرت دەردێنم، جگەرێکی ئیتاڵی باشت لە جیاتی بۆ دادەنێم. جارێکی تر دەتکەمەوە پیاو.»

پەرداخەکەم بەکەمێ کۆنیاکەوە هەڵگرت و چوومە لای پەنجەرەوە، دەرەوە تاریک ببوو. پەنجەرەکەم کردەوە باران وەستابوو، دەرەوەش سارد ببوو، تەمومژ سەر درەختەکانی داپۆشیبوو.

ڕینالدی گوتی: «نەکەی کۆنیاکەکە لە پەنجەرەکەوە فڕێ دەیتە دەرەوە گەر توانای فڕکردنیت نییە بیدەرەوە خۆم.»

- «خەریکی ئیشی خۆت بە.»

بەدیتنی ڕینالدی خۆشحاڵ بووم. دووساڵی ڕەبەقی بەگاڵتەوگەپ لەگەڵم بردە سەر. گاڵەکانیم بەدڵ بوو. هەردووکمان چاک لەیەکتری تێدەگەیشتین.

لەسەر تەختەکەوە پرسی: «ژنت هێناوە؟»

پشتی خۆمم بەدیوارەکەوە دابوو لە نزیک پەنجەرەکەوە ڕاوەستابووم، گوتم: «نەخێر هێشتا نەم هێناوە.»

- «ئایا کەوتوویتە داوی خۆشەویستییەوە؟»

- «بەڵێ»،

- «لەگەڵ کچە ئینگلیزەکە؟»

- «بەڵێ.»
- «ئەی ڕۆڵە، باشە ئەو لەگەڵت دەگونجێ؟»
- «هەڵبەت.»
- «مەبەستم ئەوەیە: ئاخۆ ئەو بەشێوەیەکی پراکتیکی لەگەڵت دەگونجێ؟»
- «بێدەنگ بە قسەی وا مەکە.»
- «قسەی واناکەم، بەڵام دوایی خۆت دەبینی کە من پیاوێکی لەوپەڕی نیانی دام. ئاخۆ ئەویش...؟»

گوتم: «ڕێنین. تکایە قسەی وا مەکە. ئەگەر دەتەوێ ببیتە برادەرم بێدەنگ بە.»

- «نامەوێ ببم بەبرادەرت چونکە هاوڕێتم.»
- «کەوابێ بێدەنگ بە.»
- «زۆر باشە»

چوومە سەر تەختەکە، لە تەنیشتی دانیشتم، ڕینالدی پەرداخەکەی بەدەستەوە گرتبوو. چاوی بڕیبوونە زەوی.

- «تێگەیشتی ڕینالدی. وانییە؟»
- «ئۆ، بەڵێ، بەدرێژایی ژیانم سەرپێچی مەسەلە پیرۆزەکانم کردووە، بەڵام لەگەڵ تۆ بەدەگمەن وا گونجاوە وام کردبێ. لەو باوەڕەش دام کە تۆش کەمێ لەو مەسەلانەت لا هەیە.»

دووبارە چاوی لە عاردی بڕینەوە.

- «ئەی تۆش ئەو مەسەلانەت لا نییە؟»
- «نەخێر.»
- «هەرگیز.»
- «نەخێر.»
- «ئاخۆ من دەتوانم ئەم قسانە بەدایک و خوشکت بڵێم؟»

ڕینالدی بەگوڕ گوتی: «بە خوشکەکەت بڵێم؟[1]»

هەردووکمان دامانە قاقای پێکەنین.

گوتم: «ئەی پیرە سوبیرمان.»

ڕینالدی گوتی: «من ئیرەییت پێ دەبەم»

- «نەخێر، تۆ وانی.»
- «مەبەستم ئیرە نییە. مەبەستم شتی ترە. تۆ هیچ برادەرێکت هەیە ژنی هێنابێ.»

(١) مەبەست لە خوشکەکەت: کاترینە.





گوتم: «بەڵێ.»

ڕینالدی: «نەبرادەرم هەیە ژنی هێنابێ، وە نەبرادەرم هەیە کەوتبێتە داوی خۆشەویستییەوە.»

- «لەبەرچی نیتە.»
- «منیان خۆش ناوێ.»
- «لەبەرچی؟»
- «من مارم، ماری بیر و هۆشم.»
- «تێکەڵ و پێکەڵت کرد. سێو نیشانەی بیر و هۆشە.»
- «نەخێر مار نیشانەی بیر و هۆشە.»

ئەو زیاتر کەیفخۆش بوو.

گوتم: «تۆ لەوکاتەدا چاکتری کەوا قووڵ بیر ناکەیتەوە.»

گوتی: «تۆم خۆشدەوێ، نەزان، بەڵام کاتێ من دەبم بەزانایەکی ئیتالی مەزن، تۆ عەیبت؟! لە قسەکانم دەبینییەوە. زۆر شت دەزانم بەڵام ناتوانم بیان درکێم. زۆر لە تۆ زیاتر دەزانم.»

- «بەڵێ ئەمە ڕاستە.»
- «بەڵام کاتێکی خۆشتر دەبێ. هەتا لەکاتی پەشیمانیش کاتێکی خۆشتر دەبێ.»
- «بەو نزایە ناڵێم ئامین.»
- «ئا، بەڵێ، ئەمە ڕاستە. من تەنیا لەوکاتەدا کەیفخۆشم کە کاردەکەم.»

ئەمەی گوت و دیسان چاوی لە عاردی بڕینەوە.

- «بەسەر ئەمە زاڵ دەبی.»
- «نەخێر، من حەز لە دوو شتی تریش دەکەم. یەکێکیان زیانی بۆ کارەکەم هەیە، ئەوی تریشیان لەماوەی نیو سەعات یا پازدە دەقەیێ، هەندێ جار لەو ماوەیە بەکەمتریش تەواو دەبێ.»
- «لەوانەیە چاکتر بووبم. ڕۆڵە. تۆ نازانی بەڵام تەنیا ئەم دوو شتە و ئیشەکەمم هەیە.»
- «لەوانەیە شتی تازەش بەدەست بێنی.»
- «نەخێر، هەرگیز شتی تر بەدەست ناهێنی. ئێمە بەو هەموو شتانەی هەمانە لەدایک بووین، هەرگیز فێرنابین هیچ شتی نوێش بەدەست ناهێنین. ئێمە هەموومان بەتەواوی دەستمان پێکردووە، دەبێ بەوە کەیفخۆش بین ک لاتینی نەبووین.»
- «شتێکی وانییە ناوی لاتینی بێ. ئەوە بیرکردنەوەیەکی لاتینیانەیە. تۆ زۆر

شانازی بەکەموکوڕییەکانت دەکەی.»

ڕینالدی سەری بەرزکردەوە و پێکەنی: «دەبێ لە قسەکردن بوەستین، ئەوەندەی بیر بکەمەوە ماندوو و شەکەت بووم.»

ڕینالدی کە هاتە ژوورەوە پێدەچوو ماندووبێ.

– «کاتی نانخواردن هاتووە. دڵشادم بەگەڕانەوەت، تۆ باشترین هاوڕێی منی، برای هاوسەنگەری منی.»

پرسیم: «ئەی کەی بەیانی برایانی هاوسەنگەر نان دەخۆن؟»

– «هەر ئێستا، بەڵام بۆ خاتری جگەرت پێکێکی تر دەنۆشین.»

– «وەکو حەزرەتی پۆلیس.»

– «لەمەڕ ئەمەوە زۆر ورد نیت. ئەمە شتێک بوو پەیوەندی بەگەدە و مەیەوە هەبووە. کەمێ مەی لە پێناوی گەدەت بنۆشە.»

گوتم: «ئەوەی لەناو بوتڵەکەدا بمێنێ لەچاوی هەر شتێکی تۆ بیلێی دەینۆشم.»

ڕینالدی پەرداخەکەی بەرزکردەوە و گوتی: «لە چاوی کچە دۆستەکەت.»

– «زۆر باشە»،

– «لەمەودوا هەرگیز قسەی خراپ بەلایەنی ئەوەوە ناکەم.»

– «زۆر لە خۆت مەکە.»

کۆنیاکی ناو بوتڵەکەی خواردەوە، گوتی:

– «من دڵپاکم، وەکو تۆم، منیش کچێکی ئینگلیزی بۆ خۆم دەدۆزمەوە،. لەڕاستیدا من بەر لە تۆ دەزگیرانەکەتم ناسیوە. بەڵام کەمێ بۆ من درێژە. ئەوەندە درێژە بەخوشکم دەشێ.»

گوتم: «تۆ زەینێکی سافت هەیە.»

– «ئەی وانییە؟ هەر لەبەر ئەوەشە پێم دەڵێن ڕینالدی (پورسیمۆ)[1].»

– «ڕینالدۆی سپورسیمو[2].»

– «دەنا تا زەینم سافە با بۆ نانخواردن بچینە خوارەوە.»

دەموچاوم شوشت و پرچم شانەکرد و بەپێپیلکە چووینە خوارەوە.

ڕینالدی کەمێ سەرخۆش بوو، لە ژوورەوە نانمان خوارد. خواردنەکەش باش ئامادە نەبووبوو.

ڕینالدی گوتی: «دەچم قاپێ دێنم.»

(١) پورسیمۆ: واتە زەین ساف.

(٢) گاڵتەباز.





بەسەر پێپیلکە کەوت و منیش لەسەر مێزەکە دانیشتم گەڕایەوە بوتڵێکی هێنا. بۆ هەر یەکێشمان نیوەی پەرداخی تێ کرد. پەرداخەکەم بەرزکردەوە دامەبەر ڕووناکی چرایەکەی سەر مێزەکە و گوتم:

– «ئەوەندە زۆرە.»

– «نە ء بۆ گەدەیەکی بەتاڵ زۆر نییە. ئەوە شتێکی چاکە، ئەمە گەدە بەتەواوی دەسووتێنێ. هیچ شتێ لەمە خراپتر نییە بۆ تۆ.»

– «زۆر باشە.»

– «ڕۆژ بەڕۆژ پیاو دادەڕزێنێ. گەدە تێکدەدا و دەست لەرزۆک دەکا، نۆداریش ئەمەی پێویستە.»

– «ئاوا ڕێم نیشان دەدەی؟»

– «ئی دڵیمە. لەوە زیاتر ناخۆمەوە. ئەوە نۆش بکە. ڕۆڵە چاوەڕێی بەم زووانە نەخۆش بکەوی.»

نیو بەرداخم خواردەوە، گوێم لەدەنگێ بوو، خزمەتکارەکە بوو، لە هۆڵەکەوە هاواری کرد: «شۆربا، شۆربا ئامادەیە.»

مێجەر هاتە ژوورەوە. سەری بۆ لەقاندین و دانیشت. لە پشت مێزەکەوە زۆر بچووک دیاربوو.

مێجەر پرسی: «ئێمە هەر ئەوەندەین؟»

خزمەتکارەکە مەنجەڵی شۆربای داگرتە خوارەوە. قاپەکانمانی بەئەسکو پڕ کرد.

ڕینالدی گوتی: «هەر ئەوەندەین. تەنیا قەشەیێ نەبێ. گەر بزانێ (فیدریکو) لێرەیە ئەویش دێتە ئێرە.»

پرسیم: «ئەو لە کوێیە؟»

– «لە ڕەبیەی ژمارە ٣٠٧. لەو باوەڕەم ئێستا دێ تەلەفۆنم بۆ کردن پێیانم گوت، پێی بڵێن تۆ هاتوویتەوە.»

مێجەر لەگەڵ شۆرباکە خەریک بوو، دەم و لووتی سڕییەوە. داوی سمێڵە قیت بووەکەشی بەوردی سڕینەوە.

گوتم: «دەڵێی هەرا و بەزمی چێشتخانە کۆنەکەمان نەماوە.»

مێجەر گوتی: «بەڵێ ئیمڕۆ هێمنە.»

ڕینالدی گوتی: «من دەبمە فتنەچی.»

مێجەر گوتی: «ئیرینکۆ، هەندێ مەی بخۆرەوە.»

پەرداخەکەمی پڕ کرد. (سپاغانی)یان بۆ هێنایین. بەخواردنەوەیەوە خەریک بووین. کاتێ قەشە وەژوورکەوت سپاغانێمان تەواو کردبوو. قەشە هەمان سیمای جارانی

مابوو بچووک و ئەسمەر و تێکچەقیو بوو. هەستامە سەرپێ تەوقەم لەگەڵ کرد. دەستەکەی تری لەسەر شانم دانا.

گوتی: «هەر کە زانیم گەڕاویەتەوە، یەکسەر هاتم.»

مێجەر گوتی: «دانیشە، تۆ دواکەوتی.»

ڕینالدی گوتی: «ئێوارە باش قەشەکەمان.»

وشەی قەشەی بەئینگلیزی گوت. ئەمە خودی کاپتن بوو، پەلار و توانجی لە قەشەی دەگرت و سەگە ئینگلیزییەکی دەزانی. قەشە گوتی: «ئێوارە باش ڕینالدۆ.»

خزمەتکارەکە شۆربای بۆ هێنا، بەڵام قەشە دڵی سپاغانی دەویست. لێی پرسیم: «تۆ چۆنی؟»

گوتم: «باشم، کاروبار لە چ حاڵە؟»

ڕینالدی: «کەمێ مەی بخۆرەوە. ئەی قەشە، کەمێ مەی بۆ گەدەت بنۆشە. خۆت دەزانی ئەمە نەریتی حەزرەتی پۆلیسە.»

قەشە بەڕەوشت بەرزییەوە وەڵامی دایەوە گوتی: «بەڵێ، دەزانم.»

ڕینالدی پەرداخەکەی پڕ کردەوە و گوتی:

«ئەم قەشە پۆلیسە، سەرچاوەی هەموو ناخۆشی و ناهەموارییێکە.» قەشە سەیری کردم و زەردەخەنەیەکی گرت، توانیم لە خولقی قەشە ئەوە دەستنیشان بکەم، کە پەلار و توانجی ڕینالدی هێشتا نەگەیشتووتە ئێسقانی.

ڕینالدی بەردەوام بوو گوتی: «ئەم قەشەیە پۆلیسە، ئارەقخۆر و خوێڕییەکی بەرەڵا بوو، کاتێ سارد بووەوە گوتی: «بێ سوودە هەر کە لێیش بۆوە یاسای بۆ ئێمەی سەرگەرم دانا، ڕاست ناکەم (فریدریکۆ)؟»

مێجەر زەردەخەنەیەکی گرت. ئێمە ئێستا دەستمان بەخواردنی گۆشت کردبوو، گوتم:

– «کە شەو دادێ سێ و دوویی لە ئیشی قەشان ناکەم.»

قەشە سەری لەسەر قاپەکەی خۆی بەرزکردەوە و سەیری منی کرد و بزەیەکی هاتێ.

ڕینالدی گوتی: «سەیرکە، ئا ئەوەتا بووە لایەنگیری قەشە. کوا ئەو کۆنە برادەرە باشانەی پەلاریان لە قەشە دەدا؟ کوا (کالڤاکانتی) کوا (برۆندی)؟ (سیزار) لە کوێیە؟ خۆ بۆ من نەهاتووە هەر بەتەنیا بێ لایەنگیر پەلار لە قەشە بدەم.»

مێجەر گوتی: «قەشەیەکی باشە.»

– «قەشەیەکی باشە، هەر چۆنێ بێ ئەو قەشەیە. دەمەوێ تیپەکەمان بگەڕێنمەوە سەر جارانی پێشووی. دەمەوێ (فریدریکۆ) کەیفخۆش کەم. هەی بۆ جەهەننەم بچیت قەشە.»

مێجەر سەیری قەشەی کرد. زانیم. سەرخۆش بوو سیما لەڕ و لاوازەکەی سپی





هەڵگەڕابوو. خەتی پرچی سەری لەچاو سپیایی نێوچەوانی زۆر ڕەش بوو.

قەشە گوتی: «باوابێ، ڕینالدی، باوابێ.»

ڕینالدی: «بۆ دۆزەخ بچیت. بۆ دۆزەخ بچیت ئەم ئیشە نەفرەت لێکراوەت.»

ڕینالدی پشتی بەکورسییەکەدا.

مێجەر گوتی: «مەی کارێکی تێ کردووە، ماندووە.»

گۆشتەکەی خۆی تەواوکرد و گۆشتاوەکەشی بە لەتەنانێ سڕییەوە.

ڕینالدی بەئەوانەی سەر خوانەکەی گوت:

– «گوێم پێ ناچێ. بڕۆ دۆزەخ لەگەڵ گشت ئیشەکانت.»

قەشە گوتی: «دەبێت مۆڵەت وەربگری.»

مێجەر سەری خۆی لێ لەقاند، ڕینالدی سەیری قەشەی کرد.

گوتی: «لەو باوەڕەی کە دەبێ مۆڵەت وەربگرم؟»

قەشە گوتی:– «بە ئارەزووی خۆت بکە. گەر ئارەزووت لێیە وەری مەگرە.»

– «بۆ دۆزەخ بچیت. ئەوان دەیانەوێ لە کۆڵم بکەنەوە و لەدەست من ڕزگارت ببێ. هەموو شەو هەوڵ دەدەن خۆیان لە دەستم ڕزگار بکەن لەگەڵ هەموویان بەشەڕ دێم. چ دەبێ گەر مۆڵەت وەرگرم، هەموو کەسێ مۆڵەتی هەیە. جیهان هەمووی مۆڵەت وەردەگرێ ئەمە لەلایێ» لە قسەکانی بەردەوام بوو شێوەی وانەبێژێک دەیگوتەوە: «ئەمە زیبکەیەکی بچووکە، پاشان تێبینی پەیدابوونی لیرێک لە نێوان هەردوو شانەکانتا دەکەین، دوایی هیچ شتی تر تێبینی ناکەین. لە دواییدا باوەڕمان دەخەینەوە ناو جێوە.»

مێجەری لە قسەی کرد و گوتی: «یا لەناو سالفارسانی...» ڕینالدی ئێستاکە زۆر کەیفخۆش بوو، گوتی: «دەبێ بەرهەمێکی جیوە بێ. سەرەدەرێکی لێ دەکەم، ئەی پیرە قەشەی دڵساف مەترسە، هەرگیز تووشی ئەمە نابێ، منداڵ تووشی، ئەمە ڕووداوێکی پیشەسازییە ڕووداوێکی ساکاری پیشەسازییە.»

خزمەتکارەکە شیرینی و قاوەی هێنا، ئەم شیرینیەی هێنای چەشنێ بوو. لە پەپەی نانی ڕەش ساسی پەیت. چراکە دووکەڵی دەکرد. دووکەڵی ڕەش لەناو لالەکەوە بەرز دەبووەوە.

مێجەر بەخزمەتکارەکەی گوت: «دوو مۆم بێنە ئەم چرایە ببە دەرەوە.»

خزمەتکارەکە دوو مۆمی داگیرساوی لەناو دوو ژێر پیاڵەوە هێنا، چرایەکی بردە دەرەوە و کوژاندییەوە. ڕینالدی کپ بوو. پێدەچوو تۆزێ باش بووبێ. قسەمان کرد. پاش قاوە خواردنەوە هەموومان چووینە دەرەوە بۆ هۆڵەکە چووین.

ڕینالدی گوتی: «تۆ دەتەوێ قسە لەگەڵ قەشە بکەین بەڵام من دەبێ بچم بۆ شار.

شەو شاد قەشە.»

قەشە گوتی: «شەو باش ڕینالدۆ.»

ڕینالدی گوتی: «یەکتر دەبینینەوە، فریدی؟»

گوتم: «بەڵێ، زوو وەرەوە.»

ڕووی تێکردم و لەدەرگا چووە دەرەوە، مێجەر لەگەڵ ئێمە وەستابوو. گوتی: «لەگەڵ ئیشکردن زۆر ماندووە. لەو باوەڕەدایە کە تووشی نەخۆشی ئاتەشەک بووە. من باوەڕناکەم. خۆ لەوانەشە وابێ ئەو بەداوودەرمانی ئەم نەخۆشییە چارەسەری خۆی دەکا، شەو شاد ئیرنیکۆ تۆ بەر لە گزنگدان ئۆغر دەکەی، وانییە ئیرنیکۆ؟»

– «بەڵێ.»

گوتی: «کەوابێ خواحافیز. بەختێکی باش. (پیدۆز) خەبەرت دەکاتەوە لەگەڵت دێ.»

– «خواحافیز، دەربارەی هێرشی نەمساوییەکان قسە دەکەن بەڵام من باوەڕ ناکەم، هیوادارم ئەم هێرشە نەکرێ. بەڵام هەرچۆنێ بێ لێرە نابێ. (گینۆ) هەموو شتێکت پێدەڵێ، تەلەفۆنەکەش ئێستا زۆر باش کاردەکا.»

– «منیش بە ڕێکی تەلەفۆنت بۆ دەکەم.»

– «جێی خۆیەتی. شەو شاد. ڕێگەی ڕینالدی نەدەی زیاتر براندی بخواتەوە.»

– «هەوڵ دەدەم نەخواتەوە.»

– «شەو شاد قەشە.»

– «شەو شادتر، سیگنۆر مایکۆر.»

چووە نووسینگەی خۆی.

## 26

چوومە لای دەرگا، سەیری دەرەوەم کرد، باران نەدەباری. بەڵام تەمومژ بوو. بەقەشەم گوت: «بچینە سەرەوە؟»

– «دەتوانم کەمێک بمێنمەوە.»

– «دەبا بچینە سەرەوە.»

بەپێپلکە سەرکەوتین و چووینە ژوورەکەم. لەسەر تەختەکەی ڕینالدی پاڵکەوتم و قەشەش لەسەر تەختەکەم دانیشت. کە خزمەتکارەکەم ڕێکی خستبوو، ژوورەکە تاریک ببوو.

پرسی: «بەڕاست پێم بڵێ چۆنیت؟»





گوتم: «زۆر باشم، بەڵام ئەمشەو ماندوومە.»

– «منیش ماندوومە، بەڵام بەبێ هۆ.»

– «ئەی دەربارەی شەڕەوە چی دەڵێیت؟»

– «بەمەزندەم بەم زووانە تەواو دەبێ، نازانم لەبەرچی. بەڵام وا هەست دەکەم.»

– «چۆن وا هەست دەکەی؟»

– «خۆ دەزانی مێجەرت چۆنە؟! دڵنەرمە؟ زۆر خەڵکی تریش ئێستا وەک ئەو دڵنەرم بووینە.»

گوتم: «من ئەوە لەخۆم هەست پێدەکەم.»

قەشە گوتی: «هاوینێکی ناهەموار و ترسناک بوو.»

ئەو لەو ڕۆژەی سەفەرم کرد زۆر زیاتر لە ئێستاکە بڕوا بەخۆ و ورە بەرزتر بوو.

– «ڕەنگە باوەڕنەکەی ئەم هاوینە چ هاوینێ بووە، مەگەر هەر خۆت لێرە بوای بتزانیبایە چۆن بووە!. زۆر کەس لەم هاوینەدا لە ڕاستی ئەم شەڕە گەیشتوون، ئەو ئەفسەرانەی کە هەرگیز باوەڕم نەدەکرد لەم شەڕە بگەن، ئێستاکە تێگەیشتوون.»

– «بەڕای تۆ چ دەبێت؟»

ئەمەم گوت و چەند شەپەیەکم لە پەتۆکەی ژێرمەوە هێنا.

گوتی: «نازانم، بەڵام لەو باوەڕەم کە چیتر درێژە نەکێشێ.»

– «دەبێ چ ڕوو بدا؟»

– «شەڕ دەوەستێنن.»

– «کێ؟»

– «هەردوو لا.»

گوتم: «ئاواتەخوازم وابێت.»

– «باوەڕ ناکەیت؟»

– «باوەڕ ناکەم هەردوو لا پێکڕا شەڕ ڕاگرن.»

– «خۆ منیش لەو باوەڕەم. ئەوە زۆر لەوە زیاترە کە ئێمە چاوەڕوانی بووین، بەڵام پاش ئەوەی ئەو گۆڕانەم لە پیاوەکاندا بینی، لەو باوەڕەدا نەماوم کە شەڕ لەمە زیاتر بخایەنێ.»

– «کێ لە شەڕی هاوینەی ئەمساڵ سەرکەوتنی بەدەست هێنا؟.»

– «کەس»

گوتم: «نەمساوییەکان، بردیانەوە. ڕێگەی ئیتاڵییەکانیان نەدا چیاکانی (سان گبریل) داگیر بکەن. کەوابێ ئەوان سەرکەوتوون. ئەوانیش شەڕ ڕاناگرن.»

– «ئەگەر ئەوانیش وەکو ئێمە هەست بەهەمان شت بکەن، کە ئێمە هەستی پێدەکەین لەوانەیە شەڕ ڕاگرن. ئەوانیش وەکو ئێمە دەردەسەرییان کێشاوە.»

– «شتی وا هەرگیز نەبووە و نابێ. سەرکەوتوو شەڕ ڕابگرێ؟!»

– «تۆ ورەی من دەڕووخێنیت.»

– «من دەتوانم تەنیا ئەوە بڵێم کە بڕوام پێی هەیە.»

– «کەوابێ بەبڕوای تۆ شەڕ بەردەوام دەبێ، بەردەوام دەبێ، هیچ شتێ ڕوونادا؟»

– «نازانم تەنیا ئەوە دەزانم کە نەمساوییەکان شەڕ ڕاناگرن، ئەوان سەرکەوتوون ئێمە تەنیا لەکاتی شکستیدا دەبینە مەسیحی.»

– «نەمساوییەکان گشتیان مەسیحین تەنیا (بۆسنیانەکان) نەبن.»

– «مەبەستم لەمە مانای ڕووتی مەسیحی نییە. مەبەستم هەڵسوکەوتی حەزرەتی مەسیحانەیە.»

قەشە هیچی نەگوت:

– «ئێمە ئێستا هەموومان لەجاران دڵنەرمترین، چونکە بەزیوین. حەزرەتی عیسا چۆن دەبوو گەر (پیتەر) لە (باخچەکەدا) ڕزگاری کردبایە؟»

– «هەروەک خۆیی دەبوو.»

گوتم: «لەو باوەڕەدا نیم.»

قەشە گوتی: «تۆ ورەم دەڕووخێنی. وا هەست دەکەم شتێ ڕوودەدات نوێژ دەکەم تا شتێ ڕووبدا. وا هەست دەکەم ئەمە زۆر نزیکە.»

گوتم: «لەوانەیە هەندێ شت ڕووبدا، بەڵام تەنیا بۆ ئێمە ڕوودەدا. گەر ئەوانیش وەکو ئێمە هەست بکەن. ئەوا ئەوەی مەبەستمانە دێتە دی. بەڵام ئێمەیان بەزاند، ئەوان بەجۆرێکی تر هەست دەکەن.»

– «زۆر سەرباز هەمیشە وایان بیرکردۆتەوە. نەک لەبەر ئەوەی کە بەزیون.»

– «هەر لەگەڵ قەومانی شەڕەوە بەزیون. لەوکاتەوە بەزیون کە جوتیارەکانیان بەزۆری لە کێڵگەکانیاندا دەرهێناون و کردوویانن بەسەرباز. لەبەر ئەوەیە جووتیارەکان ژیرن. لەبەر ئەوەی لەیەکەم ڕۆژی دەست پێکردنی شەڕەوە بەزیون. دەسەڵاتیان بدەرێ ئەو کات دەزانی چەند ژیرن.»

قەشە هەر ورتەی لێوە نەهات. کەوتبووە بیرکردنەوە، گوتم:

– «ئێستا بەخۆم دڵتەنگم لەبەر ئەوە هەرگیز بیر لەو شتانە ناکەمەوە. هەرگیز بیرناکەمەوە. تەنانەت هەر کە قسەش دەکەم ئەو شتانە دەڵێم کە لەناو مێشکمدان بەبێ ئەوەی بیریان لێ بکەمەوە.»

– «بەو هیوایەم شتێ ڕووبدا.»





– «بەزین؟»

– «نا لەوە زیاتر.»

– «لەوە زیاتر! هیچی تر نییە. سەرکەوتن نەبێ. ئەویش لەوانەیە خراپتر بێ.»

– «ماوەیەکی لەمێژبوو بەهیوای سەرکەوتن بووم.»

– «منیش هەروەکو تۆ.»

– «ئێستا نازانم.»

– «لەدوان یەک دەبێ، بەزین یا سەرکەوتن»

– «بڕوام بەسەرکەوتن هەر نەماوە!»

– «منیش. بەڵام بڕوام بەڕووخانیش نییە. هەرچەندە لەوانەشە ڕووخان باشتربێ.»

– «تۆ بڕوات بەچی هەیە؟»

– «بە خەو.»

هەستایە سەرپێ و گوتی: «ببوورە، زۆر مامەوە. بەڵام زۆر حەز دەکەم قسەت لەگەڵ بکەم.»

– «ئەم باسە وا خۆشە جارێکی تر قسەی لێ بکەینەوە. مەبەستم لەخەو هیچ نییە. بەهیچی هەڵنەگری.»

هەستایەوە، لەتاریکی تەوقەمان کرد.

گوتی: «لە نوقتەی (٣٠٧)دا دەخەوم.»

– «بەیانی زوو دەچمە پاسگاکانی پێشەوە.»

– «کاتێ گەڕایەوە دەتبینم.»

تا دەرگا بەڕێم کرد گوتم: «پێکەوە پیاسە دەکەین و قسە دەکەین.»

دەستی دانا سەرشانم و گوتی:

– «دامەبەزە. بەڕاستی بەهاتنەوەت زۆر خۆشحاڵم، هەرچەندە تۆ بەم هاتنەوەت دڵخۆش نی.»

گوتم: «نا، بەدڵمە، شەو شاد.»

– «شەو، شاد، چاوو.»

گوتم: «چاوو.»

ئەوەندەم خەو دەهات هەر مردبووم.

## 27

کە ڕینالدی هاتە ژوورەوە واگا هاتم، بەڵام ئەو نقەی لێوە نەهات و منیش لێکەوتمەوە خەو. بەیانی جلەکانم لەبەرکرد و لەگەڵ گەردی بەیان بەرلەوەی دونیا ڕۆناک ببێتەوە ڕۆیشتم، کە ئەوێم بەجێهێشت ڕینالدی هەر لە شیرینی خەودا بوو.

(بێنسێزا)م پێشتر نەدیبوو. بەڵام هەڵگەڕان بەسەر ئەو هەورازە هەڵەمووتە، کە نەمساوییەکان پێشتر تیایدا جێگیربوون، جێگەی سەیربوو. ئەوێ کەوتبووە سەر ڕووبارەکە لە دواوەی ئەو شوێنەی لێی بریندار ببووم. هەورازە ڕێگایەکی تازە دروست کرابوو. ژمارەیێ ترێلە بەسەرەوە بوو، لە دواوەی ئەمەوە ڕێگاکە تەخت بوو، لەوێوە دارستان و گردی لێژم لەناو تەمومژدا بینی. چەند دارستانێک هەبوون، هەر لە زووەوە داگیرکرابوون، بەڵام دارەکانیان هێشتا تێک نەشکێنرابوون. لەدواوە، ئەو شوێنەی کە هیچ گردێکی لێ نەبوو ببێتە پەناگا، ڕێگاکە بەو پارچە حەسیرانە داپۆشرابوون کە لەسەرەوەدا بەسەر لایەکانیدا دادرابوو، ڕێگاکەش لە گوندێکی خاپوورکراو کۆتایی هاتبوو. هێڵەکانی بەرەی جەنگ کەوتبووە دواوەی ئەم گوندە. ژمارەیێ تۆپ لە دەوروبەری داندرابوون. خانووەکانی خراپ پێکرابوون. بەڵام هەموو شتێ بەچاکی ڕێکخرابوو، لە هەموو شوێنێ نیشانەی ڕاگوزاری داندرابوو.

(گینۆ)مان دۆزییەوە، قاوەی بۆ هێناین، پاشان لەگەڵی ڕۆیشتم چاوم بەچەند کەسی جیاجیا کەوت. پاسگاکانم بینی. گینۆ گوتی ئۆتومبیلە فریاگوزارە بەریتانییەکان کەمێ بەخوار (بێسێنزا)وە لە نزیک (ڕاڤنا) لەکاردان. (گینۆ) بەریتانییەکانی زۆر کەوتبووە بەردڵ. گوتی تۆپ هاوێشتن هەر لە نەبڕانەوە بەردەوامە بەڵام بریندار کەمن، ژمارەی نەخۆشان لەگەڵ دەست پێکردنی بارانەوە ڕوو لەزیادی دەبێ. بڕیار وابوو نەمساوییەکان هێرش دەست پێ بکەنەوە. بەڵام ئەو باوەڕی بەمە نەدەکرد، بڕیاریش وابوو ئێمەش هێرش بەرین. بەڵام نەمساوییەکان هیچ تیپی سەربازی تازەیان نەهێنا، ئەمەش نیشانەی هێرش نەکردن بوو.

خواردن لەم ناوچەیە زۆر کەم بوو، بۆیە زۆر کەیفخۆش بوو گەر جەمێ خواردنی لە (گۆریزیا) بخواردبایە. ئێوارە دەبێ چیم خواردبێ؟ وەڵامم دایە. گوتی وابزانم ئەوە شتێکی خۆش و بەدڵی منە. بەتایبەتی دڵی کەوتبووە سەر (دولسن).

خۆ من وەسفی تەواوم بۆ نەکردبوو، بەڵکو هەر لە کورتی بڕیمەوە. گوتم: (دولسن)م خواردەوە. وابزانم وای بۆ چووە، کە ئەم خواردنە لەنانی حەلوا خۆشتر بێ.

ئاخۆ من دەزانم ئەو نیازی چ لایەکی هەیە؟ لە وەڵامدا گوتم نەخێر، بەڵام زانیومە کە هەندێ ئۆتومبیلی تر لە (کاپورتیو)، بوون. گوتی بەئاواتەوەیە بەم ڕێگایەدا سەرکەوێ. (کاپورتیو) شوێنێکی دڵارای بچووک بوو. ئەو دڵی بەو چیا بەرزەی کە لەو دیوەوە هەڵدەکشا دەبۆوە. (گینۆ) کوڕێکی باش بوو، هەموو کەسێ خۆشی دەویست. گوتی





دۆزەخی بەڕاستی لە (سان گبریل) بوو ئەو هێرشەی لە نزیک (لوم)ەوە کرا بەزووترین کات سەرکوت کرا. گوتی نەمساوییەکان ژمارەیەکی زۆر تۆپ و کومپارەیان لەناو دارستان و سەرلوتکەی (تێرنۆڤا)وە لەدواوەمان و لەسەرەوەمان داناوە. ڕێگاکانیان بەشەو بەتوندی کوتیەوە. بەتالیۆنێکی تۆپی دەریاوانی لەوێ هەبوو. کە مێشکمانیان بردبوو. توانیم بەجۆری بەزەوی کەوتنیان ئەم چەشنە تۆپانە بناسم. یەکەم جار گوێت لە گرمەی دەرچوونی دەبوو، پاشان هاژەی دەهات و لرمەی تەقینەوەی دەبیسترا. عادەتیان وابوو دوو تۆپیان پێکەوە دەهاوێشت، یەکێک ڕاست لە دوای ئەوی تر، خۆ ساچمەکانیان هەر مەپرسە چەند گەورە بوون. ساچمەیەکی نیشان دام، کە بریتی بوو لە پارچەیەکی کانزای گرنج گرنج، درێژییەکەی لە پێیەک تێپەڕ نەدەکرد. کانزاکە دەتگوت کانزای بابیتییە.[1]

گینۆ گوتی: «لەو باوەڕەدانیم کە زۆر کاریگەربن، بەڵام لەگەڵ ئەوەش هەترەشیان بردوومە. دەنگ دەدەنەوە، وا دەزانی ڕاستەوخۆ بۆ تۆ هاتوون گرمە و لرمەی هاوێشتن و تەقینەوەی یەکە، جا گەر برینداریشت نەکەن کە هەترەشیان بردی و مردنیان نیشان دای لەوە زیاتر چ دەمێنێ.»

هەروەها گوتی: «لە هێڵەکانی بەرامبەریان لەنێو نەمساوییەکاندا تیپی (کروش) و هەندێ لە تیپی (ماکیارز) هەن. تیپەکانی ئێمە هێشتا لە باری ئامادەسازی و هێرش بردنن. بێتەلیان نەبوو قسەی پێ بکەن. هەروا بۆ کاتی هێرش هێنانی نەمساوییەکان سەنگەریان بۆ خۆ تێ ماتکردن لێ نەدابوو. بەڵام مەتارێزی زۆر نایابی عاسێ بەدرێژایی چیا نزمەکان تا دەگەیشتە پێدەشتەکان هەبوون کەچی بەداخەوە هیچ هەوڵی بۆ ڕێکخستنیان و کردنیان بەشوێنی بەرگری نەدراوە بیروڕام دەربارەی (بێسێنزا) چۆنە؟

من وام ڕادەبینی کە تەخت و پانوپۆڕ بێ و لە دەشت دەشتتر بێ.

قەت بەخەیاڵمدا نەدەهات کە ئاوا پڕ هەڵەتوپەڵەت بێ.

گینۆ گوتی: «ئەڵتۆپیانۆ[1]، بەڵام پیانۆ نییە.»

گەڕاینەوە ژێرزەمینی خانووەکەی تیای دەژیا. گوتم ئەو سەنگەرەی لە بەرزاییە و کەمێک چالایی تیایە، ئاسانتر و تەکنیکیترە و ئەرکی پاراستنی زۆر لە زنجیرە چیایەکی بچووک ئاسانترە. گوتم هێرش بردن لەسەر چیا ناخۆشتر نییە لە هێرشی پێدەشت و ساکەگۆڕ. گوتی: -« ئەمەش دەوەستێتە سەر چیاکان سەیری (سان گبریل)

(١)کانزای بابیت: جۆرە کانزایەکی ڕەقە لەمس و تەنەکە پێکدێ درەنگ دادەخورێ.

(١) ئەڵتۆ ـ Alto بەدەنگی ئەو پیاوە گۆرانیبێژە دەوترێ کە دەنگەکەی لە نێوان دەنگ گەورەیی خۆی و سێ جار ئەوەندەی خۆی بێ. یا بەدەنگی ئەو ئافرەتە دەگوترێ کە هەمان دەنگی لە درێژکردنەوەدا هەبێ.

بکا. گوتم: «بەڵێ، بەڵام ئەوان لەسەری لووتکەکەوە ماندوو بوون چونکە ساکەگۆڕ بوو. زۆ بەئاسانی بەچیاکە هەڵگەڕان و سەرکەوتنە سەرەوە.»

گوتی: «یەگجار وا ئاسان نییە.»

گوتم: «بەڵێ، ئەمە شتێکی تایبەتی بوو. چونکە (سان گبریل) زیاتر لەوە دەچوو قەڵا بێ نەک چیا بێ. نەمساوییەکان چەند ساڵ بوو خەریکی قایمکردنی ئەو ناوچەیە بوون.»

لەڕووی تەکنیکییەوە، ئەوەی من مەبەستم بوو لە شەڕی جێ گۆڕکێدا زنجیرە چیایەک وەک هێڵێکی بەرگری بەهیچ ناچێ چونکە سووڕانەوە لە دەوری چیا لە خۆی ئاسانتر نییە. تۆ دەبێ توانای جووڵەت هەبێ، بەڵام چیا جووڵەی نییە. پیاویش لە نزمایییەوە گوللە هەر بەبەرزایییەوە دەنێ. لەو حاڵەتەش کە دوژمن گەمارۆی چیا دەدا شۆڕەسواری مەیدان لەسەر لووتکەی چیاکانەوە دەمێنێتەوە. من بڕوام بەشەڕی سەر چیا نییە. زۆر لەمێژە لەو بارەوە بیرم کردۆتەوە تۆ چیایەکی لێ داگیر دەکەی، ئەویش چیایەکت لێ دەستێنێتەوە. بەڵام کە شەڕ گەرم بێ و بەڕاستی دەست پێ بکا هەردوولا بەناچاری دادەبەزنە خوارەوە.

پرسی: «تۆ چی دەکەی گەر سنوورت چیا بێ؟»

گوتم: «هێشتا بیرم لێ نەکردۆتەوە.»

هەردووکمان دامانە پێکەنین.

گوتم: «بەڵام لە ڕۆژگاری دێریندا نەمساوییەکان، هەردەم لەناوچە نیمچە چوار گۆشەیییەکانی دەوروبەری دەشتی (ڤیرونا) خراپ لێیان دراوە. ئەوان ڕێگەیان دەدان تا دابەزنە ناوچە دەشتییەکان ئینجا لەوێ لێیان دەهاتنە دەست و لەنێویان دەبردن.»

– «بەڵێ، بەڵام ئەوان سەربازی فەرەنسی بوون، تۆش دەتوانی بێ پێچ و پەنا، گێرمە و کێشەی سەربازی بنێیتەوە، کاتێ لە وڵاتی دوژمندا شەڕ دەکرێ.»

لەگەڵ بیروباوەڕی ئەو بووم، بۆیە گوتم:

– «بەڵێ، بەڵام کاتێ لە وڵاتی خۆت شەڕدەکەی ناتوانی بەزانستیانە ڕەفتار بکەی.»

– «ڕووسەکان وایان کرد، تا داو بۆ ناپلیۆن دانێنەوە.»

– «بەڵام ئەوان خاکیان فراوانە. ئەگەر تۆ بتەوێ لە ئیتالیا داو بۆ ناپلیۆن دابنێیەوە، خۆت لەناوچەی (برێندزی) دەبینیەوە.»

– «جێگایەکی ترسناکە. قەت چوویتە برێندزی؟»

– «لێی نەمایمەوە»

– «هەرچەندە خۆم نیشتمانپەروەرم، بەڵام (برێندزی) و (تارانتو)م ناکەوێتە بەردڵ.»





– «ئەی بێنسێزات بەدڵە؟.»

– «خاکێکی پیرۆزی هەیە، بەڵام خۆزیا پەتاتەی زیاتری تیا چاندرابایە. دەزانی کاتی هاتینە ئێرە کێڵگەی پەتاتەمان دۆزییەوە کە نەمساوییەکان کاتی خۆی چاندبوویان.»

– «ئایا، بەڕاستی خواردن کەم بووە؟»

– «من بەش بەحاڵی خۆم هیچ کاتێ تێرم نەخواردووە، هەرچەندە من خۆم زەلامێکی زۆرخۆرم بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەستم بەبرسییەتی نەکردووە خواردنەکەمان مام ناوەندییە. پەلەکانی هێڵەکانی پێشەوە خواردنێکی چاکیان هەیە، بەڵام ئەوانەی دواوە خواردنیان دەست ناکەوێ. هەڵەکە لە شوێنێکدا هەیە. دەبێ خواردن زۆر بکرێ.»

– «سەگە ماسییەکان(۱) لە شوێنێکی تر خواردنەکە دەفرۆشنەوە»

– «بەڵێ ئەوەندەی لە دەستیان بێ دەدەنە بەتالیۆنەکانی پێشەوە، بەڵام ئەوانەی دواوە داد و بێدادیانە لە دەست کەم خۆراکی. پەتاتەی نەمساوی و شابەڕووی دارستانەکانیان هەموو خوارد، دەبێ خواردنی چاکتریان بدرێتێ. ئێمە لە زۆرخۆرەکانین. سووڕ دەزانم کە خواردن فرە زۆرە کارێکی زۆر نارەوایە سەرباز بێ خواردن بێ. قەت ڕۆژێ تێبینی ئەوەت کردووە، ئەمە چ جۆرە جیاوازییەک دروست دەکا ئەگەر بێ و وا بیر بکەینەوە؟»

گوتم: «بەڵێ زگی برسی هەرگیز سەرکەوتن بەدەست ناهێنێ بەڵکو سەرکەوتن لەدەست دەدا.»

– «ئێمە باسی دۆڕاندن ناکەین. لەبارەی دۆڕاندنەوە زۆر قسە کراوە. ئەوەی بەم هاوینە ئەنجام دراوە، بەفیڕۆ نەکراوە.»

من نقەم لێوە نەهات. هەردەم بەبیستنی وشەی «پیرۆزی» و (نەمری) و (قوربانی) و دەربڕینی (بەفیڕۆ ڕۆیشتن) پەشۆکاوم. ئەوانەمان زۆر جار گوێ لێ بووە. بووەتە بنیشتە خۆشەی بن ددان. هەندێ جار لەژێر باران وەستاوین، بەڕادەیێ لەمەودای بیستن زۆر دووربووین. تەنیا ئەو قسانە نەبێ کە بەشێوەی جاڕدان هاوارکرابێ یان لە بڵاوکراوەکاندا خوێندوومانەتەوە. لە پۆستەرەکاندا یەک لەدوای یەک بڵاودەکرانەوە، ئێستا و ماوەیەکی دوور و درێژ، هیچ شتی پیرۆزم نەبینیوە. ئەو شتانەی کە نەمرن هیچ بەڵگەی نەمرییان تیا نییە، قوربانییەکان وەکو گۆشتی ڕەشەوڵاغەکانی ئاغەڵی شیکاگۆنە، بەڵام ئەو گۆشتەی لێرەیە جگە لە بەژێر گڵکردنی هیچی تری لێ ناکرێ زۆر وشەی تر هەن کە پیاو توانای گوێ لێگرتنی نییە... لە کۆتاییدا نەمری تەنیا لەناوی جێگاکاندا ماوە، هەمان شت بەگوێرەی هەندێ ژمرە مێژوو و لەگەڵ ناوی هەندێ شوێن کە دەتوانین بڵێین هەموویان مانایەک دەدەنەوە قسە ڕەق و تەقەکانیش وەکو نەمری و

(۱) سەگە ماسییەکان: مەبەست ئەفسەر و کاربەدەستەکانن.

شەرەف و ئازایەتی یان پیرۆزی هەموویان لەگەڵ ناوە ڕاستەقینەکانی گوندەکان و ژمرەی ڕێگاکان و ناوی ڕووبارەکان و تیپە سەربازییەکان و مێژوو و ڕۆژەکانیان پیس و چەپەڵ بوون.

(گینۆ) نیشتمانپەروەر بوو جاربەجار هەندێ قسەی دەکرد، قسەکانی ئاسمان و ڕێسمان لێکی دوور دەخستنەوە. بەڵام کوڕێکی باش بوو. زانیم ئیتاڵیاپەرستە و بەنیشمانپەروەریش لەدایک بووە. لەگەڵ (پیدۆزی) بەئوتومبیل بۆ (کوریزیا) ئۆغریان کرد منیان بەجێهێشت.

ئەو شەوە ڕەشەبا و تۆف بوو. ڕەشەبایەکە بارانی دادەکرد و دار و بەردی پڕ قوڕ و ئاو کرد. سواغی ماڵە تەپیوەکان تەڕ و بۆر ببوون. پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ باران وەستا. لە دەرەوەی بنکەی پزیشکی ژمرە دوودا سەیری دەشتودەرم کرد و. پایزێکی تەڕ و ڕووتەن وڵاتی داگرتبوو. هەوریش لووتکەی هەموو گردێکی داگرتبوو. ئەو حەسیرانەی کە بەسەر ڕێگاکەوە بوون تەڕ ببوون و ئاویان لێ دەچۆڕایەوە و خۆر بەر لە ئاوابوون یەکسەر وەدەرکەوت و لە پشت سەروکەی دارستانە ڕووتەکانەوە دەدرەوشایەوە. ژمارەیەک تۆپ و کومپارەی نەمساوییەکان لەلای سەروکەی پشت دارستانەکەدا دادرابوون. بەڵام کەمیان تۆپیان ئاگر دەدا. سەیری ئەو گۆزە دووکەڵە ناکاوانەم دەکرد کە لە تۆپی (شارنپل) دەردەچوون لە ئاسماندا لەسەر خانووەکی ناو کێڵگەی کەلاوەکە بوو کە دەکەوتە نزیک هێڵەکانی پێشەوەی بەرەی جەنگ بەدیار دەکەوت.

لە ناوەڕاستی دووکەڵەکەوە بریسکەیەکی سپی مەیلەو زەرد پەیدا دەبوو، بریسکەکانم بینی ئینجا گرمەی تەقینەوەی دەزرینگایەوە. پاشان تۆپەڵە دووکەڵێکی ترم بینی بە با شێوەکەی تێکدەچوو دەنیشتەوە. ژمارەیەک تەڵەزمی گوللە تۆپی (شانپل) کەوتبووە ناو پەلە بەردی خانووە کاول بووەکە. ڕێگاکەی تەنیشت خانووە کەلاوەبووەکەش کە لەکاتی خۆی بنکەی پزیشکی بووە لە تەڵەزمی ئەم بێ بەش نەبوو، بەڵام نەمساوییەکان ڕووی گوللەتۆپەکانیان پاش نیوەڕەی ئەوێ ڕۆژێ لە ئێمە نەکرد.

دوو ئوتومبیلمان لە برینداران بار کرد و بەسەر ئەو ڕێگایەدا ڕۆیشتین کە بەحەسیری تەڕ پۆشرابوو، دوا تاڵەتیشکی خۆر بەنێو کەلێنی ڕایەڵی حەسیرەکەدا دەهاتە ژوورەوە. بەر لەوەی لە ڕێگا چۆلەکەی پشت گردەکەوە دەرچین ڕۆژئاوابوو. لە ڕێگا چۆلەکە دەرچووین، لەسەر لۆفەی بۆ گۆڕەپانێکی بەر هەوا پێچی کردەوە لە گۆڕەپانی تونێلێکی کەوانەیی کە بەحەسیر دەورە درابوو دەرچوو، جارێکی تر دەستی بەباران کردەوە. شەو با هەڵی کرد، لە سەعات سێی بەیانی لەگەڵ ڕێژنەی بارانەوە بۆمباران دەستی پێکرد و تیپی (کرۆوتیان)ی نەمساوی بەناوچەی مێرگوزاری چیا و دارستانۆکەکان تا هێڵەکانی پێشەوەی بەرەوە هاتن لە تاریکی و لەژێر باراندا جەنگان و هێرشی پێچەوانەی پیاوە زراوچووەکانمان لە هێڵی پێشەوە، ئەوانیان کشاندنەوە، تۆپ هەر





دەهات و ڕۆکێتیش لەنێو بارانەوە، ڕەشاش و تفەنگیش بەسەر هێڵەکانی بەرەوە باراندرا. ئیتر چیتر نەگەڕانەوە ناوچەکە کەمێک بێ دەنگتر بوو بەڵام لەگەڵ هاژەی باوباران گوێمان لەدەنگی بۆردومانێکی دووری ناوچەی باکوور بوو. بریندارەکان دەهێنرانە بنکە پزیشکییەکەوە. هەندێک بەدەستەبەرە هێنرابوون، هەندێکی تر بەپێی خۆیانەوە، هەندێکی تریش بەکۆڵی سەربازەکان بەنێو کێڵگەکاندا هێندرابوون. هەموو لەشیان تا سەر پێیان بەباران تەڕ بووبوو. هەمووشیان زراویان چوو بوو. دوو ئوتومبیلمان پڕی ئەم بریندارانە کرد کە بەدەستەبەرە هێندرابوون کە لەژێر زەمینی بنکەکەوە هاتبوونە دەرەوە. لەو کاتەی دەرگای ئوتومبیلی دووەمم داخست، هەستم کرد بارانی سەر ڕووم ببووە بەفر، کلۆی بەفر زۆر بەتوند و خێرایی لەگەڵ بارانەوە دادەباری. کاتێ ڕۆژ هەڵات، تۆف، ڕەشە با هەر بەردەوام بوو، بەڵام بەفر وەستابوو، هەر کە کەوتبووە سەر زەوییە تەڕەکەوە خۆی ڕانەگرتبوو، جارێکی تر باران بارییەوە. لە پاش خۆرهەڵاتن هێرشێکی تر کرا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، وامان چاوەڕوان دەکرد بەدرێژایی ئەو ڕۆژەوە هێرشێ بکەن. بەڵام تا خۆرئاوا نەبوون دەستی پێ نەکرد. بۆردومان لەلای باشوورەوە، لەژێر ڕیزە شاخە پڕ دارستانەکەوە دەستی پێکرد کە تۆپەکانی نەمساوییەکانی تیادا داندرابوو. چاوەڕوانی بۆردومانی دوژمنانمان کرد، بەڵام بۆردومان نەکراین. دنیا تاریک داهات، تۆپەکان لە کێڵگەکانی پشت ئاواییەوە دەهاوێشتران، تۆپەکان دوور دەکەوتنەوە و دەنگێکی خۆشیان هەبوو. بیستمان ئەو هێرشەی کرایە سەر باشوور سەرکەوتوو نەبوو. لەوێ هێرشیان نەکرد، بەڵام بیستمان لە باکوورەوە تێکەوتین. شەوێ فرمانمان بۆ هات بۆ پاشەکشێ بکەوینە خۆ ئامادەکردن. کاپتنی بنکەکە ئەمەی پێ ڕاگەیاندم. ئەویش ئەو فرمانەی لە لیواوە بۆ هاتبوو. بەماوەیەکی کەم بەدوای تەلەفۆن کردنەوە گەڕایەوە گوتی درۆ بوو. لیواکە فەرمانی وەرگرت هەرچۆنێ بێ دەبێ پارێزگاری لەبانی (بێنسێزا) بکا. دەربارەی هاتنە پێشەوەی نەمساوییەکان لە (کارپۆرتۆوە) پرسیارم لێ کرد. گوتی ئەو لەسەرکردایەتییەوە بیستوویەتی کە نەمساوییەکان ناوچەی سوپای بیست و حەوتیان لەسەرەوەی (کارپۆرتۆوە) بڕیوە. شەڕێکی گەورە لە ناوچەی باکوورەوە هەموو ئەو ڕۆژە بەردەوام بوو. گوتی: «گەر ڕێگەی ئەو زۆڵانە بدرێ بێنە پێش ئەوا ئێمە فەوتاوین. ئەفسەرێکی پزیشکی گوتی: «ئەڵمانییەکان هێرشیان هێناوە.»

وشەی ئەڵمانی شتێکی ترسناک بوو پیاوی دەپساند. ئێمە خۆمان نەمان دەویست هیچ شتێ لەگەڵ ئەڵمانییەکان بکەین.

ئەفسەرەکە گوتی: «پازدە تیپی ئەڵمانی لەگەڵدایە، کەلێنیان لە بەرەوە کردووە و ڕێگەمان لێ دەبڕن.»

– «لە سەرکردایەیەتییەوە دەڵێن، دەبێ ئەم هێڵە بپارێزرێ. گوایە ئەو کەلێنەی کردووتیانەوە جێی ترس نییە بۆیە دەبێ هێڵێکی بەرگری بەدەوری چیاکاندا لە (مۆنتی

ماگیۆر)ەوە دروست بکرێ.»

– «ئەمەیان لەکوێوە، گوێ لێ بووە.»

– «لە سەرکردایەتی تیپەوە.»

– «فەرمانی پاشەکشەشێ هەر لە سەرکردایەتی تیپەوە هاتووە.»

گوتم: «ئێمە بەفەرمانی فەیلەقەوە کار دەکەین. بەڵام من لێرە بەفەرمانی تۆوە کاردەکەم، کە داوام لێ بکەی بڕۆم دەڕۆم. بەڵام دەبێ فەرمانەکان ڕاست و دروست وەرگری.»

– «فەرمان وایە لێرە ئۆقرە بگرین. تۆ بریندارەکان لێرەوە بۆ بنکەی تیمارکردن دەنێریت.»

گوتم: «هەندێ جاریش لە بنکەی تیمارکردنەوە بۆ نەخۆشخانەی مەیدانیان دەبەین توخوا پێم بڵێ، من هەرگیز پاشەکشەم نەبینیوە، ئەگەر لێرە پاشەکشە بکەین چۆن ئەم هەموو برینداران ڕادەگوێزین.»

گوتی: «پێویست ناکا هەموو ڕاگوێز بکرێ. ئەوەندەی لە توانامان دابێ، تا بکرێ ژمارەیەکی زۆریان دەگوازینەوە. ئەوەی مایەوەش بەجێیان دێڵین.»

– «چی لە ئوتومبیلەکان باردەکەین؟»

– «کەلوپەلی نەخۆشخانە.»

گوتم:– «زۆر باشە.»

شەوی پاش پاشەکشە دەستی پێکرد. بیستمان ئەڵمانییەکان و نەمساوییەکان لە ناوچەکانی باکووردا هاتوونەتە پێش و لەچیا و دۆڵەکاندا هاتوونەتە خوارەوە. بەرەو (ئۆدین) و (سیڤیدل) دەکشێن. پاشەکشەیەکی ڕێکوپێک و خەمناک و شێداری بوو. لە شەودا بەهێواشی بەنێو قەڵەباڵغەکەی سەر ڕێگاوە بەلای چەند تیپێکی پیادەدا، لەژێر باراندا ڕۆیشتن و تۆپ و ئەسپە عەرەبانە ڕاکێشەکان و هێستر و ئوتومبیلە بارهەڵگرەکان تێپەڕین، کە هەمووی لەبەرەی جەنگەوە دوورکەوتنەوە. نارێکی پاشەکشەکە هیچی لە نارێکی هێرش بردنەوە زیاتر نەبوو. ئەوێ شەوێ بۆ چۆڵکردنی نەخۆشخانەی مەیدان کەوتینە خۆ کە لە دەشتایی گوندێکی نیمچە کاولکراو دروست کرابوو. بریندارەکانمان بۆ (پلاڤا) بۆ نزیک سەرچاوەی ڕووبارەکە هێنا. ڕۆژی پاشتریشمان بەتەواوەتی لەژێر بارانەوە بۆ چۆڵکردنی نەخۆشخانەکان و بنکەکەی (پلاڤا)وە تەرخانکرد، ئەو سوپایەی لەسەر (بێنسیزا) ئۆقرەی گرتبوو لەژێر ڕێژنەی بارانی ئۆکتۆبەردا دابەزینە خوارەوە. لەو ڕووبارە پەڕینەوە! کە لەبەهاری ئەمساڵدا سەرکەوتنی چاکیان لەلای بەدەست هێنابوو. لە نیوەڕۆی ڕۆژی دوایی هاتینە ناو (گوریزیا). باران وەستابوو. شارەکە مەیلەو چۆل بوو، کاتێ هاتینە سەر شەقام، کچە سۆزانییەکانی خانووی سەربازەکان بار و بارگەیان دادەنایە ناو ترێلەیەکەوە. حەوت کچ





بوون، شەپقەکانیان لەسەرنابوو چاکەتەکانیان لەبەرکردبوو، جانتای بچووکیان هەڵگرتبوو، دوانیان دەگریان، یەکێکیش لەوانی تر بزەی بۆ کردین، زمانی دەرهێنا، بەرزونزمی کرد، کچێکی لێو ئەستووری چاوڕەش بوو. ئوتومبیلەکەم ڕاگرت و چووم قسەم لەگەڵ ژنە قەوێدەکەی تیاترۆکان کرد. گوتی تیاترۆکانی خانووی ئەفسەرەکان بەیانی زوو ئێرەیان بەجێهێشتبوو «بۆ کوێ چوون؟.» گوتی: «بۆ کۆند گلانیۆ.»

ئەو ترێلەی بزگوڕی تیاترۆکانی بارکردبوو بەگڕ کەوت. کچە لچنەکە جارێکی تر زمانی دەرهێنایەوە. قەوێدەکە بەدەست خواحافیزی لێ کردن، دوو کچەکەش لە گریانی خۆیان نەکەوتبوون. ئەوانی تر بەداماوی و سەرنج ڕاکێشانەوە سەیری شارەکەیان کرد. منیش گەڕامەوە سواری ئوتومبیلەکە بوومەوە.

(بۆنیلۆ) گوتی: «حەق وایە لەگەڵیان بڕۆین. گەشتێکی خۆش دەبێ.»

گوتم: «گەشتی ئێمەش خۆش دەبێ.»

– «گەشتێکی دۆزەخیمان دەبێ.»

بۆ ڤێلاکە ئوتومبیلەکەمان لێخوڕی.

– «خۆزیا لەو کاتە لەوێ بوومایە کە لەگەڵ هەندێ لەم دەمڕووتانە سواری ئوتومبیلەکە دەبووین تا لەگەڵیان ڕام بواردبایە و هەڵم پەڕاندبانەوە.»

– «لەو باوەڕەی کە ڕادەبوێرن.»

– «لێم مسۆگەرە، هەموو کەسێ لە سوپای دووەم ئەم قەوێدەیە دەناسێ.»

لەدەرەوەی ڤێلاکە بووین.

بۆنیلۆ: «بەدایکی گەورە بانگی دەکەن. ئەو کچانە تازەبوون، بەڵام هەموو کەسێ ئەو دەناسێ، بەرلەوەی سوپا بکشێتەوە بۆ ئێرەیان هێنابوون.»

– «کاتێکی خۆش بۆ خۆیان بەسەر دەبەن.»

– «منیش دەڵێم کاتێکی خۆش بەسەر دەبەن. چەند حەز دەکەم هەموویان شەق و پەق بکەم؟! بەڵام بەخۆڕایی. هەر چۆنێ بێ. نرخی چوونە لایان پارەیەکی زۆر بوو. میری ئێمە هەڵدەخەڵەتێنێت.»

گوتم: «ئوتومبیلەکە ببە دەرەوە تا فیتەرەکان سەیرێکی بکەن و ڕوونەکەی بگۆڕن، کەموکوڕیان تەواو بکە، پڕ بەنزینی بکە دواییش سەرخەوێ بشکێنە.»

– «بەڵێ. سینگۆر تێنیتە.»

ڤێلاکە چۆلوهۆل بوو، ڕینالدی لەگەڵ نەخۆشخانەکە ڕۆیشتبوو، مێجەریش ڕۆیشتبوو و دەستەی کارگێڕی بەئوتومبیلی نەخۆشخانە لەگەڵ خۆی بردبوون. تێبینییەکانی لەسەر پەنجەرەوە بۆ دانابووم، تیایدا داوای لێ کردبووم ئەو کەلوپەلانەی لە هۆڵەکەوە کۆ کراونەتەوە لە ئوتومبیلەکان بار بکەم و بەرەو (پۆردینۆ) بکەومە ڕێوە. میکانیکەکانیش ئۆغریان کردبوو، چوومە دەرەوە تا چاوێ بەگەراج داگرم.

لەوکاتەی لە گەراج بووم و ئوتومبیلەکەی تریش گەیشتەجێ. شوفێرەکان دابەزین. باران دەستی پێکردەوە.

پیانی شوفێر گوتی: «چاوم لە خەوان بڵند نابێ، لە پلاڤاوە تاکو ئێرە سێ جار چاوم چووەتە خەو، ئێستا چی بکەین تێنیتا؟»

– «ڕوونیان دەگۆڕین، گریسیان تێ دەدەین، پڕ بەنزینیان دەکەین، دەیانبەینە بەردەرگای ڤیلاکە و ئەو کەچە شتە جێماوانەیان لێ بار دەکەین.»

– «جا دوایی دەڕۆین؟»

– «نەخێر، بۆ ماوەی سێ سەعات دەخەوین.»

پۆنیلۆ گوتی: «بە مەسیح خەوتنم پێخۆشە. چیتر توانای ئوتومبیل لێخوڕینم نەماوە.»

پرسیم: «ئوتومبیلەکەی تۆ چۆنە؟»

– «بێ خەوشە.»

– «بەدڵەیەکم بۆ بێنە تا لە ڕوون گۆڕین یارمەتیت بدەم.»

ئالیمۆ گوتی: «خۆت ئەزیەت مەدە، شتێکی وانییە، تۆ برۆ شتەکانت بپێچەوە.»

– «هەمووی پێچراوە، دەچم ئەو شتانە دەهێنمە خوارەوە کە بۆیان بەجێهێشتبووم، هەر کاتێ لە ئیشی ئوتومبیلەکانتان بوونەوە بیان هێننە پێشەوەتر.»

– «لە ناندینە.»

گوتم: «ئێوە بخەون.»

پیانی: «دەخەوم، ئەمرۆ هەر خەوەکوتکە بردوومیەتەوە تەپڵی سەرم وەک قوڕ بەسەرچاومدا شۆڕبۆتەوە.»

بۆنیلۆ:– «پۆتینەکانت لەبەرکەوە، ئێرە جێگەی دەموچاو ماسییە.»

پیانی:– «دەموچاو ماسی، هیچ نرخێکی نییە لام.»

ئەمەی گوت و بەپۆتینە قوڕاوییەکانییەوە لەسەر جێگا لێ ڕاکشا. پۆتینەکانی لە قەرەوێڵەکەوە هاتنە دەرەوە، سەری بەباسکی خۆی کرد. منیش چوومە ناندینەکە.

ئایمۆ ئاگری لە ئاگردانەکەی داگیرساندبوو کتلیەک ئاوی لەسەر دانابوو.

– «دەمەوێ پاسیا ئەسیوتا لێ بنێم. چونکە کە بەخەبەر دێین برسیمان دەبێ.»

لێم پرسی: «خەوت نایێ بارتۆلۆمیۆ؟»

– «نەخێر زۆرم خەو نایێ، کە ئاوەکە کوڵا بەجێ دێڵم، پاشانیش ئاگرەکە بۆ خۆی دادەمرکێتەوە.»

گوتم: «وا چاکترە کەمێ بخەوی، ئەوکات دەتوانین پەنیر و گۆشتی قوتوو بخۆین.»

گوتی: «پاسیائەسیوتا باشترە، ئوتومبیلەکانیان هێنایە بەردەرگای ڤێلاکە، ئەو





کەلوپەلەی لە نەخۆشخانەکە بوو لە دالآنەکە کۆمەڵ کرابوو، لێیانمان بارکرد. کە لە بارکردنیان بووینەوە، لەڕیز یەکتری لەژێر دارەکان لەبەر باران ڕامان گرتن و چووینە ژوورەوە.

گوتم: «ئاگر لە ناندین بکەنەوە، جلەکانتان وشک کەنەوە...»

پیانی: «لام گرینگ نییە، جلم وشک بێ یانا. دەمەوێ بخەوم.»

بۆنیلۆ: «دەچم لەسەر قەرەوێڵەی مێجەر دەخەوم. دەچم لەو جێگەیە دەخەوم کە پیرەمێردەکەی[1] لێ دێتە دەرەوە.»

پیانی: «لەهەر شوێنێ بخەوم بەلامەوە گرینگ نییە.»

دەرگای ژوورێکم کردەوە گوتم: «ئەم ژوورە دوو شوێنی تیایە.»

پۆنیلو: «ئەم ژوورە ژووری خاوەن سیمایەکی پیرە کە ڕوخساری لە ماسی دەکا.»

گوتم: «ئێوە هەردووکتان لەم ژوورە بخەون من بێدارتان دەکەمەوە.»

بۆنیلۆ: «ئەگەر لە خەویش ماینەوە ئەوا نەمساوییەکان بێدارمان دەکەنەوە.»

گوتم: «زۆر ناخەوم، ئایمۆ لە کوێیە؟ دوو ئاژاوە چییە دێ. تۆ برۆ بخەوە تێنیتە.»

– «لە ژووری مێجەر جێگایێ هەیە.»

– «تۆ لەوێ دەخەوی!»

– «نەخێر، لەسەرەوە لە ژوورە کۆنەکەی خۆم دەخەوم. دەتەوێ بخۆیتەوە بارتۆلۆمیو؟»

– «کەی ڕۆیشتن، ئێستا چ سوودی لێ نابینم.»

– «گەر پاش سێ سەعاتی تر خەبەرت بووەوە و خەبەرم نەبووەوە. بەخەبەرم بێنە، باشە؟»

– «سەعاتم نییە.»

– «لە ژوورەکەی مێجەرەوە سەعاتێ بەدارەوەیە.»

– «زۆر باشە.»

چووە دەرەوە. پاشان چوومە ژووری نانخواردن و هۆڵەکە لە دواییدا بەپێبلکە مەرمەڕییەکە سەرکەوتمە سەرەوە. بۆ ئەو ژوورە چووم کە لەگەڵ ڕینالدی تیایدا دەژیاین. لە دەرەوە باران بوو. چوومە لای پەنجەرەوە و تەماشای دەرەوەم کرد. تاریک داهاتبوو. هەر سێ ئوتومبیلەکەم بینی، لەیەک ڕیز لەژێر دارەکان ڕاگیرابوون. دارەکان دڵۆپ دڵۆپ بارانیان لێ دەچۆڕایەوە. دنیا سارد بوو و دڵۆپە ئاویش بەلقەکاندا دەهاتە خوارەوە. گەڕامەوە سەر قەرەوێڵەکەی ڕینالدی. لێ ڕاکشام و خەو بۆ خۆی بردمەوە. بەرلەوەی بڕۆین، لە ناندین نانمان خوارد، ئایمۆ قاپێ سیپاغاتی هێنا، پیاز و گۆشتی

(١) مەبەست لە مێجەرە.

قوتی پارچەپارچە کرابوو لەسەری دانابوو. لەناندین لە دەوری خوان لێی دانیشتین. دوو قاپ مەیمان لەگەڵ خواردەوە کە لەژێر زەمینی ڤێلاکەوە بەجێمابوو. دەرەوە تاریک ببوو. بارانیش بەردەوام بوو. پیانی بەچاوی خەوەوە لەسەر خوان دانیشتبوو.

بۆنیلۆ گوتی: «پاشەکشەم لە هێرش بردن لا خۆشترە، لە پاشەکشە (باربارى) دەخۆینەوە.»

ئایمۆ: «ئێستا وا باربارى دەخۆینەوە، لەوانەیە سبەینێ ئاوی باران بخۆینەوە.»

– «سبەینێ لە (ئۆدین) شامپانیا دەخۆینەوە. –(ئۆدین) شوێنی ئەوانەیە لەسەربازی ڕایان کردووە–. پیانی لەخەو هەڵسە بەیانی لە (ئۆدین) شامپانیا دەخۆینەوە.»

پیانی: «بەخەبەرم»

قاپی خۆی پڕی سپاغاتی و گۆشت کرد.

– «بارتۆ، ناتوانی کەمێ ئاوە تەماتە بدۆزییەوە.»

ئایمۆ: «ئاوە تەماتەی لێنابوو»

بۆنیلۆ: «لە ئۆدین شامپانیا دەخۆینەوە.»

پەرداخەکەی خۆی پڕ (باربار)ی سووری ڕوون کرد.

پیانی: «لەوانەیە بەرلەوەی بگەینە ئۆدین بخۆینەوە.»

ئایمۆ: «تێنیتا، تۆ تێرت خوارد؟»

– «زۆرم خوارد. بوتڵەکەم بار تولۆمیۆ.»

ئایمۆ: «لەناو ئوتومبیلەکان هەریەکە و بوتڵێکم بۆ داناون.»

– «هیچ نوستی؟»

– «زۆر پێویستم بەخەو نییە، کەمێ نوستم.»

بۆنیلۆ بەوپەڕی خۆشییەوە گوتی:

«بەیانی لە جێگەی پادشا دەخەوین.»

پیانی: «لەوانەیە لە... بخەوین.»

بۆنیلۆ: «لەگەڵ شاژن دەخەوم.»

ئەمەی گوت و سەیری منی کرد تا بزانێ مەیلم لەگەڵ ئەو گاڵتەیە چۆنە.

پیانی بەچاوی خەوەوە گوتی: «تۆ لەگەڵ... دەخەوی.»

بۆنیلۆ گوتی: «ئەمە ناپاکییە. ئێستا. ناپاکی نییە؟»

گوتم: «ببڕنەوە، بەکەمێ مەی لە سنووری خۆتان تێپەڕاند.»

لە دەرەوە ڕێژنەی باران بوو. سەیری سەعاتم کرد، نۆ و نیو بوو هەستامەوە سەر پێ و گوتم: «کاتی ڕۆیشتن هاتووە.»





بۆنیلۆ پرسی: «تۆ لەگەڵ کێ سوار دەبی؟»

– «لەگەڵ (ئایمۆ) تۆش لە دواوەمان دەبی (پیانی)ش لە دوای تۆ و بەسەر ڕێگای (کورمۆنس)دا دەڕۆین.»

پیانی گوتی: «دەترسم بکەومەوە خەو.»

– «باشە کەوابێ لەگەڵ تۆ دەبم. بۆنیلۆش لە دوامان دەبێ ئایمۆش لەدواوە.»

پیانی گوتی: «ئەمە باشترین چارەیە چونکە زۆرم خەو دێ.»

– «من ئوتومبیلەکە لێدەخوڕم تۆش بۆ خۆت کەمێ بخەوە.»

– «نەخێر، دەتوانم ماوەیەکی زۆریش ترومبێل بهاژۆم کە بزانم یەکێ هەیە کاتێ بخەوم خەبەرم دەکاتەوە.»

– «من خەبەرت دەکەمەوە، گڵۆپەکان بکوژێنەوە، بارتۆ.»

بۆنیلۆ گوتی: «دەشتوانی وا بەجێیان بێڵێت چونکە ئەم شوێنە خێری بۆ ئێمە تیا نەماوە.»

گوتم: «سندووقێکی بچووکم لە ژوورەکەم هەیە دەتوانی یارمەتیم بدەی بیهێنینە خوارەوە.»

پیانی گوتی: «دەچین دەیهێنین. وەرە ئاڵدۆ.»

لەگەڵ بۆنیلۆ چوونە هۆڵەکە، گوێم لە تەقەی پێیان بوو بەپێپلکەوە سەرکەوتنە سەرەوە.

ئایمۆ گوتی: «جێگایەکی خۆش بوو، بارتۆلۆمیۆ.»

دوو شووشە مەی و نیوە پەنیرێکی لەناو هەگبەکەی خۆی دانا.

– «چاومان بەهیچ شوێنێکی تری وەکو ئێرە ناکەوێتەوە، تێنیتا ئەوان بۆ کوێ پاشەکشە دەکەن.»

– «وەکو دەڵێن بۆ دەوروبەری (تاگلیمتۆ) نەخۆشخانە و سەرکردایەتی کەرت لە (بۆردنیۆن) دادەمەزرێننەوە.»

– «ئەم شارە لە بۆردنیۆن خۆشترە.»

گوتم: «(بۆردنیۆن)م نەبینیوە. تەنیا پێیدا تێپەڕیوم.»

ئایمۆ: «جێگایەکی زۆر خۆش نییە.»

## 28

کە لە شارەکە چووینە دەرەوە، شارەکە چۆڵ بوو، لەبەر باران و تاریکیدا، لە کاروانە سەربازییەکان و ئەو تۆپانەی بەنێو شەقامە سەرەکییەکەدا دەڕۆیشتن بترازێ هیچیتری

تیا نەبوو. ژمارەیێ ترێلە و چەند عارەبانەیێ بەنێو شەقامەکانی تردا دەڕۆیشتن، لە ڕێگا سەرەکییەکەوە یەکتریان دەگرتەوە. کە لەم شەقامە دەرچووین بەلای دوکانی پیستە خۆشکەرەکان تێپەڕین. سەربازەکانی سەر ڕێگا سەرەکییەکەوە ترێلەکان و ئەو عارەبانانەی بەئەسپ ڕادەکێشران و تۆپەکان هەموویان پێکەوە ڕیزێکی درێژیان بەستبوو بەهێواشی دەجوولانەوە.

ئێمەش ئەوان ئاسا لەژێر باران بەهێواشی و سەقامگیری جوولاینەوە، ئەوەندەی نەمابوو قەپاغی ڕادێتەری ئوتومبیلەکان لەگەڵ دەعامی دواوەی ترێلەیەکی بارقورسی بەخیوەتێکی تەڕ داپۆشراو، بەر یەکتری کەون. پاشان ترێلەکە ڕاوەستا.

کاروانە سەربازییەکەش هەمووی وەستا. دەستی بەڕۆیشتن کردەوە. ئێمەش کە کەمێکی تر ڕۆیشتین، پاشان وەستا. دابەزیم بەنێوانی ترێلەکان و عارەبانەکان، بەژێر ملی ئەسپە گەردەن تەڕەکان بۆ پێشەوە چووم. لەمپەرەکە، زۆر لە پێشەوەتر بوو. لە ڕێگاکە لامدا بەسەر تەختە دارێ لە چاڵێ پەڕیمەوە. بەکێڵگەکەی دواوەی چاڵەکەوە ڕۆیشتم لە توانامابوو کاروانە وەستێنراوەکە لەنێو دارەکان و لەژێر بارانەوە ببینم کاتێ بەنێو کێڵگەکەوە بەرەو پێشەوە چووم تا لەتەگەرەکەوە نزیک ببمەوە. نزیکەی میلێ ڕۆیشتم کاروانەکە هەر نەجوولایەوە.

هەرچەندە لەلایەکی ترەوە لە دواوەی ئوتومبیلە وەستێنراوەکان توانیم سەربازەکان ببینم کە بەرەو پێش دەچوون. بۆ لای ئوتومبیلەکان گەڕامەوە. لەوانەیە هۆی ئەم تەگەرەیەی ڕێگەمانی گرتووە تا (ئۆدین) دووربێ. پیانی بەسەر سووکانەوە خەوی لێکەوتبوو، سەرکەوتم لە تەنیشتییەوە دانیشتم، منیش لێکەوتمە خەو. چەند سەعاتێ گوێم لە قرەقرِی دەرچوونی ترێلەکەی بەرایمان بوو. پیانیم خەبەر کردەوە دەستمان بەڕۆیشتن کرد. چەند یاردە بەپێ ڕۆیشتین، پاشان وەستاینەوە، پاشان جارێکی تر ڕۆیشتینەوە، بارانیش هەر بەردەوام بوو.

کاروانەکە بەشەو جارێکی تر ڕاوەستایەوە. ئیتر دەستی بەڕۆیشتن نەکردەوە. دابەزیم و چوومە دواوە. تا (ئایمۆ) و (بۆنیلۆ) ببینم دوو ئەندازیار بەپلەی باشچاوش لەگەڵ (بۆنیلو) لەسەر کوشینی ئوتومبیلەکەی ئەو دانیشتبوون، کاتێ هاتمە لایان بێدەنگ بوون.

بۆنیلۆ گوتی: «ئیشی پردێکیان پێ سپێردرابوو، ئێستاش یەکەی خۆیان نادۆزنەوە، بۆیە منیش هەڵمگرتوون.»

– «هەڵبەت، بەیارمەتی جەنابتان.»

گوتم: «وا ڕێم دان.»

بۆنیلۆ: «لیوتینات ئەمریکییە. ڕێگەی هەموو کەسێ دەدا سواری ئوتومبیل بێ.»

یەکێ لە باشچاوشەکان بزەیەکی هاتێ، ئەوی تریان لە بۆنیلۆی پرسی کە داخوا من





ئیتاڵی خەڵکی سەروو یان خوارووم.

– «ئیتاڵی نییە. خەڵکی ئەمریکای باکوورە، ئینگلیزە.»

باشچاوشەکان پیاوی بەڕەوشت بوون. بەڵام ئەم قسەیان باوەڕ نەکرد. ئەوانم بەجێهێشت، بۆ لای ئایمۆ گەڕامەوە، دوو کچ بەتەنیشتییەوە دانیشتبوون، خۆشی لە سووچی دواوە دانیشتبوو جگەرەی دەکێشا.

بانگم کرد: «بارتۆ، بارتۆ.»

پێکەنی گوتی: «لیوتینات بیان دوێنە، من لێیان حاڵی نابم. هێی!»

دەستی خۆی لەسەر ڕانی کچێکیان دانا و ڕانی گوشی، کچەش چارۆگەی بەتەواوی لەلەشی خۆی گرتوو پاڵێکی بەدەستی ئەویشەوە وەنا.

– «هێی! ناوت بەتێنیتا بلێ و چی دەکەی لێرە؟»

کچە بەتووڕەیی سەیری کردم، ئەوی تریان چاوی بەردانەوە. ئەوەی تەماشای کردم هەندێ قسەی بەزارێ کرد نەمتوانی وشەیەکی لێ حاڵی ببم. کچێکی خرپنی ڕەشتاڵە بوو، وا پێدەچوو لە دەوروبەری شازدەساڵیدا بێ دەستم درێژ کرد و لێم پرسی: «سۆریلا؟»(١) ئەویش سەری خۆی لەقاند و بزەیەکی هاتێ.

– «زۆر چاکە.»

شەپێکم لە چۆکی دا، هەستم بەتووڕەیی وی دەکرد. بەڵام خوشکەکەی هەرگیز چاوی بەرز نەکردنەوە، بەساڵێ لە خوشکەکەی بچووکتر دیاربوو. ئایمۆ دەستی لەسەر ڕانی خوشکی گچکە دانا، ئەویش دەستی پاڵ نایەوە. ئایمۆ پێکەنی. دەستی بۆ خۆی درێژ کرد و گوتی: «پیاوی باشە.»

– «پیاوی باشە.» دەستی بۆ من درێژ کرد.

– «مەپەشۆکێ.»

کچە بەتووڕەیی سەیری کرد. هەر دوو کچ دەتگوت دوو باڵندەی کێوبین ئایمۆ گوتی: «ئەی لەبەرچی لەگەڵم سوار بووە، گەر منی خۆش نەوێ. کە هێمایەکم بۆ کردن یەکسەر هاتن و خۆیان تیا کوتاو سوار بوون.»

ڕووی لە کچە کرد و گوتی:

– «مەپەشۆکێ، ترست لە ... نەبێ. شوێن نییە بۆ ....»

وشەی ڕەمەکی و نابەجێی بەکارهێنا.

هەستم کرد کچە ئەو وشەیە تێگەیی، زۆر بەترسەوە سەیری ئایمۆی کرد لێوەکانی لە تووڕەییان دەلەرزین. پاشان فرمێسک بەسەر گۆنا خرپنەکانیدا ڕژا. خوشکەکەی سەری بەرزکردەوە دەستی گرت و لە تەنیشت یەکتر دانیشتن. خوشکی گەورەکە، زۆر

(١) وشەیەکی ئیتاڵییە واتە خوشک.

دڕ دیاربوو دەستی بەهەنیسک و نووزە نووز کرد.

ئایمۆ گـــوتی: «وابزانم، زراوم برد، نەم دەویست زراوی ببـــەم.» (بارتۆلومـــیـــۆ) تیرگەکەی خۆی دەرهێنا، پارچە پەنیرێکی کردە دوو پارچە. گوتی: «بگرە کرپەوە!.»

کـچی گـەورە سـەری خـۆی لەقـاند، کـڕ نەبووەوە، بەڵام خـوشکی گـچکە پەنیـرەکـەی وەرگرت و دەستی کرد بەخـواردنی. پاش مـاوەیێ خـوشکی گـچکە پارچەی دووەمی دایە خوشکەکە و هەردووکـیـان خـواردیان. خـوشکی گـەورە لەگریانـی خـۆی نەکەوت کـەم یان زۆر هەنسک و نووزەی هاتنێ.

ئایمۆ گوتی: «پاش کەمێکی تر ئاشت دەبینەوە.»

ئایمۆ بیـرێکی تری بەمـێشک داهات. لە کـچەکـەی تـەنیـشت خـۆی پرسی: «هێـشـتـا کیژن؟» ئەو سەری لەقاند.

ئایمۆ ئیـشـارەتی بۆ خـوشکەکـەی کـچـە کـرد: «ئەویش کـیـژە؟» هەردووکـیـان پێکەوە سەری خۆیان لەقاند. ئەوی گەورەتر هەندێ قسەی بەشێوازی خۆی کرد.

(بارتۆ) گوتی: «زۆر چاکە، زۆر چاکە.»

هەردووک کەیفخۆش بوون. ئەوانم بەجێهێشت. پێکەوە دانیشتبوون ئایمۆش لەدواوە لە قوژبنێکەوە دانیشـتبوو. گەڕامەوە لای ئوتومـبیلەکەی (پیانی). کاروانە ئوتومـبیلەکە تا ئێـسـتـا لە جـێگەی خـۆی نەجـوولابووەوە بەڵام سـەربـازەکـان لەلایەکـەی ترەوە لە ڕۆیشتنیـان بەردەوام بوون و باران بەلێزمە دەباری. وا بیـرم کردەوە کە هۆی وەسـتـانی ئوتومـبیلەکـان لەبەر تەڕبوونی وایەرەکـانیـان بێ. وەیا لەبەر ئەسپەکـان وەیا سەربازەکـان بێ. لەوانەیە خـەوتبن. هەرچەنـدە لە شـاریـشـدا پیـاو لەمـەسـەلەی هاتوچۆدا تـووشی تەنگوچەڵەمە دەبێ گـەر بەخـەبەریش بێ. لەوانەشە لەبەر تـێکەڵاوبوونی ئەسـپـەکـان و ئوتومـبیلەکـان بێ و هی تر بەهانای یەکـتـر نەیێن. عـارەبانەی جـووتیـارەکـانیـش لەو باشـانە نەبوون. ئەو جـووتە کـچـە لەگـەڵ (پارتۆ) بوون زۆر جـوان بوون. ناو سـوپایەکی پاشەکشـە کردوو شوێنی ئەم دوو کـیـژۆڵە نەبوو. کـیـژۆڵەی بەڕاسـتێن خۆ لەوانەشە زۆر خـواپەرست بن. ئەگـەر شـەڕ نەبوایە ڕەنگە ئێـسـتـا لەسـەر جێ و بـالینگانی خـۆمـان دەبووین. لەسـەر جـێگا سـەری خـۆم بەبالیـفـەوە دەکـرد خـواردن و خـەوتن. ڕەق وەک تەختـەدار لێی دەخـەوتم. ئێـسـتـاکـە کـاترین لەسـەر تەختی خـۆی لەناو دوو چەرچەفان دایە. یەکێ لەسـەرییـەوە ئەوی تر لەژێرییەوە دەبێ لەسـەر کـام لاوە خەوتبێ؟ لەوانەیە نەخـەوتبێ، لەوانەیە لەسـەر تەختـەکـەی لێ ڕاکـشابێ و بیـر لەمن بکاتـەوە. ئەی بای ڕۆژئاوا هەڵ بکە، هەڵ بکە. باشـە وا هەڵی کـرد بەڵام ئەو بارانە نم نم نەبوو بەڵـکو ڕێژنەیەکی گـەورەبوو، شـەوەکـە تا سـەر باران بوو. زانیت ئەو بارانە چ بارانێ بوو، سـەیرکە! ئەی مەسیح خۆزیا دەزگیـرانەکەمم لەنێو باوەشم بوایە. منیش لەنێو جێگاکەم بوومایە، گیانەکەم (کاترین).

خـۆزیا گـیانەکـەم (کـاترین) ببـا بەباران ئەی با لەگـەڵ خۆت بۆمی بێنەوە. باشـە وا





لەناو ئەو بارانە بووین. هەمـوو کـەسێ پێـیـەوە گـرفـتـارە. بارانی بچـووک ناکـا. بەدەنگێکی بەرز گوتم: «شەوباش کاترین. بەو هیوایەم خەوێکی خۆشت لێ بکەوێ، ئەگەر ئەم لاتەنیشتە ناخۆشە، گیانەکەم، لەسەر لاکەی تر درێژبە. کەمێ ئاوی ساردت بۆ دێنم، دوای کەمێکی تر بەیانی دادێ ئەوسا حاڵ ئاوا خراپ نابێ. ببوورە کە بێزارم کردووی، هەوڵ دە بخەوی شیرینەکەم.»

کاترین گوتی: «ئەم هەمـوو وەختـە خـەوتبووم. تۆ بەدەم خـەوەوە قسـەت دەکـرد. خۆ سەلامەتی؟!»

– «ئەوە بەڕاستی لێرەی؟»

– «هەڵبەت، لێرەم، دوور ناکەومەوە، ئەمە ئێمە هەرگیز لێک ناکات.»

– «تۆ زۆر خۆشەویست و شیرینی، لەشەودا دوور ناکەویتەوە، دوور دەکەویتەوە؟»

– «نەخێر، دوور ناکەومەوە. هەر لێرە دەبم. هەر چ کاتێ بتەوێ دێمە لات.»

پیانی گوتی: «دەستیان بەڕۆیشتن کردەوە.»

گوتم: «خەونم دەبینی.»

سـەیری سـەعـاتم کـرد، سێی بەیانی بوو، دەسـتم گـەیاندە پشت کـوشینەکـە قـاپێ (باربارا)م دەرهێنا.

پیانی گوتی: «بەدەنگی بەرز قسەت دەکرد.»

– «بەئینگلیزی خەونم دەبینی.»

باران هێـور ببووەوە. بەرەو پێش دەچووین. بەر لەشـەبەقدان جارێکی تر چەقـینەوە. کاتێ ڕۆژهەڵات لەسەر بەرزاییـیـەک بووین ئەو ڕێگایەم بینی کە پیایدا دەکـشاینەوە، لەبەردەممان درێژ دەبووەوە هەمـوو شتێ سەقامگیر ببوو، بێ جووڵە بوو، تەنیـا سـەربازە پیادەکان نەبن کە بەڕێدا دەڕۆیشتن. جارێکی تر بەڕۆیشتن کەوتینەوە، پاش ئەوەی لە ڕۆژی ڕووناک هەستم بەکزی چوونە پێشەوەم کرد، زانیم بۆ خۆگەیاندنە پێشـەوە دەبێ لەم ڕێگا سـەرەکـیـیـە لابدەین دەبێ بەناو دەشـتـەکـەوە تێـپـەڕین، گـەر بمانەوێ بگـەینە (یۆدین). شەوێ ژمارەیێ جووتیار لە ڕێگاکانی دەوروپشـتی دەشتەکەوە هاتبوونە نێو کاروانەکەوە لەگەڵ چەند عارەبانەیێ وەگەڵ کاروانەکە کەوتبوون.

کەلوپەلی ناو ماڵیان لێ بارکرابوو چەند ئاوێنەیێ لەنێو دۆشەکەکاندا قیت ببوونەوە و مریشـک و مراوی لە عـارەبانەکەوە بەسـترابوونەوە. وە مەکـینەیەکی دوورمـان لەبەر باران لەنێـو ئەو عـارەبانـەیەی بەرامبـەرمان بوو. تەنیـا شتـە بەوەج و کەلکدارەکـانیـان دەربازکردبوو. چەند ژنێ لەنێـو عـارەبانەکانەوە لەبەر باران هەڵتروشکابوون. هەندێکی تریش بەپێـیـان بەتەک عـارەبانەکانیـانەوە دەڕۆیشتن. کاروانە سـەربازییـەکـە سەگیـشی تێکەوت. ئەم سەگانە لەبن گالیسکەکان دەڕۆین. ڕێگاکان قوڕاوی بوون. چاڵەکان. پڕ ئاو ببوون و لە دواوەی دارەکـاندا کە هەردوو لای ڕێگاکـانی لێـوە دیاربوو، کێـڵگەکان

نمدار و تێراو دیاربوون، بەجۆرێ دەربازبوون بەنێویدا کارێکی ستەم بوو. لە ئوتومبیلەکە دابەزیم، لە ڕێگاوە کـەمێ لامـدا تا ڕێگایەکی لاڕێ بدۆزمـەوە و پیـایدا بڕۆیـن و لە کێڵگەکان ڕزگارمان بێ. دەمزانی زۆر لاڕێ هەن بەڵام نەمدەویست لاڕێ بگرمەبەر کە هیچ ئەنجامێکی نەبێ. لە توانامدا نەبوو کە ئەو هەمـوو ڕێگایانە بێنمـەوە یادم کە بەئوتومبیل پیایدا تێپەڕ دەبووین. چونکە زۆر بەپەلە پیایاندا دەڕۆیشتین. ڕێگاکانیش زۆر پێکدەچوون. ئێسـتا لێم ڕوونە کـە دەبێ ڕێگایێ بۆ دەربازبـوون هەر بگرینەبەر تا دەگەینە جێ کەس نازانێ نەمساوییەکان لە چ لایەکن ئاخۆ باری بەرە چۆن دەبێت بەڵام سوڕ دەمزانی ئەگەر باران بوەستێ فڕۆکەکان دەست بەبۆردومانی کاروانە سەربازییەکە بکەن هەموو شتێ دوایی دێ.

لە ئەنجامی ئەمەشدا هەردەبێ چەند سەربازێ ئوتومبیلەکانیان بەجێ بێڵن وە یاچەند ئەسپێ بکوژرێ تاوەکو ڕێگاکە بەتەواوی بگرن. ئێسـتا وا باران بەتوند نابارێ. لەو، باوەڕەدا بووم ڕۆژەکەی خۆش و سامالّ بێ لە قەراغی ڕێگاکە لە ڕۆیشتن بەردەوام بووم ئەو ڕێگا بچـووکـەم بەرچاو کـەوت کـە بەنێـو دوو کـێـڵگەدا بەرەو باکـوور دەڕۆیی کـە هەردوو لای دار و درەخت بوو، وام بەچاک زانی کـە ئەم ڕێگەیە بگرینەبەر. بەپەلە بۆ لای ئوتومبیلەکان گەڕامەوە بە(پیانیم) گوت بسووڕێنەوە لایەکەی تر، خۆشم چووم تا خەبەر بدەمە (بونیلۆ) و (ئایمۆ).

گـوتم: «ئەگـەر ئەم ڕێگـایە بۆ هیـچ لایێ دەرنەچوو ئەوا بەڕێی خـۆمـان دەگـەڕێینەوە دواوە، بەکاروان دەگەڕێینەوە.»

(بۆنیلۆ) پرسی: «ئەی ئەم دووانە؟»

دوو باشچاوشەکە لەسەر کورسی لەگەڵی دانیشـتبوون و ڕیشـیان نەتاشیبوو، بەڵام هێشتا بەم بەیانییە، سەروسەکوتیان لەسەرباز دەچوون.»

گوتم: «بۆ ئوتومبیل پاڵدان باشن.»

چوومە لای ئایمۆ و پێم گوت هەوڵ دەن بەناو کێڵگەکاندا تێپەڕین.

(ئایمۆ) گوتی: «ئەی چی لەم دوو کیژۆڵەیە بکەم؟»

هەردوو کچەکە نوستبوون.

گوتم: «کەڵکیان نییە دەبێت ئی وات لەگەڵ بێ ئوتومبیلەکانمان بۆ پاڵ بدەن.»

ئایمۆ گوتی: «دەکرێ بچنە دواوەی ئوتومبیلەکە لەوێ بەئیسراحەتی خۆیان جێگەیان دەبێ.»

– «ئەگەر تۆ ئەوانت بوێ، باشە. بەڵام هەوڵ دە یەکێکی پشت پان بدۆزەوە کەڵکی پاڵدانی ئوتومبیلی هەبێ.»

ئایمۆ گوتی: «بیر ساگلەرییەکان، پشت پانترین کەسن، پانی پشـتیان پێوراوە. تۆ چۆنی تێنیتا؟»





– «باشم ئەی تۆ؟»

– «باشم بەڵام برسیمە.»

– «شتێ لەڕێ هەر دەستدەکەوێ، ئەوکات دەوەستین، ئەوەی هەبێ دەیخۆین.»

– «قاچت چۆنە تێنیتا؟»

گوتم: «زۆر چاکە.»

لەسەر دۆسەی[١] ئوتومبیلەکە وەستام سەرێکم هەڵبڕی. توانیم پیانی بەدی بکەم، لەلاڕێکەوە دەردەچوو و، دەهاتە سـەر ڕێگاکـەوە. ئوتومـبـیلەکـەی لە نێـوان لقـە دارە ڕووتەکـانی هەردوولای پەرژینەکـەوە دەبینرا. (بۆنیلۆ)ش سـووڕایەوە بەدوای ئەو ملی ڕێگەی گـرت و پاشـان پیـانی ڕێگەی خـۆی گرتە بەر. ئێمـەش بەدوای دوو ئوتومـبیلە فـریاگـوزارەکـان کـەوتین. لە بەراییـدا لە ڕێگایەکی تەنگەبەردا بەناو پەرژینەکـەدا ڕۆیشـتین. ئەم ڕێگایە بەرەو لای خـانووی کـێـڵگەیەک دەچوو بۆنیلۆ و پیـانیـمـان بینی لەناو حەوشەی خانووی کێڵگەیەک ڕاوەستابوون. خانووەکە نزم و درێژ بوو سەردەرەی دەرگـاکـەی کـەپرێکی لەسـەر بوو، دارمـێـوی بەسـەر هەڵگەڕابوو سـەر دەرگـاکـەی داپۆشیبوو. بیرێکی ئاوێی لە حەوشەدا هەبوو. پیانی بۆ ڕادێتەری ئوتومبیلەکەی ئاوی لێ هەڵێنجا. لەبەر ئەوەی بەگـێـڕی نزم ئوتومـبـیلەکـەی لێـخوڕیبوو و ڕادێتـەرەکـەی کوڵاندبووی. خانووی ناو کێڵگەکە چۆڵ کرابوو. سەیرێکی ڕێگاگەی دواوەم کرد بینیم خـانووەکـە لەسـەر بەرزاییێ بوو. بەسـەر دەشـتی دەوروبەری خـۆی دەڕوانی. توانیم پێدەشت و ڕێگا پەرژینکراوەکە و ڕیزی داری سەر ڕێگاکە ببینم کە هێزە کشاوەکەی پیـادا تێدەپەڕی. دوو باشچـاوشـەکە چووبوونە ژوورەوە لە شت دەگـەڕان کچـەکـانیش ئێدار ببوونەوە و سـەیری حەوشـەکە و بیرەکە و ئوتومبیلەکانی بەردەم خانووەکە و سێ شـوفێـرەکـانیـان دەکـرد کە لەسـەر بیـرەکە بـوون باشچـاوشێ هاتە دەرەوە. سـەعـاتێکی بەدەستەوە بوو.

تێم ڕاخوڕی و گوتم: «بیگەڕێنەوە جێگەی خۆی.»

گەڕایەوە ژوورەوە بێ سەعات هاتە دەرەوە.

پرسیم: «هاوڕێکەت لە کوێیە؟»

– «چووەتە ئاودەس.»

چووە لەسەر کوشینی ئوتومبیلەکە دانیشتووە، لەوە دەترسا بەجێی بێڵین.

(بۆنیلۆ) گوتی: «ئەی نانی بەیانیمان ئێنیتا؟ دەبێ شتێ بخۆم گەر زۆر نەخایێنێ.»

– «لەو باوەڕەی ئەم ڕێگایە بمانگەیەنێتە ئەنجامێ.»

– «بەمسۆگەری.»

(١) ئەو شوێنەیە لە نزیک دەرگای ئوتومبیل پێی دەخرێتە سەر تا مرۆڤ سواری ئوتومبیل بێ.

– «زۆر باشە، دەبا بخۆین.»

پیانی و بۆنیلۆ چوونە ژوورەوە.

– «وەرن.»

ئایمۆ بانگی کچەکانی کرد دەستی درێژ کرد تا لە ئوتومبیلەکە دایان بەزێنێ.

خوشکی گەورە سەری ڕازی نەبوونی لەقاند. نەهاتنە ناو خانووە چۆلکراوەکە. هەردووکیان چاویان بڕیبووە ئێمە.

ئایمۆ گوتی: «زۆر کەللە ڕەقن.»

ئێمە پێکەوە چووینە ناو خانووەکە. خانووەکە گەورە و تاریک بوو هەستمان بەچۆڵەوانی دەکرد (بۆنیلۆ) و (پیانی) لەناندین دانیشتبوون پیانی گوتی: «خواردنێکی زۆری تیا نییە. دەستیان پێدا هێناوە و پاکیان کردۆتەوە.»

(بۆنیلۆ پارچە پەنیرێکی سپی لەسەر مێزی ناندینەکە لەتوپەت کرد.

– «ئەم پەنیرەتان لەکوێ بووە؟»

– «لە ژێرزەمینەکە بوو. پیانیش هەندێ سێو و مەی لێ دەرهێنا.»

– «قاوەڵتییەکی باشە.»

پیانی تەپەدۆرە دارینەکەی گۆزە مەیە بەشولکەدار داپۆشراوەکەی هەڵگرت. پاشان مەیەکەی دەرهێنا و مەیەکەی کردە ناو تاوەیەکەوە. پیانی گوتی: «بۆنداره، چەند تاسێک بدۆزەرەوە. بارتۆ.» دوو باشچاوشەکە هاتنە ژوورەوە.

(بۆنیلۆ) گوتی: «باشچاوشینە پەنیر بخۆن.»

باشچاوشێ گوتی: «دەبێ بڕۆین.»

پەنیرەکەی خوارد و مەی بەدوادا فڕکرد.

(بۆنیلۆ) گوتی: «سوپا لەسەر زگ دەڕوات.»

باشچاوشەکە پرسی: «چیی؟»

– «وا باشە نانەکە بخۆین؟!»

– «بەڵێ، بەڵام کاتیش بەنرخە.»

پیانی گوتی: «لەو باوەڕەم بەر لە ئێمە بیژییەکان نانیان لێرە خواردووە» باشچاوشەکە سەیری پیانی کرد. ئەوان زۆریان ڕق لە ئێمە دەبووەوە یەکێکیان لێمی پرسی: «شارەزای ڕێگای.»

گوتم: «نەخێر.»

سەیرێکی یەکتریان کرد. ئەوی یەکەمیان گوتی: «وا چاکە دەست بەڕۆیشتن بکەین.»

گوتم: «دەڕۆین.»





کەمێکی تر مەی سوورم خواردەوە. لە پاش خواردنی پەنیر و سێو زۆر بەتام بوو.

گوتم: «پەنیرەکە، بێنە.»

وام گوت و چوومە دەرەوە (بۆنیلۆ) هاتە دەرەوە گۆزەیەکی گەورەی مەی هەڵگرتبوو.

گوتم: «ئەمە زۆر گەورەیە.»

زۆر بەپەژارە و داخەوە سەیری مەیەکەی دەکرد.

(بۆنیلۆ) گوتی: «منیش هەروای دەخەملێنم. مەتارەکەم بدێ تا پڕی بکەم.»

مەتارەکەی پڕ کرد، هەندێ مەییشی بەسەر ڕێگا بەردینە تەختکراوەکەی حەوشەکەوەدا ڕژا، پاشان کەمۆڵەکەی هەڵگرت و لەناو دەرگاکەی دانا.

پیانی گوتی: «بێ ئەوەی نەمساوییەکان ئەزیەت بکێشن و دەرگاکە بشکێنن دەیدۆزنەوە.»

گوتم: «دەبا بڕۆین. پیانی و من لە بەراییدا بڕۆین.»

باشچاوشەکان لەسەر کوشینی (بۆنیلۆ) دانیشتبوون. کچەکان پەنیر و شێویان دەخوارد. لە ڕێگا تەسکەکەوە دەستمان بەڕۆیشتن کرد. ئاوڕێکم لە ئوتومبیلەکان دایەوە. خانووەکە بەردین و خۆش و نزم و خنجیلانە بوو، پەرژینە ئاسنەکەی بیرەکەش زۆر چاک بوو. ڕێگای بەراییمان تەنگەبەر و قوڕاوی بوو. تانۆکی هەردوولای ڕێگاکە بەرزبوو، لەدواوەشمان ئوتومبیلەکان زۆر نزیک بەدوای یەک کەوتبوون.

## 29

لە نیوەڕۆدا ئوتومبیلەکەمان لە ڕێگایەکی قوڕاویدا چەقی بەمەزندەی ئێمە نزیکەی دە کیلۆمەترێ لە (یۆدین)ەوە دووربوو. باران بەر لەنیوەڕۆ چیتر نەباری، سێ جار گوێمان لە هاژەی هاتنی فڕۆکە بوو. بینیمانن، بەسەر سەرماندا تێپەڕین. ئێمەش تا لێمان دوورکەوتنەوە تەماشامان کرد. بەرەو لای چەپە ڕۆیشتین و گوێمان لە گرمەی بۆردوومانکردنی ڕێگا سەرەکییەکە بوو. بەناو چەندین ڕێگاوبانی لاڕێدا چووین و چەندین کوێرە ڕێمان گرتنەبەر، بەڵام هەمیشە کە بەرەو دوا دەگەڕاینەوە ڕێگایەکی ترمان لێ پەیدا دەبوو و پتر لە (یۆدین) نزیک دەکەوتینەوە. ئوتومبیلەکەی (ئایمۆ) پشتاوپشت دەگەڕایەوە تا لە کوێرە ڕێگایێ ڕزگارمان بێ، ئوتومبیلەکە لە خاکێکی ستەک، لەلایەکی ڕێگاکەوە، چەقی. تایەکانی بەخێرایی دەسووڕان و تاهات زەوییەکەی قوڵتر کرد و زیاتر داچەقی تا بەتەواوی بنی کەوتە سەر زەوی. ئەوەی پێویستە ئەنجامی بدەین هەڵکەندن و خۆشکردنی بەردەمی تایەکان و دانانی هەندێ دەوەن لەژێر تایەکانەوە تاکو زنجیر بگرێ، پاشان ئوتومبیلەکە پاڵدەین تا دەگاتە سەر ڕێگاکە. هەموومان دابەزیبووینە خوارەوە و دەوری ئوتومبیلەکەمان دابوو. دوو باشچاوشەکەش هاتن سەیرێکی ئوتومبیلەکەیان کرد.

تایەکانیان تاقی کردنەوە، دوایی چوونە سەر ڕێگاکە بێ ئەوەی قسەیێ بکەین. منیش بەدوایان ڕۆیشتم، بانگم کردن.

گوتم: «وەرن، هەندێ دەوەن ببڕنەوە.»

یەکیان گوتی: «دەبێ بڕۆین.»

گوتم: «ئیش بکەن دەوەن ببڕن.»

گوتی: «دەبێ بڕۆین.»

ئەوی تریان هیچی نەگوت پەلەی ڕۆیشتنیان بوو، نەوێران سەیرم بکەن.

– «فرمانتان پێدەکەم، بگەڕێنەوە لای ئوتومبیلەکە و هەندێ دەوەن ببڕن.» یەکێ لە باشچاوشەکان ئاوڕێکی قیتی لێ دامەوە.

گوتی: «ئێمە دەبێ بڕۆین. هەمووی ماوەیەکی کەم ماوە و گەمارۆ دەدرێین و ڕێگاتان لێ دەگیرێ. تۆش ناتوانی فرمانمان لەسەر بکەی. خۆ تۆ ئەفسەری ئێمە نیت.»

گوتم: «فرمانتان پێدەکەم دەوەن ببڕن.»

ڕووی خۆیان وەرگێڕا بۆ سەر ڕێگاکە ڕۆیشتن. لێم قیڕاندن و گوتم: «بوەستن.»

بەڕێگایەکی قوڕاوی ڕۆیشتن. بەرەکەی تری ڕێگاکە پەرژین کرابوو. هاوارم کرد: «پێتان دەڵێم. بوەستن.»

ئینجا کەمێ خێراتر ڕایان کرد، کیفی دەبانچەکەم کردەوە، دەبانچەکەم هەڵکێشا. سێرەی دەبانچەکەم کردە زۆربلێیەکە و، گوللەیەکم پێوەنا، بەڵام نەی پێکا. هەردووکیان دایانە بای غارێ، سێ گوللەم لەسەر یەک پێوەنان و یەکیانم بەردایەوە ئەوی تریان بەنێو پەرژینەکە ڕای کرد و لەبەر چاوان بزر بوو. کاتێ بەنێو پەرژینی کیڵگەکەوە ڕای کرد ئاگربارانم کرد، بەڵام دەبانچەکەم گوللەی تیا نەما یەدەگەکی ترم خستەسەر، ئەوساش کار لەکار ترازابوو و لەمەودای گوللە دەرچوو بوو. بەناو کێڵگەکەوە ڕای دەکرد و سەری خۆشی نەوی کردبوو.

کە یەدەگە خاڵی بووەکەم پڕ کردەوە بۆنیلۆ هاتە لام گوتی: «ڕێگەم بدە، با من تەواوی بکەم. دەبانچەکەم دایە دەستی، دابەزینە ئەو شوێنەی ڕێگاکەوە کە باشچاوشی ئەندازیاری لەسەر چاوان لێ کەوتبوو. چووە سەر سەری لوولەی دەبانچەکەی لەسەری کرد و پەنجەی خستە سەر پەلاپیتکەکەی، بەڵام دەبانچەکە چرووکی کرد.

گوتم: «دەبێ دەبانچەکە سواربکەی.»

دەبانچەکەی سوارکرد، دوو گوللەی لێدا، قاچی باشچاوشەکەی بەرزکردەوە ڕایکێشایە لایەکی ڕێگاوە لە تەنیشت پەرژینەکەی درێژکرد و گەڕایەوە و دەبانچەکەی دایە دەستم. بۆنیلۆ سەیری باشچاوشەکەی کرد و، گوتی: «دەبێ بەپەلە هەندێ لقەدار ببڕن. تۆ بڵێیی چ گوللەیێ ئەوی تری پێکابێ؟»





ئایمۆ گوتی: «لەو باوەڕە نیم، لە مەودای دەبانچە دەرچوو بوو.»

پیانی گوتی: «ئای لەو پیس و چەپەڵە.»

هەمووman شولک و لقەدارمان دەبڕییەوە. هەرچییەکی لەناو ئوتومبیلەکە هەبوو دەرهێنرابوو. بۆنیلۆ بەردەمی تایەکانی هەڵدەکەند. کاتێ لە ئیشەکە تەواو بووین، ئایمۆ ئوتومبیلەکەی بەگڕخست. تایەکان لەناو قوڕ و چیلکەدارەکان بەتەناشکردن دەسووڕانەوە. من و بۆنیلۆ ئەوەندە پاڵمان پێوەنا تا ماندوو بووین و هەستمان بەچرق و هۆڕی جومگەکانمان کرد.

بەڵام ئوتومبیلەکە بەهیچ بابەتێ نەجووڵایەوە.

گوتم: «بۆ پاش و پێشی ببە، بارمۆ.»

خستییە بەگ. بۆ پاش و پێش پاڵمان پێوەنا. بەڵام تا دەهات تایەکان عاردیان قووڵتر کرد و زیاتر دەچەقین. تا بنی ئوتومبیلەکە جارێکی تر کەوتە سەرزەوی و تایەکان لە شوێن خۆیان تەنناشیان کرد و بەسەربەستی لەنێو چاڵەکانیاندا سووڕانەوە. منیش ڕاوەستام گوتم:

«با بەگوریس هەوڵێکی بۆ بدەین.»

– «باوەڕ ناکەم هیچ سوودێکی هەبێ تێنیتا ئێمە ناتوانین بەڕاستەو ڕاستی ڕابکێشینە دەرەوە.»

گوتم: «پێویستە تاقی بکەینەوە، بەهیچ ڕێگایەکی تر دەرچوونی نییە.» هەردوو ئوتومبیلەکەی (بیانی) و (بۆنیلۆ)مان بەگوریس لەیەکتری بەستەوە. لەو ڕێگا تەسکەوە تەنیا مەودای چوونە پێش هەبوو بەڵام تایەکە لە پاڵەپەستۆکردنە سەر چاڵەکە بەولاوە هیچی تری نەکرد. هاوارم کرد:

– «بوەستن، ئەم هەوڵەش هەر بێ سوودە.»

(پیانی) و (پۆنیلۆ) لە ئوتومبیلەکانیان دابەزین و هاتنە دواوە. (ئایمۆ)ش دابەزی و هەردوو کچەکەش لە دووری چل یاردەیەکەوە لەسەر دیوارێکی بەردین دانیشتبوون.

(بۆنیلۆ) پرسی: «تۆ دەڵێیی چی تێنیتا؟»

– «زیاتر قووڵی دەکەین و جارێکی تر هەژگ و بژاڵ دادەنێینە ژێرییەوە و هەوڵی بۆ دەدەین.»

سەیرێکی ڕێگەی خوارەوەم کرد. هەڵەی من بوو. بەقسەی من کەوتنە ئەو داوەوە. من ڕێ نیشاندەریان بووم، بۆ ئێرەم هێنان ڕۆژ خەریک بوو لەژێر هەورەوە بێتەدەر. لاشەی باشچاوشەکەش لەلای پەرژینەکەوە کەوتبوو.

گوتم: «چاکەت و پاڵتۆنی باشچاوش لەژێر تایەکان دادەنێین.» (بۆنیلۆ) چوو بیان هێنێ. منیش هەندێ چیلکەدارم کرد. (پیانی) و (ئایمۆ)ش پێشی تایەکانیان هەڵکەند. پاڵتۆکەیم کردە دوو پارچە، لەناو قوڕ لەژێر تایەکانم دانان. پاشان

چیلکەدارەکانی ژێر تایەکانم خڕکردەوە تا تایەکان بگرێ و بگاتە تایەکان، خۆمان تەیاردا، ئایمۆ چووە سەر کوشین و ئوتومبیلەکەی بەگڕخست پاڵمان پێوەنا، تایەکان بەتەناش سووڕانەوە، ئێمەش پاڵمان دەدا، بەڵام بێ سوود بوو.

گوتم: «ئەو تڕەکەڵە سەرناگرێ. چ شتێ وا بەکەلک لەناو ئوتومبیلەکەدا هەیە پێویستیتان پێی هەبێ، بارتۆ؟»

ئایمۆ لەگەڵ (بۆنیلۆ) سەرکەوتنە سەر ئوتومبیلەکە. (ئایمۆ) پەنیر و دوو شووشە مەی و پاڵتۆکەی خۆی هەڵگرتبوو. (بۆنیلۆ) لە پتش سووکانەوە دانیشتبوو گیرفانی چاکەتی باشچاوشی دەپشکنی.

گوتم: «وا بەچاک دەزانم ئەم چاکەتە فڕێ بدەی. ئەی چی لەو دوو کیژۆڵەیە بکەین؟»

پیانی گوتی: «دەتوانن لە دواوە سواربن. باوەڕناکەم ئەمجارە زۆر بەڕێوەبین. زۆری ڕۆییوە کەمی ماوە.»

دەرگای دواوەی ئوتومبیلەکەم کردەوە. بانگی دوو کچەکەم کرد. گوتم: «وەرن سواربن.»

سواری ئوتومبیلەکە بوونەوە. لەسەر کوشینی دواوە لە قوژبنەوە لێ دانیشتن وا پێدەچوو لە تەقەکان بێ خەبەربن. ڕووم وەرسووڕاند و ئاوڕێکم لە ڕێگاکە دایەوە. باشچاوش لەسەر کراسە پیسە قۆڵ درێژەکانی لێ کەوتبوو. لەگەڵ پیانی سواربووم. دەستمان بەڕۆیشتن کرد. دەمانویست بەزەوییەکەدا بڕۆین. کە ڕێگاکە کەوتەوە سەر زەوییەکە لە ئوتومبیل دابەزیم بەرەو پێش چووم. ئەگەر لەم ڕێگایەی ناو ئەم زەوییە دەرچووباینە ئەوا ڕێگایەکی تر لەلایەکەی تر هەبوو. بەڵام مرازمان نەهاتە دی نەمانتوانی پیایدا دەرباز بین. خاکی زەوییەکە ئەوەندە ستەک و قوڕین بوو، ئوتومبیلی لێ دەرنەدەچوو. کاتێ ئوتومبیلەکان بەتەواوی لە زەوییەکە چەقین، تایەکانیان نقووم بوون لەناو زەوییەکە بەجێمان هێشتن. بەپێ بەرەو (ئۆدین) کەوتینە ڕێ، کاتێ گەیشتینە سەر ئەو ڕێگایەی دەچووەوە سەر ڕێگا سەرەکییەکە ئیشارەتم بۆ ڕێگەکە کرد. بەکیژۆڵەکانم گوت: «بڕۆنە سەر ئەو ڕێگایە، لەوێ تووشی خەڵک دەبن.» سەیری منیان کرد، جیزدانەکەمم دەرهێنا، سەرو دە لیری کاغەزیم دانێ گوتم: «بڕۆنە سەر ئەو ڕێگایە. ئەوانەی لێرەن دۆست و خێزانن.»

گوێز بۆ کێ دەژمێری، لێم تێ نەگەیشتن. بەڵام دەستیان لە پارەکە گیرکرد ملی ڕێگەیان گرت و ئاوڕیان لە دواوە دایەوە، دەتگوت لەوە دەترسان داوای پارەکەیان لێ بکەمەوە. تەماشام کردن. لە ڕێگاکە چوونە خوارەوە چارۆگەکانیان لە خۆپێچابوو بەترس و نیگەرانییەوە سەیری دواوەیان دەکرد. سێ شوفێرەکەش پێدەکەنین.

(بۆنیلۆ) گوتی: «ئەی ئەگەر منیش بەو ڕێگایەدا بڕۆم چەند لیرم دەدەیتێ تێنیتا؟»





- «باشتر وایە گەر بشگیرێین لەگەڵ خەڵک بن نەک بەتەنیا.»

(بۆنیلۆ) گوتی: «دوو سەد لیرم بدێ بێ سێ و دوو بەپێ دەگەڕێمەوە نەمسا.»
پیانی گوتی: «بەڵام ڕووتت دەکەن؟»

ئایمۆ گوتی: «لەوانەیە شەڕ کۆتایی بێ.»

ئەوەندەی تێنمان لە لەشی دابوو بەگورجی دەڕۆیشتین تابگەینە سەر ڕێگاکە، ڕۆژ خەریک بوو دەرکەوت. لەتەک ڕێگاکەوە دارتوو هەبوون. لە نێوان دارەکاندا توانیم دوو ترێلە بەدی بکەم، لەناو زەوییەکاندا چەقیبوون. (پیانی) سەیرێکی کردن و گوتی: «دەبێ لەنوێوە ڕێگایەکیان بۆ دروست بکرێ تا دەریان بێنین.»

(بۆنیلۆ) گوتی: «ئەی مەسیح، خۆزیا پایسکلمان هەبوایە.» (ئایمۆ) پرسیاری لێ کردم و گوتی: «ئەرێ خەڵک لە ئەمریکا سواری پایسکل دەبن؟»

- «پێشان سوار دەبوون.»

(ئایمۆ) گوتی: «پایسکل لێرە شتە شت، پایسکل شتێکی مەزنە.»

(بۆنیلۆ) گوتی: «ئەی مەسیح خۆزیا پایسکلمان هەبوایە. من لەو پیاوانە نیم بەپێیان بڕۆم.»

گوێم لە دەنگی تەقە بوو لە دوورەوە دەنگی دەهات، گوتم: «دەبێ ئەمە دەنگی تەقەبێ؟»

ئایمۆ گوتی: «نازانم.»

گوێی بۆ ڕادێرا. گوتم: «وابزانم دەنگی تەقەیە.»

پیانی گوتی: «بەر لە هەموو شتێ هێزی سوارە دەبینین.»

- «باوەڕناکەم هێزی سوارەیان هەبێ.»

(بۆنیلۆ) گوتی: «لە مەسیح دەپاڕێمەوە کە ئەم هێزەیان نەبێ. حەز ناکەم بە ڕمی سوارەیان برینداربم.»

کاتێ بەپەلە دەڕۆیشتین پیانی گوتی: «وابزانم تۆ ئەو باشچاوشەت کوشت. تێنیتا؟»

(بۆنیلۆ) بەوەڵام هات. «من کوشتم. بەدرێژایی ئەم شەڕە هەرگیز کەسم نەکوشتووە، بەڵام بەدرێژایی ژیانم بەئومێدی کوشتنی باشچاوشێ بوومە.»

پیانی گوتی: «زۆر بەکرِ و هێنمی ئەوت کوشت، کە کوشتت زۆر بەخێرایی ڕای نەدەکرد.»

- «گوێی مەدێ. ئەوە تاکە شتێکە بیری لێ دەکەمەوە. من ئەو باشچاوشە...م کوشت.»

ئایمۆ پرسی: «لەکاتی دان پێنان چی دەڵێی؟»

– «دەڵێم لەو گوناهە پاکم بکەوە، باوکە، من باشچاوشێکم کوشتووە.» هەموومان پێکەنین.

پیانی: «ئەو مرۆڤێکی ئاژاوەخوازە. هەرگیز ناچێتە کلێسەوە.»

(بۆنیلۆ): «پیانیش ئاژاوەخوازە.»

لێم پرسی: «ئایا ئێوە بەڕاستی ئاژاوەخوازن؟»

– «نەخێر، تێنیتا، ئێمە سوسیالست خوازین. خەڵکی (ئامۆلا)ین قەت هاتوویتەوێ؟»

– «نەخێر.»

– «بەعیسا جێگایەکی خۆشە تێنیتا. پاش تەواوبوونی شەڕ وەرە وێندەر، هەندێ شتت نیشان دەدەین.»

– «هەمووتان سوسیالیستن.»

– «هەمووی سوسیالیستە.»

– «شارێکی خۆشە؟»

– «دڵارایە. شاری وا خۆشت لە ژیانتا هەر نەدیوە.»

– «چۆن بوون بەسوسیالیست.»

– «ئێمە هەموومان سوسیالیستین. هەموو کەسێ سوسیالیست خوازە هەردەم سوسیالست خواز بووین.»

– «تێنیتا وەرە وێ، تۆش دەکەین بەسوسیالیست.»

ڕێگاکە لە ڕامان بۆ لای چەپ دەسووڕایەوە، گردێکی بچووکی لێ بوو لە پشت شوورەیەکی بەردین باخچەی سێو هەبوو. لەو شوێنەی ڕێگاکە بەسەر گردەکە دەکەوت لەقسەکردن وەستاین. زۆر بەخێرایی پێکەوە ڕۆیشتین. وەک بڵێی قۆشمە لەگەڵ کات بکەین.

## 30

پاشان هاتینە سەر ڕێگایێ کە دەچووەوە سەر ڕووبارێ. ڕیزێکی درێژ لە ئۆتومبیل و ترێلە و عەرەبانە بەجێماوەکان، لەو سەری ڕێگاکەوە تا دەگەیە پردەکەوە ڕیز ببوون. کەس دیار نەبوو و ئاوی ڕووبارەکەش زیادی کردبوو. پردەکە لە ناوەڕاستەوە تەقێنرابووەوە. تاقە بەردینەکەی پردەکە نقوم ببووە ناو ئاوە هەڵساوەکە. ئاوێکی قوڕاوی بەسەریدا دەڕۆیشت، چووینە سەر کەناری ڕووبارەکە لە بوارێک دەگەڕاین تا پیایدا بپەڕینەوە دەمزانی گەر بەرەو پێشتر بچین، پردێکی هێڵی شەمەندەفەر لەو سەرییەوە هەیە دەتوانین پیایدا بپەڕینەوە. پیادەڕێیەکە تەڕ و قوڕاوی بوو. هیچ





تیپێکی سەربازیمان نەبینی تەنیا ترێلە بەجێماوەکان و زەخیرەکانیان نەبێ، بەدرێژایی ڕۆخی ڕووبارەکە، هیچ دیار نەبوو، تەنیا دەوەنە تەڕەکان و عاردێکی قوڕاوی نەبێ. بەقەراخی ڕووبارەکە ڕۆیشتین تا لە دواییدا پردەکەی هێڵی شەمەندەفەرمان بینی. ئایمۆ گوتی: «پردێکی چەند جوانە!»

پردێکی ئاسنی درێژ و ساکاربوو لەسەر بەستێ[1] دروست کرابوو. گوتم: «وا باشە بەپەلە بپەڕینەوە، بەرلەوەی بۆردومانی بکەن و بیڕووخێنن. پیانی گوتی: «کەس لێرە نەماوە بیڕووخێنێ، هەموویان ڕۆیشتوون.»

بۆنیلۆ گوتی: «لەوانەیە مینی لێ داندرابێتەوە. تێنیتا تۆ لە پێشدا بپەڕەوە.»

ئایمۆ: «گوێ لەو ئاژاوەچییە بگرە. پێی بڵێ با ئەو لە پێشدا بپەڕێتەوە.»

گوتم: «من دەپەڕمەوە باوەڕناکەم مینی وا لێ داندرابێتەوە بەقورسایی پیاوێ بتەقێتەوە.»

پیانی گوتی: «دەبینی ئەوەیە مێشک. تۆ بۆچی هۆشت نییە ئەی ئاژاوەچی؟.»

بۆنیلۆ: «گەر هۆشم هەبوایە لێرە نەدەبووم.»

– «ئەمەیان زۆر جوانە، تێنیتا.»

گوتم: «ئەمەیان جوانە.»

لە پردەکە نزیک بووینەوە جارێکی تر ئاسمان هەوری هێنایەوە، کەمێ بارانی لێ دەهات. پردەکە درێژ و پتەو دیاربوو. بەسەر لێواری پردەکە هەڵگەڕاین.

گوتم: «یەک بەدوای یەک وەرن.»

دەستم بەپەڕینەوە کرد. بەدوای بەربەست و وایەر یا هەر نیشانەیەکی تەقینەوە گەڕام، گەر هەبێ بەڵکو بەرچاوم کەوێ بەڵام هیچم بەرچاو نەکەوت. سەیری کەلێنی تەختەکانم دەکرد. ئاوی ڕووبارەکە قوڕاوی و تیژڕۆ بوو. زۆر لە دوورەوە لە دەشتە شێدارەکەدا، لەبەر بارانەکە (ئۆدین)م بەدی کرد. لەسەری پردەکەوە سەیری دواوەم کرد پردێکی تر لەسەر ڕووبارەکە هەبوو. کە تەماشام کرد ئۆتومبیلێکی زەردی ڕەنگ قوڕاوی بەسەردا دەپەڕییەوە. تەنیشتەکانی پردەکە بەرزبوون بۆیە هاکا لەبەر چاوان گوم بوو. بەڵام سەری شوفێرەکە و پیاوێکی تەکی، لەگەڵ سەری دوو پیاوی تریشم بینی لە دواوە دانیشتبوون. هەموویان کڵاوزرێی ئەڵمانیان لەسەربوو. ئۆتومبیلەکە لە پردەکە پەڕییەوە لە نێوان دارودرەخت و ئۆتومبیلە بەجێماوەکاندا بزر بوو. دەستم بۆ ئایمۆ لەقاند، کە دەپەڕییەوە و ئەوانی تری بەدوادا بێن. خۆم لەسەر زەوی لە تەنیشت لێواری هێڵی شەمەندەفەر مات کرد، ئایمۆش هات خۆی لەسەر زەوی لەگەڵ من مات کرد. لێم

(١) بەست: لەجیاتی (dry nier) بەکارهاتووە چونکە تەنیا لە زستان و بەهاردا ئاو بە بەستدا دەڕوا.

پرسی: «ئوتومبیلەکەت بینی؟»

– «نەخێر، سەیری تۆمان دەکرد.»

– «ئوتومبیلێکی دەستەی ئەڵمانی لە پردەکەی ئەو سەر پەڕینەوە.»

– «ئوتومبیلی دەستەی ئەڵمانی؟»

– «بەڵێ.»

– «ئەی مریەمی پیرۆز.»

ئەوانی تریش هاتن لە تەنیشت لێوارەکە لەنێو قوڕ خۆیان مات کرد. لە هێڵی شەمەندەفەرەکەوە سەیری پردەکە و، ڕیزە دارەکان و، مەتەرێز و، ڕێگاکەمان دەکرد.

– «لەو بڕوایە دای کە ڕێگەی گەڕانەوەمانیان لێ گرتبێ، تێنیتا؟»

– «نازانم هەر ئەوەندە دەزانم ئوتومبیلێکی ئەڵمانی بەسەر ڕێگاکەدا تێپەڕی.»

– «تۆ گاڵتە ناکەی تێنیتا؟ شتێکی عەنتیکەت لە مێشکا ناخولێتەوە؟»

– «گاڵتەت پێ نێ. بۆنیلۆ؟»

پیانی گوتی: «ڕاتان لەسەرە سەرو پێکێ بخۆینەوە؟ گەر ڕێگەمان لێ گیرابێ وا چاکە سەرو پێکێ بنۆشین.»

مەتارەکەی دەرهێنا و سەری فلینەکەی کردەوە.

ئایمۆ دەستی بۆ ڕێگاکە درێژ کرد و گوتی: «سەیرکە، سەیرکە!»

لەو سەری پردە بەردینەکەوە توانیمان چەند کڵاوزرێیەکی سەربازی ئەڵمانی بەدی بکەین، دەجوولانەوە. خۆیان بۆ پێشەوە داهێنابووەوە بەهێواشی دەڕۆیشتن لە باری زۆر نائاساییدا بوون. تا لە پردەکە پەڕینەوە چاومان لێیان بوو. لە پۆلی پایسکل سواران بوون. ڕووی ئەو دوانەی پێشەوەم بینی، ڕوومەت سوور و لەش ساغ دیاربوون. کڵاوەکانیان داکشابووە سەر نێوچەوانیان و دەموچاویان. تفەنگەکانیان لە پایسکلەکانیان قایم کرابوو. نارنجۆکەکانیان بەقایشەکانیان شۆڕببووەوە، کڵاوەکانیان و جلە بۆرە سەربازییەکانیان تەڕببوون. هێدی هێدی بەسواری پایسکلەکانیان دەڕۆیشتن. تەماشای پێش و ڕاست و چەپەی ڕێگەکەیان دەکرد. دوو سوار لەبەرایییدا، چوار لەڕیز یەک و پاشان دووی تر. پاشان ژمارەیێ نزیکەی دوازدە، پاشان دوازدەی تر پاشان یەک یەک بەتەنیا دەهاتن، نقەیان لێوە نەدەهات، بەڵام ئێمەش لەبەر هاژەی ڕووبارەکە گوێمان لە هیچ نەدەبوو. لەبەر چاوان بزربوون. گەیشتنە ئەو سەری ڕێگاکەوە.

ئایمۆ گوتی: «ئەی مریەمی پیرۆز.»

پیانی: -«ئەوانە ئەڵمانی بوون. نەمساوی نەبوون.»

گوتم: «بەڵام بۆچی کەس نییە بەرایییان لێ بگرێ؟ ئەی بۆچی پردەکەیان





نەتەقاندۆتەوە؟ بۆچی هیچ ڕەشاشێکیان لەسەر ئەم لێوارانە دانەناوە؟»

بۆنیلۆ: «تۆ خۆت پێمان بڵێ. تێنیتا.»

زۆر تووڕە ببووم گوتم: «هەموو ڕەفتارێکیان بەشێتییە لە خوارەوە پردێکی بچووکیان تەقاندۆتەوە. کەچی ئەم پردەیان لەسەر ئەم ڕێگا سەرەکییە بەجێهێشتووە و نەیان تەقاندۆتەوە. کوا ئەوانە لەکوێن؟ بۆ هەوڵ نادەن ڕایان گرن.»

بۆنیلۆ: «خۆت وەڵاممان بدەوە. تێنیتا»

بێدەنگ بووم، ئەوە بەهیچ جۆرێ ئیشی من نییە. ئەوەی ئیشی من بوو، ئەوەی لەسەرم پێویست بوو دەبوایە لەگەڵ سێ ئوتومبیلە فریاگوزارەکان بگەمە (پۆردینون). لەم کارەش سەرنەکەوتم. ئەوەی لەسەرمە ئەنجامی بدەم. دەبێ بگەمە (پۆردینون) لەوانەشە نەگەمە (ئۆدین) قیروسیا... گەر نەشتوانم. بەڵام گرینگ ئەوەیە دەبێ بێدەنگ بم و نەکوژرێم و نەگیرێم.

بە (پیانی)م گوت: «زەحمەت نەبێ سەری مەتارەکەت ناکەیتەوە؟» مەتارەکەی دامەدەست و فڕێکی گەورەم لێ فڕ کرد. گوتم:

– «وا چاکە بڕۆین. هەر چەندە پێویست بەپەلە ناکا. دەتانەوێ شتێ بخۆم؟»

بۆنیلۆ گوتی: «ئێرە جێگای مانەوە نییە.»

– «دەباشە بابڕۆین.»

– «ئایا ئەولایە بگرین تا نەمان بینن؟»

– «واچاکە لەسەرەوەی ڕێگاکەوە بڕۆین. لەوانەیە هەر بەسەر ئەم ڕێگاوە بێن ئێمەش نامانەوێ ئەوان بگەنە سەر سەرمان. بەر لەوەی بیانبینین.»

بەڕێگەی شەمەندەفەردا ڕۆیشتین. دەشتی نمدار لە هەردوولاماندا درێژ ببووەوە لە دووری دەشتەکەدا گردی (یۆدین) بەدی کرا. سەربانی خانووەکانی سەر گردەکە ڕمابوو. قوللەی زەنگ و قوللەی سەعاتی کلێسەمان لێ دیاربوو. بنە دارتووێکی زۆر لە کێڵگەکاندا هەبوون. چاوم بەهێڵێکی شکاوی پەککەوتووی شەمەندەفەر کەوت. تەختەدارەکانی ژێر ئاسنەکە فڕێ درابوونە سەر لێواری ڕێگاکە.

ئایمۆ گوتی: -«خۆتان مات کەن. خۆتان مات کەن.»

لەسەر لێوارەکە خۆمان بەعاردی دادا دەستەیەکی تری پایسکل سوار بەسەر ڕێگەکەدا تێپەڕین. لە لێواری ڕێگەکەوە سەیرم کردن. بەرەوپێش دەچوون دوور کەوتنەوە.

ئایمۆ گوتی: -«ئێمەیان بینی بەڵام ڕەت بوون.»

بۆنیلۆ: -«لێرە دەکوژرێین تێنیتا.»

گوتم: -«ئێمەیان ناوێ. بەدوای شتی تردا دەگەڕێن. ئەوکاتە ئەم هێڵەی

شەمەندەفەر ڕاستەوخۆ بەرەو شار دەچوو. بەناو کێڵگەیەکی نزمدا دەچوو. هێڵێکی تری شەمەندەفەرمان لە پێش خۆماندا بینی، بۆ باکووریش ڕێگا سەرەکییەکە بوو کە پایسکل سوارمان لەسەر بینی، بۆ باشووریش ڕێگایەکی ناسەرەکی بچووک هەبوو بەناو کێڵگەکاندا تێپەڕ دەبوو، کە لە هەردوولای دارودرەخت بوو.

خۆم وام بەچاک زانی لای باشوور بگرینە بەر و بەدەوری شاردا بسووڕێینەوە، بەڕێگاکە دەشتەکە ببڕین و بەرەو (کامپۆفۆرمیو) وە دەشتوانین لە ڕێگا سەرەکییەکە دوور کەوینەوە بچینە (تاگلیەمینتۆ) بەمەرجێ ڕێگا سەرەکییەکانی پشت (ئۆدین) بگرینەبەر. دەمزانی کە ژمارەیەکی زۆر لاڕێ لەنێو دەشتەکەدا هەبوون. لەسەر لێوارەکە هاتینە خوارەوە. گوتم: «وەرنە دوام.»

دەمانتوانی بەرەو لاڕێیەکان بڕۆین. بەرەو باشووری شار بکشێین. هەموومان لەسەر لێواری ڕێگاکە دابەزین. لەلاڕێیەکەوە گوللەیەکمان ئاڕاستەکرا. گوللەکە لە قوڕی لێوارەکە چەقی.

هاوارم کرد: «بگەڕێنەوە دواوە.»

بۆ لێوارەکە گەڕامەوە. لەناو قوڕدا خزیم شوفێرەکان لەبەرامبەرماندا بوون. ئەوەندەی خوا تینی دابوومێ بەخێرا و بەپەلە بەرەو سەر لێواری ئاسنەڕێیەکە چووم. کاتێ ئامیۆ دەیویست لە لێوارەکە بپەڕێتەوە ڕەتی برد و بەلا داهات و دەواو دەم بەربۆوە. بۆ لایەکەی تر ڕامان کێشا وەرمان گێڕایە سەر پشت. گوتم: «دەبێ سەری بەرزکەینەوە.»

پیانی ئەوی جوولاند و سەری بەرزکردەوە. ئامیۆ لەناو قوڕدا لەلایەکی سەر لێوراەکەوە کەوتبووە گۆڕێ. پێیەکانی بەرەو خوار چووبوون خوێن بەناڕێکی لەگەڵ هەناسەی فرچلەی دەکرد. ئێمە هەرسێکمان دەست لە ئەژنۆ لەژێر باران لەسەرسەری هەڵتوترکاین. گوللەکە بەپشت ملی کەوتبوو. بەرەو لای سەری چووبوو لەژێر چاوی ڕاستییەوە هاتبووە دەرەوە. لەوکاتی ویستم خوێنەکەی لە هەردوو جێگە بریندار بووەکەی ڕابگرم، مالئاوایی کرد. پیانی سەری (ئامیۆ)ی لەسەر زەوی دانا. دەموچاوی بەپارچە پەڕۆکێکی تیماری سڕییەوە و وازمان لێ هێنا.

پیانی گوتی: «ئەو...»

گوتم: «ئەڵمانی نەبوون. نابێ هیچ ئەڵمانیێ لێرە هەبێ.»

پیانی گوتی: «ئیتاڵین. ئیتاڵیانی.»

ئەم وشەیەی دوایی وەکو نازناوێ بەکارهێنا.

بۆنیلۆ هیچی نەگوت، لە تەنیشت ئامیۆ دانیشتبوو، بەڵام تەماشای نەدەکرد پیانی شەپقەکەی (ئامیۆ)ی هەڵگرتەوە، لەسەر لێوارەکە غلۆر ببووە خوارەوە، لەسەر دەموچاوی دانایەوە. مەتارەکەشی دەرهێنا پیانی مەتارەکەی بۆ بۆنیلۆ ڕاگرت و، گوتی: «فرێ ناخۆیتەوە؟.»





بۆنیلۆ گوتی: «نەخێر.»

ڕووی تێکردم و گوتی: «لەهەر دەقەیێ بوایە، دەبوایە لەسەر ئەم هێڵە ئەوەمان بەسەر هاتبایە...»

گوتم: «نەخێر، لەبەر ئەوەبوو، بەکێڵگەکەدا تێپەڕین؟»

گوتم: «ئەوانەی تەقەیان کرد ئیتاڵی بوون. ئەڵمانی نەبوون.»

بۆنیلۆ گوتی: «گەر ئەڵمانی بوانە هەموومانیان دەکوشت.»

گوتم: «ئیتاڵییەکان بۆ ئێمە زیاتر جێگەی مەترسین نەک ئەڵمانییەکان پاسەوانی پاشەوەی لەشکر لە هەموو شتێ دەترسێ. ئەڵمانییەکان خۆیان دەزانن. بەدوای چیدا دەگەڕێن؟»

بۆنیلۆ گوتی: «ئەوە لێکدانەوەیەکی دروستە تێنیتا؟»

پیانی گوتی: «ئێستا بۆ کوێ بچین؟ جێگەی مەترسی دەبێ گەر لەناکاو بێنە سەرمان.»

بۆنیلۆ: «من وا بەچاک دەزانم، لێرە بڕۆم و لەبەر چاوان نەبم.»

– «زۆر چاکە بەسەر هێڵی ئاسنیدا دەڕۆین.»

ئامیۆ پرسی: «لەو باوەڕەی بەساغی دەربچین؟»

– «مسۆگەر دەردەچین. هێشتا ژمارەیان ئەوەندە زۆر نەبووە. دەتوانین لە تاریکیدا بڕۆین.»

– «ئەم ئوتومبیلە چی دەکرد.»

گوتم: «خوا دەزانێ.»

بەسەر ڕێگەی شەمەندەفەر لە ڕۆیشتن بەردەوام بووین. بۆنیلۆ لە ڕۆیشتنی ناو قوڕاوی سەر لێوارەکە ماندوو ببوو. گەڕایەوە هاتەوە لای ئێمە. ڕێگەی شەمەندەفەرەکە لە ڕێگە سەرەکییەکە دوور دەکەوتەوە بەرەو خوار دەکشا، ئیتر لە توانامان نەما بزانین چ بەسەر ڕێگایەکەوە ڕەت دەبێ. پردێکی بچووکی سەر کەندێ تەقێندرابووەوە، بەڵام بەسەر دینگەکاندا پەڕینەوە، لە ڕۆیشتن بەردەوام بووین. گوێمان لە دەنگی تەقە بوو. لەپێشەخۆمان گوێمان لەدەنگی تەقەبوو. هاتینە سەر ڕێگاکەی دواوەی کەندەکەوە.

– «وا چاکە لە جێگاییێ خۆمان حەشار دەین. تا تاریک دادێ، ئەوکات گەر بتوانین بەرەو خوارووش بچین، بەسەلامەتی دەردەچین.»

بۆنیلۆ: «لە دەستیان دێ هەموومان بدەنە بەر ڕێژنەی گوللە، تاوەکو بسەلمێنن کە جاری پێشووش ڕاست بوونە تەقەیان کردووە. من ناچم ئەوان تاقی بکەمەوە.»

– «دەبێ شوێنێ لە نزیک (ئۆدین) بۆ خۆحەشاردان بدۆزینەوە. جا کاتێ تاریک دابێ دەست بەڕۆیشتن دەکەین.»

بۆنیلۆ: «کەوابێ بابڕۆین.»

دابەزینە لای باکووری لێوارەکە ئاوڕێکم لە دواوە دایەوە. ئایمۆ لە دامێنی لێوارەکە لەناو قوڕدا کەوتبوو. زۆر بچووک دیاربوو، باسکەکانی بۆ هەردوولا درێژ ببوون. قاچەکانیشی بەلەک پێچیان لێ بەسترابوو. پۆتینە قوڕاوییەکانیش بەرامبەر یەک بەقیتی وەستابوون. شەبقەکەی لەسەر ڕووی بوو وا پێدەچوو ماوەیەکی لە مێژە مردووە. باران دەباری. ئایمۆم وەک هەموو کەسێکی تر کەناسیم خۆش دەویست. کاغەزەکانی وا لەناو گیرفانمە، نامەیێ بۆ ماڵەوەیان دەنووسم.

لە دەرەوە لە بەرابیمان لەناو کێڵگەکان خانووێک هەبوو بەداردرەخت دەور درابوو. ساختمانی ناو کێڵگەکەش لە بەرامبەر خانووەکە دروست کرابوو. تەلارێکی هەبوو لەسەر ئەستووندان ڕاگیرابوو.

گوتم: «واچاکە کەمێ لێک دوورکەوینەوە. بەڵام خۆم لە پێشدا دەڕۆم.»

بەرەو لای خانووەکە چووم، لەناو کێڵگەکەدا پیادەڕێیێ هەبوو، کە بەکێڵگەکەدا تێپەڕ دەبووم، یەکێ، جا نازانم کە لەناو درەختەکانی نزیک خانووەکە وەیا لەناو خانووەکەوە، تەقەی پێوەناین. لە خانووەکە نزیک بوومەوە تا زۆر بەچاکی خانووەکەم بینی. تەلارەکە لەگەڵ کادینێکی دەرەوە تێکیان دەکردەوە. لە نێوان ئەستووندەکاندا کا دەهاتە دەرەوە. حەوشەکەی بەردڕێژ بوو، دارەکانیان بارانیان پیا دەچۆڕایەوە عارەبانەیەکی دوو تایەی گەورە جێ دەستەکانی ڕوو لە ئاسمان، لەبەر باران دانرابوو. هاتمە ناو حەوشەکە، پیایدا تێپەڕیم، لەبن تارمەی هەیوانەکەی ڕاوەستام، دەرگای ژوورەکە کرابووەوە، چوومە ژوورەوە پیانی و بۆنیلۆ بەدوامدا هاتن. ژوورەوە زۆر تاریک بوو گەڕامەوە ناندین، ئاگردانەکە خۆڵەمێشی تیابوو. قۆری لەسەر داندرابوو. بەڵام هیچی تیانەبوو. چاوم بەولاو بەولادا گێڕا هیچ خواردەمەنییەکم بەرچاو نەکەوت.

گوتم: «دەبێ لەناو کادینەکە پاڵکەوین. پیانی لەو باوەڕەی شتێ بدۆزینەوە و بیهێنینە ئێرە تا بیخۆین.»

پیانی: «سەرێکی پیادا دەگرم.»

بۆنیلۆ: «منیش دەگەڕێم.»

گوتم: «زۆر باشە. منیش سەر دەکەوم و سەیرێکی کادینەکە دەکەم.» پێبلکەیەکی بەردینم بینی لەتەک تەویلەی خانووەکەوە بەرزدەبووەوە. تەویلەکە لەبەر باران، بۆنێکی وشکی خۆشی لێ دەهات. مێگەل نەمابوو، لەوانەیە لەکاتی ڕاکردنیان لەگەڵ خۆیان ڕاپێچیان دابن، کادینەکە نیواو نیو بوو، سەرەوەی دوو پەنجەرەی تێگیرابوو یەکێکیان بەتەختە گیرابوو، ئەوی دیش کلاوڕۆژنەیەکی تەسکی بچووک بوو کە لەلای باکوورەوە بوو. کەلێنێکی لێژی تیابوو تا لەوێوە کا بۆ مێگەل فڕێ بدەنە خوارەوە. تەختەداری درێژیش لە جێگا بۆشەکە تێک پەڕێندرابوون و تا سەر عەردەکەی ئەو شوێنە درێژ ببوونەوە کە عارەبانەکان دەهاتنە ژێریەوەی کە لە کاتی کاتێفڕێدان بەرزدەکرانەوە تا





کایان تێ بکرێ. گوێم لە ترپەی باران بوو کە بەسەربانەکە دەکەوت. بۆنی کام بۆهات. کاتێ چوومە خوارەوە. بۆنێکی پاکی شیاکەی وشکی ناو تەویلەکەم کرد. توانیمان تەختەدارێک هەڵگرین لە پەنجەرەی لای خوارەوە تەماشای حەوشەکە بکەین. پەنجەرەکەی تریش بەسەر ئەو کێڵگەیەی دەڕوانی کە بەرەو باکوور دەکشا. بەهەریەکێ لەم پەنجەرانەوە دەمانتوانی سەرکەوینە سەر بانەکە. پاشانیش دابەزینە خوارەوە. یا بەکەلێنە لێژەکەی کادینەکە دابەزین. ئەگەر پێبلکەکە بەکار نەهاتبا. کادینێکی گەورەبوو دەمانتوانی لەناو کایەکەی خۆمان حەشار دەین، ئەگەر گوێمان لە پێخوستی هەر کەسێک بوایە. واپێدەچوو جێگەیەکی چاک بێ. دڵنیابووم کە دەمانتوانی بەرەو خوار بڕۆین ئەگەر تەقەمان لێ نەکرابوا. ئەستەم بوو ئەڵمانییەکان لەم ناوچەیەدا هەبن. ئەوان لە باکوورەوە دەهاتن، لە ڕێگەی (سفیدال)ەوە دەهاتنە خوارەوە. نەدەکرا لە باشوورەوە بێن. ئیتاڵییەکانیش زیاتر جێگەی مەترسی بوون. لە خۆیان دەترسان، هەر شتێکیان بدیبا ئاگربارانیان دەکرد شەوی ڕابردوو لە کاتی کشانەوە بیستم ژمارەیێ ئەڵمانی بەجلوبەرگی ئیتاڵی لە باکوورەوە هاتوونەتە ناو سوپای کشاوە. باوەڕم بەم قسەیە نەکرد، ئەمەش هەر شتێکە لەو بابەتانەی کە هەموو جار لەسەر بەرگوێمان دەکەوێ، ئەمەش شتێکە دوژمن بەرامبەرت بەکاری دێنێ. ئێمەش هیچ کەسێکی وا ناناسین بەجلوبەرگی ئەڵمانی چووبێتە ناوەوانەوە تا سەر لەوان تێک بدا. لەوانەشە وایان کردبێ بەڵام ئەمە زەحمەت بوو. باوەڕناکەم ئەڵمانییەکان وابکەن. ناچار نین وا بکەن، پێویست بەوە ناکا سەر لە سوپا کشاوەکەمان تێک بدەین. قەوارە و گەورەیی سوپاکە و کەمی ڕێگاکان وای کردووە ئەم پروپاگندەیە بڵاوببێتەوە. کەس فرمانی دەرنەکردووە. لە ئەڵمانییەکانیش بگەڕێ بۆ خۆیان و خوایان. سەرەڕای ئەوەش ئاگربارانمان دەکەن و وادەزانن ئێمە ئەڵمانین. (ئایمۆ)یان کوشت. خۆ کایەکەش بۆنی خۆش بوو. پاڵکەوتنیش لەناو کای کادینەکە بەس بوو بۆ ئەوەی زەلیل و مەلوولی ساڵانی ڕابردووت لە بیر بەرێتەوە. لەناو کایەکە لێ درێژ بووین و قسەمان دەکرد بەقرمە چۆلەکەمان دەکوشت. کاتێ لەسەر سێگۆشەیەکی کراوەی سەر دیواری کادینەکە دەنیشتن. ئەو کادینە ئێستا نەماوە. لەماوەی ساڵێکدا دارستانەکەی داری شۆکرانیان هەموو بنبڕ کرد. جگە لە کۆڵکەکان و سەر لقی وشک و داری سووتەمەنی هیچی تر نەمایەوە.

ناتوانی بگەڕێتەوە دواوە. گەر بۆ پێشەوە نەچین چی ڕوو دەدا؟ هەرگیز ناگەڕێینەوە میلانۆ؟ گەر گەڕاینەوە چی دەبێ؟ گوێم بۆ تەقە شل کرد. لە باکوورەوە بەئاڕاستەی (ئۆدین)ەوە هاوێشترا. دەنگی ڕەشاشیش گەیشتە گوێم. بۆردومانی تۆپی بەدواوەبوو. ئەمەش بێ ئەسەر نییە.

لەوانەیە لە تیپی سەربازییان بەسەر ڕێگاوە دیبێ. لەلا پەنجەرەیەکی کادینەکەوە سەیری خوارەوەم کرد بینیم پیانی لە نزیک جێگای کا بارکردن وەستاوە. دوو پارچە

باسترمەی درێژ و گۆزەیەک و دوو شووشەی مەی لەبن هەنگڵیەوە هەڵگرتبوو.

گوتم: «سەرکەوە، ئەوەتە پێبلکە.»

دوایی زانیم دەبێ لەبەر شتەکان یارمەتی بدەم. دابەزیم، لەبەر پاڵکەوتن لەناو کایەکە مێشکم لای خۆم نەمابوو، مەیلەو خەوتبووم.

پرسیم: «کوا بۆنیلۆ؟»

گوتی: «ئێستا پێت دەڵێم.»

بەنەردەبانەکە سەرکەوتین هەرچییەکی لامان بوو لەسەر کایەکەمان دانا. (پیانی) قەڵەمبڕەکەی خۆی دەرهێنا قەپاغە تەپەدۆرەکەی، بەسەرە تەپەدۆر هەڵگرەکە کردەوە. سەری بوتڵە مەیەکەی کردەوە.

گوتی: «سەر مۆرە. دەبێ باش بێ.»

زەردەخەنەیەکی گرت:

پرسیم: «بۆنیلۆ لە کوێیە؟»

پیانی سەیرێکی منی کرد و گوتی: « ڕۆیشت. تێنیتا. چوو خۆی بدات بەدەستەوە.»

هیچم نەگوت.

– «لەوە دەترسا بکوژرێ.»

بوتڵەکەم هەڵگرت و نوقەم لێوە نەهات.

– «خۆ دەبینی، ئێمە هەرگیز بڕوامان بەشەڕ نییە تێنیتا؟»

پرسیم: «ئەی تۆ بۆچی نەڕۆیشتی؟»

– «نەمویست تۆ بەجێ بێڵم.»

– «بۆ کوێ چوو؟»

– «نازانم. تێنیتا، دەزانم ڕۆیشت.»

گوتم: «زۆر باشە باسترمەکە لەت ناکەی؟»

پیانی لەبەر ڕووناکی کزەکەوە سەیرێکی کردم و گوتی: «کە قسەم لەگەڵ دەکردی لەتم کرد.»

لەناو کایەکە دانیشتین. باسترمەکەمان خوارد و مەیەکەمان خواردەوە. لەوانەیە ئەو مەیەیان بۆ کاتی زەماوەند هەڵگرتبێ. زۆر کۆن بوو. لە کۆنیان ڕەنگیان نەمابوو.

گوتم: «(لوێگی) تۆ لەم پەنجەرەوە سەیری سەرەوە بکە، منیش لە پەنجەرەکەی ترەوە تەماشای دەرەوە دەکەم.»

هەریەک لە ئێمە بوتڵێکمان هەبوو، تیایدا دەمانخواردەوە. من بوتڵەکەی خۆمم هەڵگرت و لەسەر زگ لەناو کایەکە لێراکشام. لە کلاوڕۆژنەکەوە سەیری ناوچە تەڕ و





شێدارەکەم کرد. خۆشم نەمدەزانی چاوەڕوانی دیتنی چ دەکەم لە کێڵگە و دارتووە ڕووتەکان و باران بترازێ هیچی ترم نەدیت.

مەیەکەم خواردەوە. بەڵام سەری نەگرتم. ئەم مەیەیان لەزۆر لەمێژەوە هەڵگرتبوو، لەبەر کۆنی باشی و ڕەنگەکەی لەدەست دابوو. دەرەوە تاریک داهات، تاریکی خێرا ناوچەکەی داگرت. شەوەکەی لەبەر باران شەوە ڕەشە بوو، کە تاریک داهات، سەیرکردنە دەرەوە هیچ سوودی نەما. بۆیە چوومە لای پیانی. پیانی خەوی لێ کەوتبوو. منیش خەبەرم نەکردەوە. بەینێک لە تەنیشتی دانیشتم. پیانی پیاوێکی کەتە بوو، خەوێکی خۆشی لێکەوتبوو. پاش ماوەیێ خەبەرم کردەوە و بەڕێ کەوتین. ئەوێ شەوێ، شەوێکی زۆر سەیر بوو. خۆشم نازانم چاوەڕوانی چیم کرد... مردن و تەقەکردن و لە تاریکی ڕاکردن... بەڵام هیچ ڕووی نەدا چاوەڕێمان کرد. لە دواوەی چاڵێکەوە لە نزیک ڕێگا سەرەکییەکەوە ڕاکشابووین بەتالیۆنەکی ئەڵمانی تێپەڕی، پاش ئەوەی تێپەڕبوون ئێمە لە ڕێگاکە پەڕینەوە و بەرەو باکوور ڕۆیشتین. دووجار لەژێر ڕێژنەی بارانەوە لە ئەڵمانییەکان نزیک بووینەوە. بەڵام ئێمەیان نەدیت.

لەلای باکوورەوە بەشارەکە تێپەڕین، بێ ئەوەی ئەوەی نێوی ئیتاڵی بێ ببینین. پاش ماوەیەکی کەم هاتینە سەر ڕێچکەی سەرەکی کشانەوەکە. هەر ئەوێ شەوێ بەپێ بەرەو (تاگلامیتۆ) ڕۆیشتین. لەو باوەڕەدا نەبووم کە هێزە کشاوەکە ئەو هێزە زەبەلاحە دەرچێ.

خەڵکی گوندەکانیش شان بەشانی سوپایەکە دەکشانەوە. تاخوا ڕۆژی کردەوە ئێمە هەر لەسەر پێیان ڕۆیشتین. لە ڕۆیین بەپێش ئوتومبیل کەوتبووین. قاچەکانم ژانیان دەکرد، لاکەشم لێوە دەهات بەڵام ماوەیەکی باشمان بڕیبوو. خۆ بەدەستەوەدانی (بۆنیلۆ) لەوپەڕی گێلاتی بوو. هیچ مەترسیێ لەگۆڕێ دانەبوو. بەنێوانی دوو سوپادا تێپەڕین بێ ئەوەی هیچ شتێکمان بەسەر بێ. ئەگەر ئایمۆ نەکوژرابا هەستمان بەهیچ مەترسیێ نەدەکرد. هیچ کەسێ ئێمەی سەغڵەت نەکرد، کاتێ لەبەر چاوان بەتەنیشت ڕێگای هێڵی ئاسنی دەڕۆیشتین.

کوشتنی (ئایمۆ)ش لەناکاو و بێ هۆ بوو. لەخۆمم پرسی ئاخۆ دەبێ (بۆنیلۆ) لەکوێ بێ؟

پیانی پرسی: «تێنیتا چۆنی؟»

لە تەنیشت ڕێگاوە دەڕۆیشتین، کە پڕ ماشین و سەرباز بوو.

– «زۆرباشم»

– «لەڕۆیشتن زۆر ماندوو بوویم.»

– «باشە، هەر ئەم قۆناغەمان ماوە، دڵ لەدڵ مەدە.»

– «بۆنیلۆ گێل بوو»

- «بەڕاستی گێل بوو.»
- «تۆ بەرامبەر ئەم کردەوەیە چی دەکەی تێنیتا؟»
- «نازانم.»
- «ناتوانی بەدیلی لە قەڵەم بدەی؟»
- «نازانم.»
- «دەزانی گەر شەڕ بەردەوام بێ، ئەوا خێزانەکەی زۆر ئازار دەدەن؟»

سەربازێ گوتی: «شەڕ بەردەوام نابێ، دەچینەوە ماڵی خۆمان، شەڕ دوایی هات.»

- «هەموو کەس دەچێتەوە ماڵی خۆی.»
- «هەموومان دەچینەوە ماڵی خۆمان.»

پیانی گوتی: «وەرە تێنیتا.»

دەیەویست پێشیان بکەوێتەوە.

- «تێنیتا؟! تێنیتا کێیە؟ (ئەبا سۆگلی یوفیسیالی)[١] بڕووخێن ئەفسەرەکان.»

پیانی باسکی گرتم و گوتی: «واچاکە بەناوی خۆت بانگت بکەم. لەوانەیە گیروگرفتمان بۆ پەیدا بکا. هەندێ لە ئەفسەرەکانیان گوللە باران کرد.»

پێشیان کەوتینەوە. لەسەر گفتوگۆی خۆمان بەردەوام بووین.

گوتم: «ڕاپۆرتێکی وا نانووسم کە گیروگرفت پەیدا ناکا بەڵام مەزندەم بۆی ناچێ تەواو ببێ، خۆ گەر تەواو بێ لەخۆی باشتر نییە.»

گوتم: «بەم زووانەش لەمە دەگەین.»

- «باوەڕناکەم کە تەواو بووبێت. هەموو وای بۆ دەچێ کە تەواو بووە، بەڵام من باوەڕ ناکەم.»

سەربازێ: «(ڤیڤالاپیس)[٢] بژی ئاشتی، دەگەڕێینەوە ماڵەوە.»

پیانی گوتی: «وا تفەنگەکانیان فڕێ دەدەن. هەر لە ڕۆیشتن لە خۆیان دەکەنەوە و بەعاردی دادەدەن. پاشان هاوار دەکەن.»

- «دەبێ تفەنگەکانیان لای خۆیان بمێنێ.»
- «وا دەزانن گەر تفەنگەکانیان فڕێ بدەن ناتوانن بیانخەنەوە شەڕ.» کاتێ لە تاریکی و لەبەر باراندا بەسەر لایەکی ڕێگاکە دەڕۆیشتین ژمارەیەکی زۆر سەربازانی هێزەکەم بینی هێشتا تفەنگەکانیان لا مابووەوە لەسەر چاکەتەکەیان قیت ببووەوە.

ئەفسەرێک هاواری کرد: «تۆ لەکام لیوای؟»

(١) ئەم دەستەواژەیە بەئیتاڵییە واتە «دەگەڕێینەوە ماڵی خۆمان.»

(٢) ئەم دەستەواژەیە بەئیتاڵییە واتە «بژی ئاشتی.»





یەکێ لێی هاتە وەڵام و گوتی: «بری گاتە دی پیس- لە لیوای ئاشتی.»

ئەفسەرەکە هیچی نەگوت. «ئەو چی دەڵێ؟ ئەفسەرەکە چ دەڵێ.»

- «بڕووخێن ئەفسەرەکان. ڤیڤالاپیس.»

پیانی گوتی: «وەرە!.»

بەتەنیشتی دوو ئوتومبیلی فریاگوزاری بەریتانی لە نێوان کۆمەڵێک ئوتومبیلی بەجێماودا تێپەڕین.

پیانی گوتی: «هی کوریزیان. ئەم ئوتومبیلانە دەناسمەوە.»

- «لە ئێمەیان زیاتر بڕیوە.»
- «لە ئێمە زووتر دەستیان بەکشانەوە کردووە.»
- «دەبێ شوفێرەکانیان لە کوێ بن.»
- «لەوانەیە لە پێشمان بن.»

گوتم: «ئەڵمانییەکان لە دەوروبەری (ئۆدین)ەوە وەستاون، ئەم خەڵکە هەمووی دەبێ لە ڕووبارەکەوە بپەڕێتەوە.»

پیانی گوتی: «بەڵێ هەر ئەوەشە وای لێ کردووم بڕوام بەبەردەوامی شەڕ بێ.»

گوتم: «ئەڵمانییەکان لە توانیاندا هەیە. بچنە ناو (ئۆدین)، بەڵام ئەوەم لا سەیرە کە بۆچی نەچوونەتە ناو (ئۆدین)ەوە.»

- «نازانم، هیچ شتێ دەربارەی ئەم جۆرە شەڕە نازانم.»
- «وای بۆ دەچم کە چاوەڕێی هێزەکانی گواستنەوەبن.»

پیانی: «نازانم.»

پیانی بەتەنیا زۆر ڕووخۆش بوو، بەڵام کە لەگەڵ یەکێ قسەی دەکرد وشک و ڕەزاگران دەهاتە بەرچاو.

- «لۆگی ژنت هێناوە؟»
- «تۆ دەزانی من ژنم هێناوە.»
- «دەبێ هەر لەبەر ئەوەش بێ کە ناتەوێ بەدیل بگیرێی؟»
- «ئەوەیان هۆیەکە. تۆ ژنت هێناوە تێنیتا؟»
- «نەخێر.»
- «بیۆنیلۆش ژنی نەهێنابوو.»

گوتم: «ناتوانی هیچ دەربارەی پیاوی ژندار بڵێی. بەڵام بەلای من پیاوی ژندار هەر حەزدەکا بگەڕێتەوە لای هاوسەرەکەی.»

زۆر کەیفخۆش دەبووم کە دەربارەی ژن قسە کرابا.

پیانی گوتی: «ئەوە ڕاستە.»

- «قاچەکانت چۆنن؟»

- «زۆر بەسوێن.»

بەر لە تاریک و ڕوونی بەیانی گەیشتینە کەناری (تاگلیا مینتۆ)، شان بەشانی ڕووبارەکە، کە ئاوی لافاو بەرز ببووەوە، بۆ لای پردەکە ڕۆیشتین. هەموو ئوتومبیلەکان لەوێوە دەپەڕینەوە.

پیانی گوتی: «دەبوایە لە پتش ئەم ڕووبارەوە خۆیان ڕاگرتبایە.»

ئاوە هەڵساوەکە لە تاریکیدا بەرز دیاربوو. ئاوی ڕووبارەکە لە گێژەنە و کشان دابوو، پردە دارینەکە لەم بەرەوە بۆ ئەو بەر نزیکەی سێ چارەگە میل بوو. ئەو ڕووبارە ئاوی ئاسایی خۆی بەناو ڕێچکەیەکی تەنگەبەری ژێر بەردیندا، لە دووری ژێر پردەکەوە، دەڕۆیی. ئەوەندەی نەمابوو بگاتە داری پردەکە. شان بەشانی کەناری ڕووبارەکەوە ڕۆیشتین دوایی چووینە ناو ئەو قەڵەباڵغییەوە کە لەسەر پردەکە دەپەڕییەوە. بەئەسپایی لەژێر باران و لەبەرزی چەند پێیێ لەلافاوەکە، هەستم بەتەنگی جێگەکەمم کرد. سندووقێکی گوللە تۆپم کەوتە پێش ڕووی خۆم وەرگێڕایە لای پردەکە و سەیری ڕووبارەکەمم کرد لێرە بەدواوە نەمتوانی خێرا و خۆش بڕۆین هەستم بەماندووبوونێکی زۆر کرد. تۆزقاڵێ خۆشی و دڵفراوانیم لەو پەڕینەوەیەدا نەکەوتە دڵەوە. لە خۆمم دەپرسی: «ئەگەر فڕۆکە بەڕۆژ ئەم ناوچەیە بۆردومان بکا چ دەقەومێ؟

هاوارم کرد: «پیانی»

- «لێرەم. تێنیتا.»

لەناو قەڵەباڵغییەکەوە کەمێ لە پێشی من بوو. کەس فزەی لێوە نەدەهات، هەرکەسە بۆ خۆی عەودالّی پەڕینەوە بوو. تەنیا بیریان لەپەڕینەوە دەکردەوە. ئەوەندەمان نەمابوو بپەڕینەوە. لەوسەری پردەکەوە چەند ئەفسەرێک و قەرەبینادار لەهەردوولای پردەکەوە ڕاوەستابوون، لایتیان بەدەستەوەبوو. سێبەریان لە ڕووی ئاوی ڕووبارەکەوە بینی. کاتێ لێیان نزیک بوومەوە. ئەفسەرێکم بینی ئیشارەتی بۆ پیاوێکی نێو کاروانەکە کرد. کابرای قەرەبینادار بەدوایدا چوو. لە گەڕانەوەدا بەقۆڵبەستە پیاوەی هێنا. لە ڕێگا دووریان خستەوە. ڕووبەڕووی یەکتر بووین. ئەفسەرەکان یەکە یەکە دەیانڕوانییە پەڕیوەکان. جارجاریش قسەیان لەگەڵ دەکردن. لە پەڕێوەکە نزیک دەبوونەوە تا لە نزیکەوە لایتی لێ بدەن بەر لەوەی بەتەواوەتی بگەینە ئەم شوێنە پیاوێکی تریان لە پەڕێوەکان دەرهێنا. پیاوەکەم بینی پایەی کۆلۆنێل بوو یەکێکی پرچ خۆڵەمێشی قەڵەوی کورتە باڵا بوو، کاتێ لایتیان لێدا ئەستێرەکانی سەر قۆڵی ترووسکانەوە. قەرەبینادارەکە بردییە دوای هێڵی ئەفسەرەکان. کاتێ کەوتمە بەرامبەریان یەک یا دوانیان سەیریان دەکردم. دوایی یەکێکیان نیشانەی بۆ کردم، قسەی لەگەڵ قەرەبیناداری کرد. قەرەبینادارەکە بەناو کاروانەکەوە هاتە لام و لەیەخەوە گرتمی.





پرسیم: «چیتە؟»

مستێکم لە ڕوومەتی دا، دەموچاویم لەژێر شەپقەکەی دیت سمێڵێکی قیتی هەبوو. خوێن لەڕوومەتی هاتە خوارەوە یەکێکی تر بەرەو لام هات. گوتم: «چیتە؟»

وەڵامی نەدایەوە، چاوەڕێی دەرفەتێ بوو تا بمگرێ، دەستم بۆ لاتریزەم درێژ کرد، تا دەست بگەینمە دەبانچەکەم.

- «نازانی ناتوانی دەست لە هیچ ئەفسەرێ بدەی؟.»

ئەوی تر لە دواوە خۆی تێکردم بەتوندی باسکمی بەرزکردەوە، جومگەی دەستمی لەگەڵ وەرسووڕاند، ئەوی تریش لەملەوە گرتمی. منیش نەمکردە نامەردی پێلەقەیەکم لە لوولاقی دا و چۆکم بەنێو گەلانی کەوت. گوێم لێ بوو یەکێ گوتی: «گەر دەستی وەشاند بیکوژە.»

- «ئەوە مانای چییە؟»

ویستم هاوار بکەم، بەڵام دەنگم ئەوەندە بەرزنەبوو، منیان بردە لایەکی ڕێگاکە.

ئەفسەرێ: «گەر دەستی وەشاند بیکوژن. بیبەنە دواوە.»

- «تۆ کێی؟»

- «ئێستا دەزانی من کێم.»

- «تۆ کێی؟»

ئەفسەرێ: «پۆلیسی جەنگی.»

- «بۆچی داوا ناکەن هەنگاوێ زیاتر بێمە پێشتر، لە جیاتی ئەوەی داوا لەم فڕۆکەیە[1] بکەن بمگرێ؟»

وەڵامیان نەدامەوە. ناچار نەبوون وەڵامم بدەنەوە. پۆلیسی جەنگی بوون. ئەفسەری یەکەم گوتی: «بیبەنە دواوە. لەگەڵ ئەوانی تر ڕای گرن. دەبینی ئیتاڵییەکان نا تەواو قسە دەکا.»

گوتم: «تۆش وەکو من ئاسا. تۆ...»

ئەفسەرەکە گوتی: «بیبەنە لای ئەوانی تر.»

منیان بردە ڕیزی دواوەی ئەفسەرەکان. لە خوارەوەی ڕێگاکە لە بەرامبەر کۆمەڵێ خەڵکی تر لە کێڵگەیەکی نزیک ڕووبارەکەوە ڕاگیربوون. کاتێ بۆ لایان چووین گوێمان لە تەقەیێ بوو. بریسکەی گوللە تەقێندراوەکەم بینی، بەڵام گوێم لەدەنگی دەنگدانەوەی گوللەکە نەبوو. چوار ئەفسەر پێکەوە لەوێ وەستابوون. پیاوێکیش لەبەر دەمیان. قەرەبینالەدەست لەملاو لەو لایانەوە وەستابوون. دەستەیەک سەربازی تریش

(١) فڕۆکە: بەگاڵتە پێکردن ئەو ناوە لە قەرەبینادارەکان دەنێت.

دەوریان بەقەرەبینالەدەست گیرابوو. چوار قەرەبینالەدەستی تریش لەتەک ئەفسەری دادپرس وەستابوون. خۆیان بەسەر تفەنگەکانیان دادابوو. شەبقەی گەورەیان لەسەر بوو. ئەو دوانەی منیان گرتبوو بۆ لای ئەوانەیان بردم کە چاوەڕێی لێپرسینەوە بوون. سەیری ئەو پیاوەم کرد کە ئەفسەرەکان پرسیاریان لێ دەکرد. پیاوەکە، کابرا کۆلۆنێلە قەڵەوە پرچ خۆڵەمێشەکە بوو، کە لەناو کاروانەکە هێنایانە دەرەوە. لێپرسەرەوەکان ڕوخسەتی هەموو جۆرە ڕەفتارێک و فرمانێکی دڵڕەقانەیان پێ درابوو. هەروەکو چۆن ئیتاڵییەکان دەستووری موکەرەمیان پێ درابوو کە تەقە لە خەڵک بکەن، کەسیش توانای تەقە لەوان کردنیان نەبێت.

– «ناوی تیپەکەت؟»

پیاوەکە ناوی تیپەکەی پێ گوتن.

– «ناوی پەلەکەت؟»

پێیانی گوت.

– «بۆچی لەپەلەکەت دابڕاوی؟»

وەڵامی نەداوە.

– «نازانی ئەفسەر دەبێ لەگەڵ تیپەکەی خۆی بێ؟»

وەڵامی دانەوە گوتی دەزانێ.

ئەمە هەموو بوو. ئەفسەرێکی تر قسەی کرد.

– «تۆ و نموونەی وەکو تۆ ڕێگەی بەربەرەکانی دەدەن پێ بنێتە ناو خاکی پیرۆزی باوکتەوە.»

کۆلۆنێلەکە گوتی: «بەیارمەتیت ڕێگەم بدە قسەیێ بکەم.»

– «لەبەر خۆفرۆشی تۆ و هی وەکو تۆ گوڵی سەرکەوتنمان لەدەست چووە.»

کۆلۆنێل پرسی: «قەت بەشداری کشانەوەت کردووە.»

– «ئیتاڵیا نابێ بکشێتەوە.»

لەبەر باران ڕاوەستابووین، گوێم بۆ ئەم قسانە شل کردبوو. ڕووبەڕووی ئەفسەرەکان وەستابووین و کابرای گیراو لە بەردەممان بوو کە کەمێ لە ئێمە دوور بوون.

کۆلۆنێل گوتی: «گەر دەمکوژن، تکایە یەکسەر بمکوژن بێ ئەوەی هیچ چیتر پرسیارم لێ بکەن، ئەم لێپرسینەوە زۆر بێ مانایە.» کۆلۆنێل ئەمەی گوت و خاچی لەسەر سینگی خۆی کێشا. ئەفسەرەکان پسەیەکیان پێکەوە کرد یەکێکیان شتێکی لەسەر پارچە کاغەزێ نووسی.

گوتی: «سەربازەکانی بەجێهێشتووە، دەبێ گوللەباران بکرێ.»

دوو قەرەبینادار. کابرای کۆلۆنێلیان بردە سەر ڕووبارەکە، لەبەر باران ڕۆیشتن.





پیاوێکی سەرکۆتی پیربوو، لە هەر لایەکی قەرەبیناداری دەڕۆیی. تەماشای گوللەبارانیم نەکرد. بەڵام گوێم لە دەنگی تەقەکە بوو. لێپرسینەوەیان لەگەڵ یەکی تردا کرد. ئەم ئەفسەرەش لەسەربازەکانی دابڕایە. ڕێگەی نەدرا هۆی دابڕانەکەیان بۆ ڕوون بکاتەوە کاتێ بڕیارەکەی خۆیان لەسەر کاغەزەکەوە خوێندەوە، دەست بەگوللە باران کرا. کە لەمەش تەواو بوون لێپرسینەوەیان لەگەڵ یەکێکی تردا کرد. ئەوان سووربوون لەسەر لێپرسینەوە لەگەڵ یەکی تر، لەو کاتەی کابرای پێشوویان ئاگرباران کرد. بەم شێوەیە ئاشکرا بوو نەیان دەتوانی هیچ شتێ بکەن. نەمزانی چی بکەم، چاوەڕێی لێپرسینەوە بم، یا بڕیاری ڕاکردن بدەم. تاوانەکەم ئاشکرایە (ئەڵمانی)م لە جلی(ئیتاڵی)م. چۆن بیردەکەنەوە ئەگەر مێشکیان کاری کردبایە. هەموو گەنج بوون. وڵاتی خۆیان ڕزگار دەکرد. سوپای دووەم سەرلەنوێ لە دەوروبەری (تاگلیمانتۆ) پێکهێنرایە. تاوانی دابڕان لە سەربازانەوە بگرە بەئەفسەرەوە ئاهەنگیان گوللەباران کرد. هەمان ڕەفتاریشیان لەگەڵ ئەو کەسانەشەوە دەکرد کە ئەڵمانی بوون بەجلی ئیتاڵی. ئەوان کڵاوی پۆڵایینیان لەسەر کردبوو. تەنها دوو کەسی لە ئێمە ئەو چەشنە کڵاوەیان لەسەر کردبوو. تەنیا دوو کەس لە ئێمە ئەم چەشنەیان هەبوو. هەندێ لە قەرەبینادارەکانیش ئەم چەشنەیان هەبوو قەرەبینادارەکانی تریش شەپقەی پانیان لەسەر نابوو. ناومان لێ نابوون (فرۆکە). لەبەر باران ڕاوەستابووین تاو ناتاوێ یەکێکیان بانگ دەکرد و دەیان کوشت. تا ئێستا هەر کەسێ لێپرسینەوەی لەگەڵ کرا بردیان کوشتیان. لێپرسەرەوەکان دادوەری بێ سۆز و دڵسۆزبوون. خاوەنی سزایەکی توندوتیژ بوون. بڕیار و ڕەفتاریان لە مردن دەرنەدەچوو، بێ ئەوەی هیچ مەترسیەکیان هەبێ. لێپرسینەوەیان لەگەڵ (کۆلۆنیل)ێک و سێ ئەفسەری تر کرد کە تاوێ لەمەوبەر هێنرانە ناو ئێمەوە.

سەیری قەرەبینادارەکەم کرد. سەیری پیاوە تازە هاتووەکانی دەکرد. هەندێکیش لە (کۆلۆنیل) ڕامابوون. منیش خۆم ئامادە کرد و لە نێوان دوو پیاواندا دەرپەڕیم و بەرەو ڕووبارەکە ڕام کرد، سەری خۆم داهێنایەوە، بەقەراغ ڕووبارەکەوە ڕۆیشتم و بەشەپە خۆم تێ هەڵدا ناوییەوە، ئاوەکەی زۆر ساردبوو، ئەوەندەی پێم کرا لەژێر ئاوەکە مامەوە هەستم کرد کە تەوژم دەم سوڕێنێ. ئەوەندە لەژێر ئاوەکە مامەوە تا هاتمە سەر ئەم ڕایە، کە تازە دەرەوە نابینمەوە و سەرکەوتنم بۆ نییە. دەقێ سەرکەتمەوە و هەناسەیەکم هەڵمژی، چوومەوە ژێر ئاوەکەوە، مانەوەم لە ژێرەوە بەجلوبەرگ و پۆستاڵەوە کارێکی ئاسان بوو، سەیرم نەدەکرد و نەشم دەویست قەراغی ڕووبارەکە ببینم. کە ڕام کرد تەقەم لێ کرا. کاتێ بۆ یەکەم جار سەر ئاو کەوتمەوە گوێم لە دەنگی تەقە بوو. لەو کاتەش گوێم لەتەقە بوو کە خەریک بوو سەر ئاو کەوم. ئێستا دەنگی هیچ تەقەیێ نایێ. تەختەدارەکە لەناو گێژەنەی تەوژمی ئاوەوە دەهەژایەوە بەدەستێک خۆم پێوە گرتبوو، سەیری قەراغی ڕووبارەکەم کرد، هەستم کرد کە بەتیژی و خێرا لەناو ئاوەکەوە دەڕۆیشتم، ژمارەیێ تەختەدار لەناو تەوژمی ئاوەکەدا بوو. ئاوەکەی تەزی بوو. بەنێو بیشەلانی سەر ئاوی دوورگەیەکدا ڕەت بوو تەختەکەم بەهەردوو دەستەوە گرت. لێ

گەڕام تا ئاوەکە لەگەڵ خۆی ڕام پێچی. قەراغ ئاوەکە لەبەر چاوان ون بوو.

## 31

مرۆڤ ناتوانێت بزانێت چەند لەناو ئاودا دەمێنێتەوە نەخوازەڵا کە تەوژمەکە تیژڕەو بێت. وا پێ دەچێ ماوەیەکی زۆر بێ کەچی لەوانەیە کەم بووبێت. ئاوەکە تەزی بوو و لەناو لافاوەکەدا زۆر شت تێپەڕین کە لە قەراغی ڕووبارەکەوە سەر ئاو کەوتووبن کە ئاوەکە هەستابوو. بەختم بەوە باش بوو تەختەدارێکی گەورەم چنگ کەوتبوو خۆمم پێوە گرتبوو. لە ئاوێکی تەزیدا درێژ ببووم. چەنەگەم لەسەر تەختەدارەکە بوو. بەو هەموو تێنەی خوا پێی دابووم دەستم پێوە گرتبوو، لە لەش ڕەقبوون دەترسام، بۆیە بەو هیوایە بووم خۆم بگەینمە گوێی ڕووبارەکەوە. بەپێچێکی درێژی ڕووبارەکە چووینە خوارەوە، خۆر خەریک بوو گزنگ بدا، بۆیە توانیم دەوەن و بیشەلان بەدرێژایی قەراغی ڕووبارەکە بەدی بکەم. دوورگەیەکی بیشەلانی لە پێشم بوو. ئاویش بەرەو قەراغی ڕووبارەکەوە دەکشا.

بەخۆم دەگوت، ئاخۆ دەکرێ پۆستاڵەکان و جلەکانم لەبەر بکەمەوە و هەوڵ بدەم ڕووەو قەراغەکە مەلە بکەم یان نا. بڕیارم دا وا نەکەم. بیرم لەهیچ نەدەکردەوە تەنیا لەوە نەبێ کە هەر چۆنێ بێ بگەمە کەنار ئاوەکە. ئەگەر بەپێخواسی بهاتبامە دەرەوە تووشی هەڵوێستێکی ناخۆش دەبووم، بۆیە بڕیارم دا ڕووت نەبمەوە.

ناچاریشم هەر چۆنێ بێ دەبێ بچمە شاری (میتری). تەماشام کرد قەراغەکە نزیک دەبێتەوە. پاشان دوورکەوتمەوە. جارێکی تر نزیک بوومەوە. بەهێواشی سەر ئاو کەوتم لە قەراغەکەوە زۆر نزیک بوومەوە. لە توانام دابوو لق و پۆی دار ببینم. تەختەدارەکە زۆر بەهێواشی دەجوولایەوە تا وای لێ هات قەراغی ڕووبارەکە کەوتە دواوەم. زانیم کەوتوونیەتە گێژەنەوە بەهێواشی سووڕاینەوە، کە جارێکی تر کەنارەکەم بەرچاو کەوتەوە، زۆر لێی نزیک بوومەوە. هەوڵم دا بەدەستێ تەختەکە بگرم و بەقاچەکانم و دەستەکەی ترم تەختەکەم بەرەو قەراغەکە ببەم. بەڵام ئەم هەوڵەم بێ سوود بوو. کە لەکەنارەکە نزیک کەوتمەوە لە گێژەنەکە نەترسام. دەمویست لە مەودای گێژەنەکە بچمە دەرەوە. بەدەستێ تەختەکەم گرتبوو قاچەکانم بەرزکردەوە تاوەکو کەوتنە بەرامبەر تەختەکەوە. بەتوندی و بەهەموو تێنم خۆم بەرەو قەراغەکە ڕاتەکاند. توانیم چیلکەدار و دەوەن ببینم بەڵام لەگەڵ ئەوەش بەهەموو هێزی خۆم مەلەم دەکرد، تەوژمی ڕووبارەکە دووری خستمەوە. لەبەر پۆستاڵەکانم وا هەستم دەکرد کە نقوم دەبم بەڵام دژی تەوژمەکە مەلەم کرد، کە چاوم بەرز کردەوە کەنارەکە لێم نزیک دەبووەوە. بەخۆم و پۆستاڵە قورسەکانم لە باسکە لێدان بەردەوام بووم تا گەیشتمە جێی مەرام. دەستی خۆمم لە لکە بێیەک گیر کرد ئەو تێنەم لەگیانا نەمابوو تا خۆم ڕزگارکەم و سەربکەوم بەڵام لێم مسۆگەر بوو کە تازە نقووم نابم. من هیچ کاتێ کە خۆم بەتەختەدار گرتبێ ترسی نقووم





بوونم لە دڵدا نەبووە. لە ئەنجامی ئەو توانا و ئەرکەی دابووم هەستم بەبرسییەتی و دڵ تێکهەڵاتن و ئازاری سینگم کرد. خۆمم بەلکەکان گرت، سەبرم گرت، تا هەستم کرد تێکچوونم نەما. خۆم بە لکە بێیەکە سەر خست و جارێکی تر حەسامەوە. باسکەکانم لە دەوەنان ئاڵاندبوو، بەدەستەکانیشم لکە (بێ)م گرتبوون. پاشان لەسەر زگ خشام و بەناو بێیەکاندا خشام و خۆم گەیاندە قەراغەکە. دونیا سپێدە بوو، کەسم بەدی نەکرد لەسەر کەنارەکە لێ ڕاکشام، گوێم لە هاژەی ڕووبار و باران بوو. پاش بەینەک هەستامەوە بەقەراغی ڕووبارەکەوە ڕۆیشتم، دەمزانی تا ناوچەی (لاتیسانا) هیچ پردێ لەسەر ڕووبارەکەوە نییە وا هاتە مێشکم کە بەرامبەر (سان ڤیتۆ)م، دەبێ چی بکەم، لە بەرایبم کەندێ هەبوو لەگەڵ ڕووبارەکە دەڕۆیی، ڕووم دەوێ کرد، تا ئەم دەم کەسم نەبینی. لە نریک قۆپەنە دەوەنێ لە ڕۆخی کەندەکە لێ دانیشتم، پێڵاوەکانم لە پێ کردنەوە، ئاوەکەیم لێ ڕووکرد. چاکەتەکەمم ڕاگوشی، پانتۆڵەکەشم لەبەر کردەوە و ئەویشم ڕاگوشی پاشان کراسەکەم و جلەکانی ژێرەوەم، دوا بەدوای ئەمە دەستم کردە دەست بەخۆداهێنان بۆ خۆ وشک کردنەوە. ئینجا جلەکانم لەبەرکردن. شەبقەکەم بزرکردبوو.

بەر لەوەی چاکەتەکەم بکەمە بەرم، ئەستێرە قوماشییەکانی سەر قۆڵەکانم دادڕی. لەگەڵ پارەکەوە خستمە گیرفانی ژوورەوەم. پارەکەم تەڕ ببوو، بەڵام لەکەڵک نەکەوتبوو. ژماردم سێ هەزار و قسور لیر بوو هەستم کرد جلەکانم تەڕ و لیچن. چەند زللەیەکم لەباسکم دا، تاوەکو سووڕی خوێن بەردەوام و چاک بێ، جلەکانی ژێرەوەم خوری بوون. دووبارە لەو باوەڕەدا نەبووم گەر لە ڕۆیشتن بەردەوام بم تووشی هەڵامەت بم. لە ڕێگا دەستیان بەسەر دەبانچەکەم داگرت. منیش کیفەکەم لەژێر چاکەتەکەم دانا، پاڵتۆم نەبوو، سووی باران ساردبوو، ملم نایە بەر ڕێگەی کەندەکەوە. ڕۆژ بەدەرەوە بوو، دەشتەکەش تەڕ و نەورای و خەمناک دیاربوو، کێڵگەکانیش تەڕ و ڕووت بوون. توانیم قوللەی زەنگێک لە دوورەوە بەدی بکەم لەم دەشتاییەدا قیت بووەوە. هاتمە سەر ڕێگایێ چەند سەربازێکم بینی لە ڕێگاکەدا دەهاتنە خوارەوە، خۆم لەلایەکی ڕێگاکەوە حەشاردا. بەلامدا تێپەڕین. هیچ گرینگییەکیان پێ نەدام. لە پۆلی تۆپچیان بوون و بەرەو ڕووبارەکە دەڕۆیشتن، منیش بەڕێگاکە دابەزیم و ڕێی خۆمم گرتەبەر ئەو ڕۆژەی بەدەشتی (ڤێنیتان)دا تێپەڕیم، دەشتێکی نەورایی بوو، لەژێر باراندا دەشتێ بوو لەخۆی ڕاستتر نەبێ. بەرەو لای دەریاوە، زۆنگاوی شوڕەکات و چەند کەمە ڕێگایێ هەبوو. ڕێگاکان لەگەڵ ئاوەڕۆی ڕووبارەکە بەرەو دەریا دەکشان. بۆ ئەوەی لەدەشتەکە بپەڕینەوە دەبێ بەپیادە ڕێییەکانی تەنیشت کەندەکاندا بڕۆی. لە دەشتەکەدا لە باکوورەوە بەرەو خواروو ڕۆیشتم و دوو هێڵی ئاسنی شەمەندەفەر و چەند ڕێگایەکم بڕی. لە ئاخیری و ئۆخریدا هاتمە سەر پیادە ڕێیێ کە دەچۆوە سەر هێڵی ئاسنی بەتەنیشت زەلکاوێدا دەڕۆیی ئەم هێڵە هێڵێکی سەرەکی بوو. لە (فێسنی)یەوە بۆ (تریستا) دەچوو. ئەم هێڵە لێوارێکی بەرز و توندی هەبوو، ڕێگایەکی چەقان و دوو

هێڵی بوو، لە دوورییەکی تەواوەوە ئاڵای ئیستگەکەم بینی. توانیم چەند سەربازێ ببینم. لە ئێشکگرتندا بوون، لەلایەکی ترەوە پردێک لەسەر چۆمێکەوە بوو، ئاوی چۆمەکە دەڕژایە ناو زەلکاوەکە توانیم لەسەر پردەکە پاسەوانێکی تر بەدی بکەم، کاتێ بەناو کێڵگەکەدا ڕووەو باکوور ڕۆیشتم، شەمەندەفەرێکم بینی بەسەر ئەم ڕێگایەدا دەڕۆیشت. وای بۆ چووم کە ئەم شەمەندەفەرە لە (پورتۆگرارۆ) بگەڕێتەوە چاودێری پاسەوانەکانم کرد. لەسەر لێواری هێڵەکە خۆم لەسەر زگ درێژ کرد ئەو کات دەمتوانی هەردوولای ڕێگاکە ببینم. پاسەوانەکەی سەر پردەکە بەپیاسە هاتە نزیک ئەو شوێنەی خۆم لێ درێژ کردبوو، پاشان سووڕایەوە گەڕایەوە لای پردەکە، لە شوێنی خۆم لێ درێژ بووم. برسیم بوو، چاوەڕێی هاتنی شەمەندەفەر بووم. ئەو شەمەندەفەرەی بینیم زۆر درێژ بوو، ئەمەش وای لە مەکینەکە کردبوو بەهێواشی بجوولێتەوە. زانیم دەتوانم خۆمی پێوە بکەم و سەربکەوم. پاش چاوەڕوانییەکی زۆر خەریک بوو هیوام ببڕێ. شەمەندەفەر هێواش هێواش دەهات تا نزیکتر دەبووەوە گەورەتر دیار دەبوو، هێواش بووەوە سەیری پاسەوانی سەر پردەکەم کرد لە نزیک پردەکەوە پیاسەی دەکرد، بەڵام لەلایەکی تری هێڵی ئاسنییەکەوە لەبەر چاوان بزربێ. چاوەڕێم کرد، شەمەندەفەر نزیک بووەوە، زۆر گران دەڕۆیشت. ژمارەیێ ڤارگۆنی لە دواوە بوو، دەمزانی کە دەبێ لەسەر شەمەندەفەر پاسەوان هەبێ، هەوڵم دا بەشوێنەکانیان بکەوم، بەڵام خۆم لەبەر چاوان شاردەوە. نەمتوانی هیچ کەسێ ببینم. شەمەندەفەرەکە گەیشتە نزیک ئەو شوێنەی خۆم لێ مات کردبوو، لە ڕاستاییدا بگرە لە دەشتاییش لاکەی لێوە دەهات. کابرای میکانیکم بینی تێپەڕی هەڵسامەوە سەرپێ و لە ڤارگۆنەکان نزیک بوومەوە. وەستانم نزیک هێڵی ئاسنییەوە بۆ پاسەوانەکان کەمتر جێگەی گومانە. هەندێ ڤارگۆنی داخراو بەلامدا ڕەت بوون. پاشان ڤارگۆنێکی نزمی سەرکراوەم بینی. ئیتاڵییەکان بەم جۆرە ڤارگۆنەیان دەگوت (گۆندۆلا) و بەخیوەت داپۆشرابوو. ڕاوەستام تاوەکو تێپەڕی، منیش فرتکەیەکم بۆ کرد. دەستم بەو ئاسنەوە گرت کە مرۆڤ پێی سەردەکەوێ. لە نێوان (گۆندۆلا)کە و ڤارگۆنەکەوە خۆم مات کرد. دەستم بەئاسنەوە گرتبوو. باوەڕ ناکەم کەس منی بینیبێ. بە خشەخش دەڕۆیشتم دەستم لە ئاسنەکەوە گرتبوو قاچیشم لەسەر دەعامییەکەوە گیر کردبوو. لەبەرامبەر پردەکە بووین. پاسەوانەکەم کەوتەوە بیر، کاتێ بەلایدا تێپەڕین سەیرێکی کردم، پاسەوانەکە مێردمنداڵ بوو، کڵاوە زرێیەکەی زۆر گەورە بوو، منیش بەچاوێکی گاڵتە پێهاتنەوە سەیرم کرد. بەڵام ئەو ڕووی وەرگێڕا. وای زانی یەکێکم لە کارکەرەکانی شەمەندەفەرەکە.

تێپەڕین. تەماشام کرد هەر ناڕەحەت دیاربوو، سەیری ڤارگۆنەکانی دەکرد، خۆم داهێنایەوە تابزانم خیوەتەکە چۆن قایم کراوە قوڵفەی کانزایی پێوەبوو. لە لێوەکەیەوە بەپەت بەسترابووەوە. چەقۆکەم دەرهێنا پەتەکەم بڕی دەستم بردە ژێرەوە. شتێکی ڕەقی تیژ لەژێر خیوەتەکە هەبوو لەبەر باران پەسترابوونە پاڵ یەک. سەیری پێشەوەم کرد لە ڤارگۆنەکەی بەرامبەرم پاسەوانێ هەبوو، بەڵام تەماشای بەرایی خۆی دەکرد. دەسکە





ئاسنییەکەم بەردا و چوومە ژێر خیوەتەکە. نێوچەوانم زۆر بەتوندی بەر شتێ کەوت، هەستم کرد خوێن بەسەر دەموچاومدا دێتە خوارەوە. لە عاردی شەمەندەفەرەکە لێ ڕاکشام پاشان خۆم سووڕاند خیوەتەکەم بەستایەوە لەژێرەوەی خیوەتەکە لەگەڵ تۆپ بووم، بۆنی ڕوون و گریسی لێ دەهات. لێ ڕاکشام گوێم بۆ تەقە تەقی ڤارگۆنەکە کە لەسەر هێڵە ئاسنییەوە پەیدا دەبوو. لەگەڵ شووڕەی باران شل کردبوو کە بەخیوەتەکە دەکەوت، کەمێ ڕووناکی هاتبووە ژوورەوە، منیش بە لێ ڕاکشاوی سەیری تۆپەکانم کرد. تۆپەکان هێشتا بەرگی خۆیانیان لەسەربوو. هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە دەبێ ئەوانە لە سوپای سێیەمەوە ڕەوانەکرابن. نێوچەوانم لە ئەنجامی بەرکەوتنەکە ئاوسا. بەئارامگرتن و نەجوولانم مەیی. پاشان ئەو هەموو شوێنەی خوێنی مەییووی لەسەربوو پاکم کردەوە تەنیا سەر برینەکە نەبێ. برینەکەم زۆر نەبوو دەستەسڕم نەبوو، بەڵام پەنجەکانم هەر شوێنێ خوێنی مەیی لەسەر بوایە، بەهۆی ئەو دڵۆپە بارانانەوە کە لە خێوەتەکەوە کە دەکەوتنە خوارەوە دەسڕییەوە و بەقۆڵی چاکەتەکەم خاوێنم کردەوە. نەم دەویست خۆم بخەمە جێگای گومانەوە. دەمزانی بەر لەوەی بگەینە (مێستری) دەبێ داببەزم، چونکە ئەوان دەبێ ئاگاداری تۆپەکان بن. تۆپیان ئەوەندە نییە تا ئەوانە لەبیر بکەن و بزریان بکەن. منیش ئا لەو کاتەوە لەڕادەبەدەر برسیم بوو.

## 32

هەر کە لەناو عەردی شەمەندەفەرەکە لەتەک تۆپەکانەوە لەژێر خێوەتەکەوە لێ درێژ ببووم، تەڕ ببووم، سەرمام ببوو. بگرە زۆریشم برسی بوو. لەدواییدا خۆم وەرگێڕا و لەسەر زگ لێ درێژ بووم، سەرم بەباسکەکانم کردبۆوە چۆکم ڕەق بوو بەڵام زۆر لەسەرخۆ و بێ ئازار بوو، (ڤالینتی) پزیشک کارێکی جوان و پوختەی بۆ کردم، نیوەی ماوەی کشانەوەم بەپێ بڕیوە، کەمێکیش مەلەوانی لەناو ڕووباری (تالگلیامنتۆ) بەقاچاکەی ئەو کردووە. بەحەق بێ ئەم چۆکە هی (ڤالینتی)یە، چۆکەکەی تر هی خۆمە. پزیشکەکان هەندێ جار شتی وات بۆ دروست دەکەن، وات لێ دەکەن ئەم جەستەیەت چی دی بەهی خۆت نەزانی. سەرم هی خۆم بوو. ناو هەناویشم. هەروا برسیتییەکی لە ڕادەبەدەر لەناو هەناوم دابوو، هەستم کرد کە هەناوم لە برسان بەسەریەکدا دادەکەوتەوە. سەرم سەری خۆم بوو، بەڵام نەک بۆ ئەوەی بەکاری بێنم یا بیری پێ بکەمەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی یادگاری پێ بێنمەوە یادم، بەڵام ئەوەش ئەوەندە زۆر نا.

دەمتوانی بیر لە کاترین بکەمەوە، بەڵام زانیم گەر بیری لێ بکەمەوە شێت دەبم، بەتایبەتی لەوکاتەی هێشتا لێم مسۆگەر نییە کە چاوم پێی دەکەوێتەوە. بۆیە نەم دەیوست بیری لێ بکەمەوە. بەڕادەیەکی کەم نەبێ، بیرکردنەوەیەکی کەم لە کاترین، لەوکاتەی گالیسکەکە بەهێواشی دەڕۆیی و، تەقە تەقی لێوە دەهات، هەندێ ڕووناکی کە لە خیوەتەکەوە، لێ ڕاکشام لەگەڵ کاترین لەناو عەرزی ڤارگۆنەکەوە، لێ ڕاکشان لە

شوێنێکی وا ڕەق وەکو عەرزی ڤارگۆن ئاسا ، بۆ پاڵکەوتن نەک بیرکردنەوە، تەنیا هەستکردن، دوورکەوتنەوە ماوەیەکی زۆر، جلەکان تەڕ و عەردەکەش تەنها هەر جارێ کەمێ دەجووڵێتەوە ترسناکی ناوەوەش، وە تەنیایی و بەجلی تەڕ و عەرزێکی ڕەق و تەق بۆ خۆت و هاوسەرت.

تۆ نەحەزت لە عەرزی ڤارگۆن و نەلەتۆپە داپۆشراوە بەبەرگ خیوەتەکان. بۆنی میتاڵە چەورکراوەکان و نە لە بۆنی خیوەتەکە کە دڵۆپە بارانی پیادا دەهاتە ژوورەوە دەکرد، هەرچەندە ڕاکشان لەگەڵ تۆپ لەژێر خیوەتدا شتێکی باش و خۆشە. بەڵام تۆ یەکێکی ترت خۆش دەوێ کە دەزانی ئێستا لێرە نییە. ئێستاش تۆ خۆت بەڕووتی و سارد و کڕی، بەڵام ئەوەندە سارد و سڕ نییە وەکو ئەوەی ڕوون و بێ مانایە. بەتاڵە. تۆ ئەوە بەبێ مانایی دەبینیت، هەر کە لەسەر زگ لێی ڕاکشابووی، جا لە کشانەوەی سوپاییێک و هێرش بردنی، سوپایەکی تر ئامادە بووی. تۆش ئوتومبیلەکان و پیاوەکانت لەدەست چوو ، هەر وەکو چۆن خاوەن کۆگا کە سەروماڵی بەئاگرکەوتنەوە لە دەست دەدا. هەر چۆنێ بێ خۆ ئەمە هیچ بیمەکاری پێوە نییە. ئێستاش تۆ لەمە دەرباز بوویت. چ ئەرکت لەسەرشاندا نەماوە ئەگەر پاش ئاگر تێ بەردانی کۆگانیان خاوەن کۆگاکان بکوژن، لێیان مەگرن، چونکە لێ ڕاهاتوون وا قسە بکەن، لە دوای ئەمە بەمسۆگەری کەس چاوەڕێی گەڕانەوەی خاوەن کۆگاکان ناکات، هەر کە جارێکی تر بۆ ئیشکردن دەکرێنەوە. دەبێ بەدوای ئیشی تر بگەڕێن گەر ئیشی تری هەبێ و پۆلیس نەیان گرێ.

ڕق و تووڕەیی و ئەرکی سەرشانم لەناو ئاوی ڕووبارەکە شووران. هەرچەندە تووڕەیی داخی گرانم لەوکاتەوە نەما کە پۆلیسی جەنگی یەخەی گرتم ئاواتەخواز بووم جلی سەربازیم لەبەر نەبوایە. هەرچەندە زۆر گرینگیم بەجلەکان نەداوە. ئەستێرەکانم لە چاکەتەکەم کردبۆوە. ئەمەش لەبەر هۆیێ بوو. ئەمە نیشانەی سەربەرزی نەبوو. دژی ئەوانیش نەبووم. من دەستم لەوکارە شوشتبوو. هیوای بەختداریشم بۆیان خواست. پیاوی چاک و ئازا و زیرەک و هێمنیان تیابوو. شایستەی ئەوە بوون. بەڵام من هیچ پەیوەندییەکم بەو شانۆگەرییەوە نەما. هەموو هیوام ئەوەبوو کە ئەو شەمەندەفەرە نەفرەت لێکراوە بمگەینێتە (مێستری) بۆ ئەوەی تێر بخۆم و لەبیرکردنەوەش بوەستم پێویستە بوەستم. پیانی ئێستا پێیان دەڵێ قەرەبینادارەکان ئاگربارانیان کردووم. دەچن گیرفانی کوژراوەکان دەپشکنن تا ناونیشانی گوللەباران کراوەکان دەربهێنن. هی من نادۆزنەوە. لەو حاڵەتە دەڵێن خنکاوە. ئەوە سەیرە، دەبێ لە ئەمریکا چ بەکەسوکارم بڵێن. دەبێ بڵێن بەزامداری یا چەند هۆیەکی تر مردووە. خوایە برسیمە!.

لەخۆم دەپرسی ئاخۆ ڕینالدی و قەشەی هاوڕێمان دەبێ چیان بەسەر هاتبێ. لەوانەیە لە (پۆردینۆ) بن گەر زۆر نەکشاینەوە. چاوم پێی ناکەوێتەوە. چاوم بەهیچیان ناکەوێتەوە. ئەم ژیانە بەسەرچوو. قەت لەو باوەڕە نەبووم کە ئەو تووشی ئاتەشەک بووبێ. هەرچەندە دەڵێن ئاتەشەک نەخۆشییەکی کوشندەیە ئەگەر لەکاتی خۆی چارەسەر





نەکرێ. بەڵام ئەو عەجمانی نەمابوو. گەر منیش بوومایە هەروەها دەبووم. هەموو کەسێ لەبەری نارەحەت و بێ عەجمان دەبێ. بۆ ئەوە نەبوویمە تا بیرکەمەوە، بەڵکو بوویمە تاوەکو بخۆم. ئەی خوایە. بەڵێ هاتوومەتە دونیا تا لەگەڵ کاترین بخۆم و بخۆمەوە و بخەوم.

لەوانەیە ئەمشەو وابکەم. نەخێر ئیمڕۆ ئەمە زۆر ئەستەمە. بەڵام سبەی شەوێ لەنان و نیعمەتی جەمێکی باش و پۆشاکی ڕێک. هەرگیز جارێکی تر دوورناکەومەوە لەگەڵ ئەو نەبێ. لەوانەیە بەزووترین کات سەر هەڵگرین و لەو ناوە بڕۆین. ئەویش لەگەڵما دێ دەزانم لەگەڵم دێ. باشە، کەی بڕۆین؟ ئەمە شتێکە بیرکردنەوەی دەوێ. دنیا بەرەو تاریکی دەچوو درێژ بووم و بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێ ڕوو لە کوێ بکەین. شوێن گەلێ زۆر بوون.

## کتێبی چوارەم

## 33

لە میلانۆ، بەیانی زوو بەر لەوەی گزنگ بدا و پێش ئەوەی شەمەندەفەر بگاتە ئێستگە خێراییەکەی هێدی کردەوە، منیش خۆم فڕێدایە خوارەوە. لە هێڵی ئاسنی پەڕیمەوە بەنێوان دوو باڵەخانەدا هاتمە سەرشەقامێ، دەرگای مەیخانەیێ کرابووەوە. بۆ کەمێ قاوە چوومە ژوورەوە. بۆنی بەیانییەکی زووی لێ دەهات لە تۆزی گەسک دراو و کەوچکی پەرداخە قاوە و بازنەی تەڕ کە لەژێرەوەی پەرداخە مەیەکان بەجێمابوون. خاوەن مەیخانەکەش لە پشت (کەونتەری) مەیخانەکەوە ڕاوەستابوو. دوو سەربازیش لەسەر مێزێ دانیشتبوون. لە نزیک کەوەنتەرەکە ڕاوەستام، پەرداخێ قاوەم خواردەوە و لەتە نانێکم خوارد. قاوەکە بەشیرەوە ڕەنگی خۆڵەمێشی بوو. توێژی شیرەکەم بەلەتە نانەکە لابرد. مەیخانچییەکە تەماشای کردم و گوتی: «پێکێ گراپا نافەرمووی؟»

– «نەخێر، سوپاس.»

– «لەسەر حیسابی من.»

ئەمەی گوت و پێکێکی بچووکی پڕ کرد. بۆ لای منی هێنا. گوتی: «لەبەرەکانی شەڕ چ باسە؟»

– «ئاگادار نیم، نازانم.»

دەستی بۆ سەربازەکان درێژکرد و گوتی:

– «ئەوانە سەرخۆشن.»

جێی خۆی بوو بڕوای پێ بکەم، چونکە بەسەرخۆش دەچوون. گوتی: «پێم بڵێ لەبەرەی شەڕ چ باسە؟»

– «هیچ لەبارەی ئەوەوە نازانم.»

– «تۆم بینی لەسەر دیوارەکەوە خۆت فڕێدا. لەشەمەندەفەرەکەوە دابەزی.»

– «پاشەکشێیەکی گەورە لە ئارادایە.»

– «لە ڕۆژنامەدا خوێندوومەتەوە. چ ڕووی داوە؟ هەموو شتێ تەواو بووە؟»

– «باوەڕ ناکەم.»

پێکێکی تر گراپای لە بوتڵێکی بچووکەوە بۆ تێکردم.

گوتی: «گەر لە مەترسی دای دەتوانم بتشارمەوە.»

– «نەخێر، لەمەترسی دانیم.»

– «گەر لەمەترسی دای لەگەڵ من لێرە بمێنیتەوە.»





– «لەکوێ بمێنم؟»

– «لەناو ئەو باڵەخانەیە. زۆر کەس لێرە دەمێنن. هەر کەسێکی لە مەترسیدا بێ لێرە دەمێنێ.»

– «بۆ، خەڵکێکی زۆر لە مەترسیدان؟»

– «ئەوە دەوەستێتە سەر جۆری مەترسییەکە. تۆ خەڵکی ئەمریکای خوارووی؟»

– «نەخێر.»

– «ئیسپانیی دەزانی؟»

– «کەمێ.»

کەونتەری مەیخانەکەی سڕییەوە. گوتی:

– «زۆر زەحمەتە پیاو بتوانێ ئێستا وڵات بەجێ بێڵێ. بەڵام ئەمەش مەحاڵ نییە.»

– «ئارەزووی وڵات بەجێهێشتنم نییە.»

– «چەندی بتەوێ دەتوانی لێرەوە بمینێی. ئەو کات دەزانی من چ جۆرە پیاوێکم.»

– «ئەم بەیانییە دەبێ لێرە، ئۆغر بکەم، بەڵام ناونیشانەکەتم لەبیر ناچێ لە گەڕانەوە دێمە لات.»

سەری خۆی لەقاند، گوتی: «لە قسەکانتڕا دیارە ناگەڕێیتەوە. وام زانی کە لە بارێکی تەواو ناخۆش دای.»

– «لەڕاستیدا هیچ ناخۆشییەکم نییە. بەڵام ڕێزی تەواوم بۆ ناونیشانی هەر برادەرێ هەیە.»

بۆ نرخی قاوەکە دە لیریەکی کاغەزیم لەسەر کەونتەرەکەوە دانا.

گوتی[۱]: پێکێ گراپا لەگەڵ من بنۆشە.»

– «پێویست ناکا.»

– «تەنیا پێکێ.»

دوو پێکی تێکرد.

گوتی: «لە بیرت نەچێ، وەرەوە ئێرە. نەهێڵی خەڵکی تر لە خشتەت بەرن، ئێرە بۆ تۆ زۆر سەلامەتە.»

– «لەوە دڵنیام.»

– «دڵنیای؟»

– «بەڵێ.»

(۱) لەدەقە ئینگلیزییەکە نووسراوە من گوتم (I said) بەڵام ئەوە هەڵەی چاپە. ڕاستییەکەی (He said)ە واتە (ئەو گوتی).

لەسەر قسەکانی زۆر ڕشت بوو، گوتی:

– «کەوابوو ڕێگەم بدە شتێکت پێ بڵێم. بەو چاکەتە مەچووە دەرەوە؟»

– «لەبەرچی؟»

– «سەر قۆڵت بەئاشکرا هاوار دەکا، ئەستێرەکان لێکراونەتەوە. قوماشەکەش ڕەنگەکەی جیاوازە.»

نوقەم لێوە نەهات.

– «ئەگەر پسوولەت نییە دەتوانم پێتی بدەم.»

– «پسوولەی چی؟»

– «پسوولەی مۆڵەتدان.»

– «پێویستم پێی نییە. هەمە.»

– «زۆر باشە، بەڵام گەر پێویستت پێیە لە توانامدایە بۆتی پەیدا بکەم.»

– «بەچەندن؟»

– «دەوەستێتە سەر چەشنەکەی، نرخەکان ماقوولن.»

– «حاڵی حازر پێویستم پێی نییە.»

شانی خۆی هەڵتەکاند.

گوتم: «شوکر هیچ ناتەواوییەکم نییە.»

کاتێ هاتمە دەرەوە گوتی: «لەبیر نەکەی من هاوڕێتم.»

– «نەخێر، لەبیر ناکەم.»

گوتی: «دەتبینمەوە.»

– «باشە.»

لەدەرەوە لە هێڵی ئێستگە دوورکەوتمەوە، ژمارەیێ پۆلیسی سەربازی لەوێ وەستابوون. لەسیلەی باخچەیەکی بچووکەوە سواری پەیتوونێ بووم. ناونیشانی نەخۆشخانەکەم دایە پەیتوونچییەکە، لە نەخۆشخانە، چوومە ژووری دەرگەوانەوە. ژنەکەی ئامێزی تێ وەرهێنام، دەرگەوانیش تۆقەی لەگەڵ کردم.

– «هاتیتەوە، خۆ شوکر سەلامەتی؟»

– «بەڵێ.»

– «چاشت خواردووە؟»

– «بەڵێ.»

ژنەکەی پرسی: تەندروستیت چۆنە تێنیتا؟ چۆنیت؟.»

– «زۆر باشم.»





– «نانی بەیانی لەگەڵ ئێمە ناخۆی؟»

– «نەخێر، پێم بڵێ، داخوا بارکلی ئێستا لە نەخۆشخانەیە؟»

– «بارکلی؟»

– «سستەرە ئینگلیزەکە.»

ژنەکەی پاڵێکی بەدەستمەوە نا، زەردەخەنەیەکی گرت و گوتی:

– «دەزگیرانەکەی.»

دەرگەوانەکە گوتی:

– «نەخێر، لێرە ڕۆیشتووە.»

ئەمەی گوت و هەناوم داخورپا.

– «دڵنیایت؟ من مەبەستم شۆڕە کچە قژکاڵە ئینگلیزییەکەیە.»

– «دڵنیام چووە (ستریسا).»

– «کەی چووە؟»

– «دوو ڕۆژە لەگەڵ کچە ئینگلیزەکەی تر ڕۆیشتووە.»

گوتم: «باشە حەزدەکەم شتێکم بۆ بکەی. بەکەس نەڵێی منت بینیوە. ئەم مەسەلەیە زۆر گرینگە.»

کابرای دەرگەوان گوتی: «بەکەس ناڵێم.»

دە لیری کاغەزیم دایێ. بەڵام ڕەتی کردەوە.

گوتی: «بەڵێنت پێ دەدەم کە بەکەس ناڵێم. هیچ پارەشم ناوێت.»

ژنەکەی پرسی: «چیت دەوێ بۆتی ئەنجام بدەم، تێنیتا؟»

گوتم: «تەنیا ئەوەندەم دەوێ.»

دەرگەوان گوتی: «ئێمە لاڵین، هەرچییەکت هەیە پێمانی بڵێ تا بۆتی بکەین؟.»

گوتم: «بەڵێ، لە چاکەی خۆتە. خواحافیز، دەتان بینمەوە.»

لەبەر دەرگا ڕاوەستان و سەیری منیان کرد. سواری پەیتوونەکە بوومەوە. ناونیشانی (سیمۆنز)م دایێ. (سیمونز) یەکێکە لەوانەی دەیان ناسم و هونەری گۆرانی دەخوێنێ. ناوچەیەکی دووری شار لە نزیک (پورتاما گانێتا) دەژی، کە گەیشتمە وێندەر ئەو هێشتا لە خەودابوو.

گوتم: «تۆ زوو خەبەرت بوویتەوە، هێنری؟»

– «بەشەمەندەفەری یەکەم هاتووم.»

– «ئەو هەموو پاشەکشەیە چییە؟ تۆ لەبەرەی جەنگ بووی؟ جگەرەت هەیە؟»

– «جگەرەکان لەناو پاکەتەکەی سەر مێزەکەیە.»

ژوورێکی گەورەبوو تەختێک لە تەنیشت دیوارەکە دانرابوو، لەلایەکی ترەوە پیانۆیێک و کەنتۆرێکی جلکان و مێزێک دانرابوو. لەسەر کورسییەکی نزیک تەختەکەوە دانیشتم. (سیمۆنز) دانیشتبوو هەنیشکی خستە سەر سەرینەکەوە دەستی بەجگەرەکێشان کرد.

– «تووشی دەردەسەری خۆم بووم (سیمۆنز).»

گوتی: «منیش تۆ ئاسا تووشی خەم و خەفەت هاتووم. جگەرە ناکێشی؟.»

گوتم: «نەخێر، تەدارەکی چوونە سویسرا چۆن سازدەکرێ؟»

– «بۆ خۆت؟ ئیتاڵییەکان ڕێگەت نادەن بچیە دەرەوەی وڵات.»

– «بەڵێ، ئەوە دەزانم، بەڵام سویسرییەکان هەڵوێستیان چی دەبێ؟»

– «دەتگرن.»

– «دەزانم، کە گیرام چی دەبێ؟»

– «هیچ نابێ. ئەمە زۆر ئاسانە. دەتوانی بچیە هەر شوێنێ کە خۆت ئارەزووتە. وابزانم دەبێ ڕاپۆرتێ یا شتێکی لەو بابەتە بنووسی بۆچی؟ نیازی ڕاکردنت لەدەست پۆلیس هەیە؟»

– «تا ئێستا هیچ دیار نییە.»

– «پێم مەڵێ. گەر ناتەوێ پێم بڵێی. بەڵام حەزدەکەم بزانم لێرە هیچ ڕووی نەداوە. لە (پیاسێنزا)وە زۆر خراپ تێکەوتم.»

– «زۆر بەداخەوە.»

– «ئا، بەڵێ، زۆر خراپ بووم. بەڵام بەچاکی گۆرانیم گوت. دەچم لە (لیرکۆ) هەوڵ دەدەم دووبارە گۆرانی بڵێم.»

– «حەز دەکەم ئامادە بم.»

– «تۆ زۆر ڕەوشت بەرزی. خۆ لە ناخۆشیدا نی، وا نییە؟»

– «نازانم.»

– «پێم مەڵێ گەر خۆت حەز ناکەی پێمی ڕاگەینی. ئەمە چۆن وا ڕێک کەوتووە، کە تۆ لەبەرەیەکی وا خوێناوی دوورکەویتەوە؟»

– «دەستی خۆمم لێ شوشتووە.»

– «کوڕی چاک، دەزانم تۆ کوڕێکی ژیری. هەر چۆنێ بێ دەتوانم یارمەتیت بدەم؟»

– «تۆ سەرت زۆر قاڵە.»

– «نەخێر، زۆر نا هێنری ئازیز، هیچم پێ مەڵێ. سەرقاڵ نیم ئەگەر بتوانم شتێ بکەم بەیارمەتیدانت دڵشاد دەبم.»

– «بەژن و باڵات بەقەد منە. دەتوانی بچییە دەرەوە دەستە جلێکی مەدەنی پڕ





بەخۆتم بۆ بکڕی؟ خۆم هەمە بەڵام هەمووی لە ڕۆمایە.»

– «تۆ لەوێ دەژیای. وانییە؟ جێگایەکی پیسە. چۆن بوو لەوێ دەژیای؟!»

– «دەمویست ببم بەئەندازیاری بیناسازی.»

– «ئەوێ شوێنی ئەوە نییە. جلوبەرگ مەکڕە. ئەوەی پێویستە پێتی دەبەخشم. زۆر جوان و ڕێکوپێکت دەکەم. بڕۆ ژوورێ، کەنتۆری جلان لەوێیە. ئەوەی زەوقت دەیگرێ لەبەری بکە، هاوڕێی خۆشەویستم، پێویست ناکا جل بکڕی.»

– «وام پێ باشە کە بیکڕم، سیم.»

– «هاوڕێی ئازیزم، بۆ من وا ئاسانترە، ئەوەی پێویستە لێرە بتدەمێ. نەک بچمە دەرەوە بیانکڕم. خۆ پاسەپۆرتت هەیە؟ ناتوانی لەوێ بێ پاسەپۆرت سەفەر بکەی.»

– «بەڵێ، پاسەپۆرتی خۆمم هەڵگرتووە.»

– «کەوا بوو ئەم جلانە لەبەر بکە، ڕوو لە (هیلفیتای)ی کۆن بکە.»

– «چۆنە ئەوێ وا ئاسان نییە. دەبێ یەکەم جار بچمە سترێزا.»

– «زۆر چاکە هاوڕێی خۆشەویستم. دەبێ بەبەلەم بپەڕیتەوە، ئەگەر نەمویستبایە جارێکی تر گۆرانی بڵێم لەگەڵت دەهاتم. ئەم ڕێگەیەم هەر لەبەردایە. دەبێ ڕۆژێ لە ڕۆژان هەر بڕۆم.»

– «دەتوانی بەڕێگەی هاتوهاوار گۆرانی بچڕیت.»

– «هاوڕێی ئازیزم بەڕێگەی هاتوهاوار گۆرانی دەچڕم. بەڕاستی من دەتوانم گۆرانی بڵێم. ئەمە بەشە سەیرەکەیەتی.»

– «گرۆت لەگەڵ دەکەم، دەتوانی گۆرانی بڵێی.»

لەناو جێگا پاڵی دایەوە و کەوتە جگەرەکێشان و گوتی: «شاقاوی لە خۆت گەورەتر مەهاوێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەش دەتوانم گۆرانی بڵێم. ئەمە شتێکی سەیری نەفرەت لێکراوە، بەڵام دەتوانم. حەزدەکەم گۆرانی بڵێم. گوێ بگرە.»

هاواری کرد: «ئەفریکانا.»

دەماری ملی ئاوسان و قیت وەستان.

گوتی: «جا ئەگەر بەدڵیان بێ یا بەدڵیان نەبێ دەبێ گۆرانی بڵێم.»

لەپەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم کرد، گوتم:

– «دەچمە خوارەوە بەپەیتوونچییەکە دەڵێم بڕوا.»

– «بگەڕێیتەوە، هاوڕێی ئازیزم. تا چاشت پێکەوە بخۆین.»

لە جێگەی خۆی هاتە دەرەوە، هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و دەستی بەمەشقکردن کرد. منیش چوومە خوارەوە و کرێی پەیتوونچییەکەم دا و بەڕێم کرد.

## 34

بەجلی مەدەنی خۆم وەک یەکێکی خۆگۆڕیو دەهاتە بەرچاو. ماوەیەکی زۆر بەجلی سەربازی بووم و هەستی ئەوەم نەمابوو جلی مەدەنی بپۆشم. پانتۆڵەکەم فشوفۆڵ دیاربوو. لە (میلانۆ)ە پلیتێکم بۆ (ستریزا) بڕی. شەپقەیەکی نوێشم کڕی. نەمتوانی شەپقەکەی (سیمۆنز) بکەمە سەرمەوە. بەڵام جلەکانی لەبەرم ڕێک بوون. بۆنی توتنیان لێ دەهات. کاتێ لە کونجێکی شەمەندەفەرەوە دانیشتم لەجامەکەوە سەیری خۆم کرد، شەپقەکەم زۆر نوێ دیار بوو، جلەکانیشم زۆر کۆن. منیش خۆم وەکو ئاوایی (لومبارد)ی تەڕ کە لە جامەکەوە دیاربوو، خەمبار دەهاتە بەرچاو. چەند فڕۆکەوانێ لەناو کونجەکە بوون. زۆر بیریان لەمن نەکردەوە. سەیریان نەدەکردم، زۆر ڕقیان لە هاووڵاتی مەدەنی هاوتەمەنی من بوو. هەستم بەوە نەدەکرد کە لەلایەن ئەوانەوە ڕیسوا کرابم. ئەگەر ئێستا جاران بوایە. ڕیسوام کردبوون و لەگەڵیان تێکگیرابووم. لە (گالاریت) لە شەمەندەفەر دابەزین، زۆر دڵشاد بووم بەوەی کە بەتەنیا مامەوە. ڕۆژنامەم لا هەبوو، بەڵام نەمخوێندەوە. چونکە نەمدەویست هیچ شتێ دەربارەی شەڕ بخوێنمەوە. دەمویست لەبیر خۆمی بەرمەوە. پەیمانێکی ئاشتی یەک لایەنیم بەستبوو. هەستم بەتەنیاییەکی تەواو نەکرد کە شەمەندەفەر گەیشتە (ستریزا) زۆر دڵشاد بووم. لەو باوەڕەدا بووم کە هەندێ کۆڵهەڵگرانی ئوتێلەکان لە ئێستگە ببینم، بەڵام کەسی لێ نەبوو. ماوەیەک بوو کەژ بەسەرچوو بوو، هیچ کۆڵهەڵگرێ بەپیر شەمەندەفەرەوە نەهات. بەجانتاکەمەوە لەشەمەندەفەرەکە دابەزیم. جانتای (سیمۆنز) بوو. لە هەڵگرتن زۆر سووک بوو. لە دوو کراس بترازێ هیچی دیکەی تیا نەبوو. لەترسی باران کەمێ لەژێر کەپری ئێستگە ڕاوەستام، شەمەندەفەرەکە کەوتە ڕێ. لە ئێستگەکەوە چاوم بەپیاوێ کەوت، لێم پرسی ئاخۆ دەبێ بزانێ چ ئوتێلێ ئێستاکە دەرگای لەسەر پشتە؟ پێکەوتم کە (گران هوتێل دس ئیلز بورمیە) و چەند ئوتێلێکی بچووکی تر بەدرێژایی ساڵ دەرگایان لەسەرپشتە و کراونەتەوە. لەژێر باران جانتاکەم هەڵگرت و بۆ ئوتێلی (ئیلە بورمیە) ملی ڕێگەم گرت. چاوم بەپەیتوونێ کەوت. بەشەقامدا دەهاتە خوار. ئیشارەتم بۆی کرد. وا باشتر بوو بەپەیتوون بچم. تا بەردەرگای ئوتێلێکی گەورە چووین و، خزمەتکاری ئوتێلەکە بەسەیوانێ هاتە دەرەوە و زۆر بەرێز بوو. ژوورێکی باشم گرت، ژوورێکی گەورە و ڕووناک بوو بەسەر دەریاچەی دادەڕوانی. هەورەکان تا سەر دەریاچەکە نزم ببۆوە. بەڵام لە ڕۆژانی خۆرەتاوا دیمەنێکی جوانی دەبوو. بەکارگێڕانی ئوتێلەکەم گوت چاوەڕوانی هاتنی هاوسەرەکەمم. لە ژوورەکەدا چوارپایەکی دوو نەفەری گەورەی تیابوو. بەهۆڵە درێژەکانیدا ڕۆیشتم. بەپێبلکەیەکی بەرین دابەزیمە خوارەوە. بەلای چەند ژوورێکدا بۆ مەیخانەی ئوتێلەکە چووم. مەیخانەچییەکەم ناسییەوە. لەسەر ستولێکی بەرز دانیشتم و بادەم و پەتاتەی





سوورکراوم خوارد. مەیە(مارتینی)یەکە فێنک و پاک بوو. مەیفرۆشەکە پاش ئەوەی پێکی دووەمی مارتینی بۆ تێکردم لێی پرسیم:

– «تۆ لێرە، لە بورگیز، چی دەکەی؟»

– «لە مۆڵەتدامە. مۆڵەتی خۆزی نە گەرانەوەم.»

– «ئێرە کەسی لێ نییە. نازانم بۆچی دەرگای ئوتێلەکانیان کردۆتەوە.»

– «لەڕاوە ماسی بووی؟»

– «چەند ماسییەکی نازدارم ڕاوکردووە. ئەو کەسەی لەو وەختەی ساڵ بچێتە ڕاو بەدەستی بەتاڵ ناگەڕێتەوە.»

پێکەنیم. نەمتوانی تووتنی بۆ پەیدا بکەم. ئەو تووتنی پایپی ئەمریکی خواستبوو. کەسوکاریشم تووتنیان لێ بڕیبووم، بۆیان ڕەوانە نەدەکردم، لەوانەیە لەلایەن میرییەوە قەدەغە کرابێ، هەرچۆنێ بێ بەدەستم نەدەگەیشت.

گوتم: «هەندێکی ترت هەر بۆ پەیدا دەکەم. پێم بڵێ تۆ دوو ئافرەتی ئینگلیزیت لەم شارەوە نەدیوە؟ پێرێ هاتوونەتە ئێرە؟»

– «لەم ئوتێلە دانەبەزینە.»

– «سستەرن.»

– «دووسستەرم دیوە. خولەکێ چاوەڕێکە. هەر ئێستا پێدەکەوم لە کوێ دابەزینە.»

گوتم: «یەکیان هاوسەرمە. بەدوای سۆراغی ئەودا هاتووم، تا چاوم پێی کەوێ.»

– «ئەوی تریشیان هاوسەری منە.»

– «گاڵتە ناکەم.»

– «ببوورە لە سوحبەتەکەم. من وای بۆ نەچووم.»

پاش بێنێ بە کڕ و هێمنی چووە دەرەوە. ماوەیەکی کورت بەتەنیا مامەوە. منیش زەیتوون و باوی خێ کراو و پەتاتەی سوێرکراوم خوارد. لە ئاوێنەکەی پشت کەوەنتەری مەیخانەکەوە سەیری خۆم و بەرگە مەدەنییەکەمم کرد، مەیفرۆشەکە هاتەوە.

گوتی: «لە ئوتێلێکی بچووکی نزیک ئێستگەوە دابەزیون.»

– «چۆن هەندێ سەندەویج پەیدا بکەین؟»

– «بەتەلەفۆن بۆتی پەیدا دەکەم. خۆت دەبینی کە هیچمان نییە کەس لە ئوتێل دانەبەزیوە.»

– «بەڕاستتە! کەسی تیا دانەبەزیوە؟»

– «بەڵێ، چەند کەسێکی کەمی تیا دابەزیوە.»

سەندەویجەکان هێنران و سێیانم خوارد، دوو پێکی تر (مارتینی)م نۆشی. لە ژیانمدا هیچ شتێ ئەوەندە سارد و پاکم تام نەکردووە. وای لێ کردم خۆم بەپیاوێکی شارستان

بزانم. مەی سوور، نان، پەنیر، قاوەی خراپ و گراپام یەکجار زۆر خواردبۆوە. لەسەر ستولێکی بەرز بەرامبەر تەختەداری (ماهۆگانی) و براس و ئاوێنەکان دانیشتم. بیرم بۆ لای هیچ شتێ نەدەچوو. مەیفرۆشەکە چەند پرسیارێکی لێ کردم.

گوتم: «هیچ دەربارەی شەڕ مەپرسە.»

شەڕەکە زۆر دوور بوو. وا پێدەچوو شەڕ هەر ڕووی نەدابێ، ئەوەی شەڕ بێ لێرە بوونی نەبوو. ئەوسا زانیم کە شەڕ بەگوێرەی من تەواو بووە و بەسەرچووە. بەڵام ئەو هەستەم لەلا نەدەخولقا کە شەڕ تەواو بووە، هەستم بەهەستی ئەو قوتابییە دەچوو، کە سەعاتێ لە قوتابخانە دوا دەکەوێ. تەنیا بیر لەو سەعاتە دەکاتەوە کە ئاخۆ دەبێ چی ڕووی دابێ.

کاترین و هێلین فێرگسۆن لەسەر نانی ئێوارە بوون کە چوومە ئوتێلەکەیان. کاتێ لە داڵانەکە ڕاوەستام، ئەوانم لەسەر خوان بینی. فێرگسۆن قسەی دەکرد. کە چوومە ژوورەوە لە قسەکردن وەستا. کاترین گوتی: «خواکەم!.»

گوتم: «هەلەو، ڕۆژباش.»

کاترین: «ئەوە تۆی.»

ڕووی گەشایەوە، ئەوەندە کەیفخۆش بوو، تەنانەت باوەڕی نەدەکرد. ماچم کرد، سوور هەڵگەڕا، لەسەر مێزی خوانەکە لەگەڵیان دانیشتم.

فێرگسۆن پرسی: «پیاوێکی سەیری لێرە چ دەکەی؟ نانت خواردووە؟»

– «نەخێر.»

ئەو کچەی خواردنی دەهێنا هاتە ژوورەوە. پێم گوت، قاپێ خواردنم بۆ بێنێ. کاترین بەدرێژایی ئەوکاتە چاوی لە چاوانم بڕیبوو. فێرگسۆن پرسی:

– «بەو جلوبەرگە لێرە چ دەکەی؟»

– «ئەندامی ئەنجومەنی وەزیرانم.»

– «لەناخۆشی دای؟»

– «ڤێرگی، کەیفخۆش بە. هەر کەمێ کەیفخۆش بە.»

– «بەدیتنت کەیفخۆش نابم، هەر من دەزانم ئەو کچەت خستۆتە چ داوێکەوە بەلای منەوە، تۆ دیمەنێکی دڵخۆشکەر نیت.»

کاترین بزەیەکی بۆ کردم، لەژێر مێزەکەوە سەرە پێیەکی گەیاندمێ.

– «کەس منی نەخستۆتە داوەوە. ڤێرگی خۆم بەخۆمم کردووە.»

فێرگسۆن: «ناتوانم بەرگەی ئەو پیاوە بگرم. ئەو هیچی نەکردووە تەنیا بەفرۆکە ئیتاڵییەکەی تۆی هەندێک کردووە. ئەمریکییەکان لە ئیتاڵییەکان خراپترن.»

کاترین گوتی: «سکۆتلەندییەکان چتۆ ڕەوشت بەرزن.»





– «مەبەستم ئەوە نییە. مەبەستم فڕوفێڵە ئیتاڵییەکەیەتی.»

– «من فێڵبازم. فێرگی؟»

– «بەڵێ، لە فێڵباز خراپتری وەکو ماری. ماری لەناو ملی سەربازی ئیتاڵیدا بەخۆ و بەپاتاڵی سەرشانت.»

– «خۆ ئێستا جلی سەربازی ئیتاڵیم لەبەر نییە.»

– «ئەمە نموونەیەکی تری تەڵەکەبازییەکەتە، ئەم هاوینەت بەدڵداری ڕابوارد و ئەو کچەت زگ پڕ کرد. ئێستاش دەتەوێ فێڵێکی تر بدۆزیتەوە تا خۆتی لێ ڕزگار بکەی.»

زەردەخەنەیەکم بۆ کاترین کرد، ئەویش زەردەخەنەیەکی بۆ کردم.

کاترین گوتی: «هەردووکتان یەک شتن، بەسایەی تۆوەیە شەرم لەخۆم دەکەمەوە.»

– «کاترین بارکلی، نەشەرمت هەیە نەشەرەف، تۆش وەک ئەو تەڵەکەبازیت.»

کاترین دەستی لەسەر دەستی دانا، گوتی: «نەخێر، فێرگی. تاوانبارم مەکە. تۆ دەزانی ئێمە هەردووکمان یەکترمان خۆش دەوێ.»

فێرگسۆن ڕەنگی سوور هەڵگەڕاو گوتی: «دەستت لادە، گەر تۆزقاڵێ شەرمت هەبوایە. بەم چەشنە نەدەبووی تەنیا خوات دەزانێ زگت چەند مانگانە، تۆش هەروا دەزانی گاڵتەوگەپە. ئێستاش وا حریتە حریتتە چونکە هاوسەرە فریودەرەکەت هاتۆتەوە لات، ئای چەند بێ شەرم و بێ هەستی.»

فێرگسۆن دایە پڕمەی گریان. کاترین هەستایەوە، چوو دەستی لەمل کرد.

کە بەپێوە وەستابوو تا دڵی فێرگسۆن بداتەوە، هیچ گۆڕانێکم لەبەژن و باڵای بەدی نەکرد.

فێرگسۆن بەنووزە نووز گوتی: «بەلامەوە گرینگ نییە. ئەمە شتێکی زۆر بێزەوەرە؟ کاترین دڵی دایەوە. گوتی: «بەسە، بەس، شەرمەزارم دەکەی، مەگری فێرگی، مەگری، ئەی فێرگییەگیان.»

فێرگسۆن بەهەنسکەوە گوتی: «ناگریم، ناگریم. تەنها بۆ ئەو ڕەفتارە دەگریم کە تێوەگلاوی.»

سەیری منی کرد و گوتی: «من ڕقم لەتۆیە. کاترین ناتوانێ وام لێ بکا ڕقم لێت نەبێتەوە. تۆ لە خشتەبەرێکی چەپەڵی ئەمریکی ئیتاڵی.»

لووت و چاوی لەگەڵ گریان سوور داگەڕابوون. کاترین پێم پێکەنی.

فێرگسۆن: «کاتێ دەستت لەسەر شانمە بەئەو پێمەکەنە.»

– «ڕەفتاریکی ناپەسندە. فێرگی....»

بەهەنسکەوە گوتی: «دەزانم، گوێ مەدەنە قسەکانم، پەشۆکاوم، عاقڵ نیم، ئەمە

دەزانم دەمەوێ هەردووکتان بەختیاربن.»

کاترین گوتی: «ئێمە بەختیارین، فێرگی تۆش خوێن شیرینی.»

فێرگسۆن دیسان تێی هەڵکردەوە گریان و گوتی: «نامەوێ ئێوە بەم ڕێگایە بەختیار بن. بۆچی یەکتری ناخوازن؟ خۆ ژنی ترت نییە. وانییە؟»

گوتم: «نەخێر، نیمە.»

کاترین پێکەنی.

فێرگی: «ئەمە پێکەنینی ناوێ. زۆربەیان ژنی تریان هەیە.»

کاترین: «ئەگەر بەوە دڵخۆش دەبی، ئەوا یەکتری دەخوازین.»

فێرگی گوتی: «نەک بۆ دڵخۆشی من. دەبوا ئێوە خۆتان ئەوەتان بویستبایە.»

– «ئەوسا ئیشمان زۆر بوو.»

– «بەڵێ، دەزانم. خەریکی منداڵبوون بوون.»

وام زانی کە دیسان دەست بەنووزە نووز بکاتەوە. بەڵام دەستی بەتانە و توانج گرتن کرد.

گوتی: «وابزانم ئەمشەو لەگەڵ ئەو دەڕۆی؟»

کاترین: «بەڵێ، گەر بیەوێ.»

– «ئەی من؟»

– «بۆ بەتەنیا لێر دەترسی؟»

– «بەڵێ، دەترسم.»

– «کەوابوو لەگەڵ تۆ دەمێنم.»

– «نەخێر، لەگەڵ ئەو بڕۆ، هەر ئێستا لەگەڵ ئەو بڕۆ، لە دیتنی ئێوە بێزار بووم.»

– «وا چاکە خواردنەکە تەواوکەین.»

– «نەخێر، هەر ئێستا بڕۆین.»

– «فێرگی تۆزێ عاقڵ بە.»

– «پێم گوتن، هەر ئێستا بڕۆنە دەرەوە، هەردووکتان دوورکەونەوە.»

گوتم: «کەوابوو بابڕۆین.»

زۆر لێی پڕ ببووم.

– «دەبینم، ئێوە شەیدای ڕۆیشتنن. دەتانەوێ بەتەنیا بەجێم بێڵن. تەنانەت حەز دەکەم نانەکەشم هەر بەتەنیا بخۆم. من هەر بەهیوای ئەوە بووم کە بچمە دەریاچەکانی ئیتاڵیا. ئێستاش وا چۆن هات، ئۆه، ئۆه....»

دەستی بەهەنسک کرد و سەیری کاترینی کرد و هەناسەی لە گەروو مایەوە. کاترین





گوتی:

– «تا پاش شێوان لێرە دەمێنین. نەخێر. بەتەنیا بەجێت ناهێڵم گەر مەبەستتە مانەوەم بێ، دەمێنم. بەتەنیا بەجێت ناهێڵم، فێرگی.»

چاوەکانی سڕییەوە و گوتی:

– «نەخێر، نەخێر، دەمەوێ بڕۆن، دەمەوێ بڕۆن زۆر بێ عەقڵم، تکایە قسەکانم بەهێند هەڵمەگرن.»

ئەو کچەی خواردنی هێنا کە چاوی بەم بەزم و گریانە کەوت پەشۆکا، بەڵام ئەوەندەی نەبرد کە گەڕایەوە کە بەشە خواردنەکەی هێنا هەستی کرد بارەکە باشتر بووە. ئەوێ شەوێ لە ئوتێلدا، لە ژوورەکی خۆمان بووین کە هۆڵێکی درێژ و بەتاڵی دەرەوە هەبوو و پێڵاوەکانیشمان لە دەرەوە بوون و لەبەردەرگا ڕایەخێکی ئەستوور لەسەر عەرزی ژوورەکە بوو. لە دەرەوەش، لە پەنجەرەکەوە، باران بوو، ڕووناکی ژوورەوەش خۆش و ئاسوودە، پاشان ڕووناکی دەرەوە و ڕووناکییە زەوق هەڵسێنەکە لەگەڵ چەند چەرچەفێکی لووس و نوێنێکی خۆش و دڵخۆشکەر، وای لێ دەکردین هەست بکەین کە هاتووینەوە ماڵی خۆمان، چیتر هەستمان بەتەنیایی نەدەکرد.

لەشەودا یەکێکمان واگا دەهات تا بزانێ ئەوی تر لەوێ ماوە و دوور نەکەوتۆتەوە. بێجگە لەمانە هەموو شتێکی تر درۆ و ناڕاست بوون. کاتێ ماندووبووین نوستین. یەکێکمان واگا دەهاتەوە ئەوی تریش واگا دەهات. بەم شێوەیە هیچێکمان بەتەنیا نەدەبووین، پیاو حەز بەتەنیایی دەکا. کچیش حەز بەتەنیایی دەکا. ئەگەر یەکتریشمان خۆش بووێ. ئیرەیی بەتەنیایی یەکتر دەبەین. بەڵام دەتوانم بڵێم کە بەڕاستی ئێمە هەرگیز وامان هەست نەکردووە. ئێمە لەوکاتەی هەستمان بەتەنیایی کردووە کە پێکەوە بووین بەرامبەر خەڵکی تر هەستمان بەتەنیایی دەکرد. خۆم تەنیا جارێک وام بەسەر هات، کاتێ لەگەڵ چەند کچێ بووم هەستم بەتەنیایی کرد. ئەو ڕێگایە وات لێ دەکا کە هەست بەتەنیاییەکی بێ پایان بکەی. بەڵام ئێمە هەرگیز بەتەنیا نەبووین، هەرگیز بەتەنیا نەبووین، هەرگیز نەترساوین هەرکە پێکەوە دەبووین. دەزانم کە شەو وەکو ڕۆژ نابێ: هەموو شتێکیان جیاوازە. شتەکانی شەو ناتوانرێ لە ڕۆژدا باسی لێ بکرێ، چونکە لە ڕۆژدا نین. شەویش بۆ ئەو کەسانەی بەتەنیان و تەنیاییان دەستی پێکردووە و کاتێکی ترسناکە. بەڵام لەگەڵ کاترین کاتێکی خۆشتری بووە. کاتێ خەڵک بەجەرگێکی ئازایانەوە ڕووبەڕووی دونیا دەبنەوە. دونیا دەبێ بیان کوژێ و بیان شکێنێت. هەڵبەتە دەشیان کوژێ. دونیا هەموو کەسێ دەشکێنێ، پاش ئەمە زۆر کەس بەهێز دەبنەوە لە شوێنی شکاندا. بەڵام ئەوانەی ناشکێن، دەیانکوژێ. دونیا بەبێ لایەنگیری ئەوانەی زۆر چاک و زۆر دڵنەرم و زۆر ئازان دەکوژێ. ئەگەر لە هیچێکیش لەمانە نەبێ دەبێ لێت مسۆگەر بێ کە تۆش هەر دەکوژێ. بەڵام ئەمەش پەلەیەکی تایبەتی ناوێ.

دێتە بیرم بەیانی کە لەخەو هەڵسام کاترین لە خەودابوو، تیشکی ڕۆژ لە پەنجەرەکە دەهاتە ژوورەوە، باران وەستابوو، لەنێو نوێن هاتمەدەر، بۆ لای پەنجەرەکە چووم، لە خوارەوەی پەنجەرەکەوە باخچە هەبوون ڕووت ببوونەوە، بەڵام جوان و ڕێک بوون. ڕێچکەی چەوڕێژکراو، دارودرەخت، دیوارە بەردینەکەی نزیک دەریاچە، دەریاچەکەش لەبەر تیشکی ڕۆژ چیاکانی ئەوبەر... لە تەنیشت پەنجەرەکەوە ڕاوەستابووم و سەیری دەرەوەم کرد، کاتێ ڕووم سووڕاند کاترینم لەخەو هەستاند و سەیری منی دەکرد. گوتی: «چۆنی ئازیزم؟ ڕۆژێکی خۆشە وا نییە؟»

– «تۆ چۆن هەست دەکەی؟»

– «زۆر باشم. شەوێکی خۆشمان ڕابوارد.»

– «چاشت دەخۆی؟!»

ئەو دڵی چاشتی ویست. هەروەها منیش. نانەکەشمان لەسەر جێگا خوارد، تیشکەخۆری نۆڤێمبەریش لە پەنجەرەکەوە خۆی دەژوورەوە کوتا، خوانی نانخواردن لەنێو باوەشم بوو.

– «ڕۆژنامەت ناوێ؟ تۆ لە نەخۆشخانە هەردەم ڕۆژنامەت دەویست.»

گوتم: «نەخێر، ئێستا ڕۆژنامەم ناوێ.»

– «کار ئەوەندە تووش بووە، ناتەوێ دەربارەشی شت بخوێنیتەوە؟»

– «نامەوێ هیچی دەربارەی بخوێنمەوە.»

– «خۆزیا منیش لەگەڵت بام تاوەکو شتێکم دەربارەی ئەم شەڕە لە نزیکییەوە بزانیبایە.»

– «گەر توانیم لە مێشکم ڕێکی بخەمەوە ئەوا ڕۆژێ سەربردەکەت بۆ دەگێڕمەوە.»

– «بەڵام ئەگەر بەجلی مەدەنییەوە بتبینن ناتگرن؟»

– «لەوانە گوللە بارانم بکەن.»

– «کەوابێ نابێ لێرە بمێنین، دەبێ لەم وڵاتە بچینە دەرەوە.

– «بیرم لە شتێکی وا کردۆتەوە.»

– «دەچینە دەرەوە، ئازیزەکەم، نابێ خۆت تووشی مەترسی بکەی پێم بڵێ چۆن لە (میستری)یەوە چوویتە (میلانۆ)؟»

– «بەشەمەندەفەر، بەجلی عەسکەری بووم.»

– «ئەو کات ترست نەبوو؟»

– «بەو ڕادەیە نا، پسوولەیەکی هاتوچۆکردنی کۆنم لا هەبوو، لە (میستری) ڕۆژ و کاتم لەسەر دانا.»

– «ئازیزەکەم، تۆ لێرە هەردەم ڕووبەڕووی گرتن دەبییەوە، من هیچ شتێکی وام





ناوێ، ئەگەر کاری واش بکەی ئەوا کارێکی شێتانەیە. ئەگەر بتگرن ئێمە هیچمان بەسەردێ.»

– «با بیر لەوە نەکەینەوە، ئەوەندەی بیری لێ بکەمەوە بێزار بووم.»

– «چ دەکەی گەر هاتن بتگرن؟»

– «دەیان دەمە بەر گوللە.»

– «دەبینی چەند بێ عەقڵی، نایەڵم پێت لە ئوتێل بچێتە دەرەوە تاوەکو بەجێی نەهێڵێن.»

– «ڕوو لەکوێ کەین؟.»

– «لەڕێی خوا بەم شێوەیە ڕەفتار مەکە، ئازیزەکەم، هەر شوێنێ بێ ڕووی تێ دەکەین. بەڵام تکایە شوێنێ بدۆزەوە یەکسەر ڕووی تێ بکەین.»

– «سویسرا، لەم بەری دەریاچەکەوە، دەتوانین بچینە وێندەر.»

– «شتی چاکە.»

هەور دەرەوەی داپۆشیبوو، تاریکیش بەرە بەرە باڵی بەسەر دەریاچەکەوە دادەکێشا.

گوتم: «بەو هیوایەم تا سەر ژیانی تاوانبارانە نەبەینە سەر.»

– «بەم شێوەیە مەبە، ئازیزم، تۆ ماوەیەکی دوور و درێژ وەکو تاوانباران نەژیاوی، ئێمە هەرگیز وەکو تاوانباران نەژیاوین. لەمەودواش کاتێکی خۆش بەسەر دەبەین.»

– «وەکو تاوانبارێ هەست دەکەم. لە سوپاوە ڕام کردووە.»

– «ئازیزەکەم، تکایە هۆش بێنەوە سەرە خۆت، ئەمە ڕاکردن نییە لە سوپاوە. ئەم سوپایە تەنیا سوپایەکی ئیتاڵییە.»

پێکەنیم گوتم: «تۆ کچێکی باشی، بابچینە سەر چوارپایەکەوە. لەنێو جێگە هەست بەخۆشی دەکەم.»

پاش ماوەیەکی کەم کاترین گوتی: «تۆ وەکو تاوانبارێ هەست ناکەی، وانییە؟»

گوتم: «نەخێر، کاتێ لەگەڵ تۆمە وا هەست ناکەم.»

– «تۆ کوڕێکی گەمژەی. بەڵام من چاودێریت دەکەم، کارێکی مەزن نییە. ئازیزەکەم دەمەو بەیانیان هەست بەدڵ خێورانەوە ناکەم؟»

– «زۆر جوانە.»

– «تۆ ناتوانی بخەملێنی کە چ هاسەرێکی باشت هەیە. بەلامەوە ئەوە گرینگ نییە. جێگایەکی وات بۆ دەدۆزمەوە. نەتوانن پەی پێ ببەن و دەستگیرت بکەن. ئەوکات ژیانێکی بەختیارانە دەبەینەسەر.»

– «با هەر ئێستا بچین.»

– «دەچین، ئازیزم، هەر شوێنێک و هەر کاتێ تۆ بڵێی لەگەڵتام.»

– «با بیر لە هیچ نەکەینەوە.»

– «زۆر باشە.»

## 35

کاترین لەلای دەریاچەکەوە بۆ دیتنی (فێرگسۆن) گەڕایەوە ئوتێلە بچکۆلەکە و منیش لەمەیخانە دانیشتم و ڕۆژنامەم خوێندەوە. مەیخانەکە کورسی قایشی نەرم و خۆشی تیابوو. لەسەر کورسیێ دانیشتم. بەخوێندنەوەی ڕۆژنامە خەریک بووم. تا مەیفرۆشەکە هات. سوپا لە (تاکلیامانتۆ) خۆی نەگرتەوە، بۆ (پیاڤ) کشاوەتەوە. (پیاڤ)م هاتەوە یاد، ئەو هێڵە ئاسنییەی بۆ بەرەی جەنگ دەچوو لە نزیک (سانا دۆنا) بە(پیاڤ)دا تێپەڕ دەبوو. لەم ناوچەیەدا ڕووباری (پیاڤ) قوڵ و لەسەرخۆ و تەنگەبەربوو، لە خوارەوەی زەلکاو نۆکەندی مێشوولاوی هەبوو. لەوێ چەند ڤێلایەکی دڵڕفێنی تیابوو، جارێکیان، بەر لەشەڕ بەسەر (کورتینا دامپنزۆ) کەوتم ماوەی چەند سەعاتێ بەنێو گردەکاندا ڕۆیشتم. لەسەر لووتکەکەوە، ڕووبارەکە لە چۆمێکی ماسیبە کەشینیی دەکرد، بەتیژی دەڕۆیشت کە بەتەنکی دەکێشا و چەند گۆلاوێکی تەنکی لەبن سێبەری بەردان پێکهێنابوو. ڕێگاکە لە (کادۆر) پێچی دەکردەوە. لە خۆمم پرسی ئاخۆ چۆن سوپای سەر ئەم لووتکە دادەبەزێتە خوارەوە.

مەیفرۆشەکە هات.

گوتی: «کۆنت گریفی سۆراخی دەکردی.»

– «کێ؟»

– «کۆنت گریفی. ئەو پیاوە بەساڵاچووەت دێتەوە یاد کە جاری پێشوو لێرە بوویت.»

– «ئەو لێرەیە؟»

– «بەڵێ، لەگەڵ کچی براکەی لێرەیە. پێم گوت تۆ هاتوویتە ئێرە. دەیەوێ بلیاردی لەگەڵ بکەی.»

– «کوا، لە کوێیە؟»

– «چووەتە پیاسە.»

– «داخوا چۆنە؟»

– «لە جاران میرکوڕترە. شەوی ڕابردوو سێ کۆکتێلی شامپانیایی بەر لەنانی شێوان خواردۆتەوە.»

– «لە بلیاردکردن چۆنە؟»

– «گەمەی زۆر جوانە. لەمنی بردۆتەوە. کە پێم گوت لێرەی زۆر کەیفخۆش بوو.





کەس نییە بلیاردی لەگەڵدا بکا.»

کۆنت گریفی تەمەنی نۆهەت و چوار ساڵ بوو. هاوسەردەمی (میترنیخ) بوو پیاوێکی پیری سەر سپی بوو، خاوەن سمێڵێکی ڕێک و ڕەوشتێکی بەرزبوو، لە دەستەی دیبلۆماسی ئیتالیا و نەمسادا خزمەتی کردبوو. ئاهەنگەکانی ساڵڕۆژی لەدایکبوونی گەورەترین ڕووداوی کۆمەڵایەتی (میلانۆ) بوون.

ئومێدی ئەوەی لێ دەکرا سەد ساڵ بژی. وا بەلێهاتوویی و زانایانە بلیاردی یاری دەکرد کە بەتەواوی پێچەوانەی تەمەنی خۆی بوو. بەرلەوەی کەژ بەسەر بچێ، کاتێ لە (ستریزا) بووم، جاری پێشوو ئەوم بینی لەکاتی بلیاردکردن شامپانیامان خواردەوە. بەنەریتێکی چاکم زانی، لەسەد خاڵ پازدە خاڵ قانی دامێ سەرەڕای ئەوەش یارییەکەی بردەوە.

– «بۆچی پێت نەگوتم ئەو لێرەیە؟»

– «لەبیرم چوو.»

– «کێی تر لێرەیە؟»

– «کەسی وا لێرە نییە. تۆ بیناسی، هەمووی شەش کەس لێرەن.»

– «ئێستا چی دەکەی؟»

– «هیچ ناکەم.»

– «با بچین بۆ ڕاوەماسی.»

– «تەنیا یەک سەعات ماوەم هەیە.»

– «هەر باشە دەبا بچین. قولابی ماسی بێنە.»

مەیفرۆشەکە چاکەتێکی لەبەرکرد و، چووینە دەرەوە، دابەزینە خوارەوە بەلەممان پەیدا کرد، من سەوڵم لێدا. مەیفرۆشەکەش لەسەر بەشی دواوەی دانیشت. داو و قولابەکە و شتێکی قورسی فڕێ دایە ناو ئاوەوە. قولابەکە تایبەت بوو بەماسی کەشینە. لەگەڵ لێواری دەریاچەکە سەوڵمان لێدا. مەیفرۆشەکە داوەکەی بەدەستەوە گرتبوو. ناوبەناویش هەڵی دەتەکاند. (ستریزا) لەلای دەریاچەکەوە وەکو شوێنێکی چۆلکراو دەهاتە بەرچاو، چەند ڕیزە داری ڕووت بووەوە، هەندێ ئوتێلی گەورە و ڤێلای داخراوی تیابوو. بەرەو (ئیزۆلابیلا) سەوڵم لێدا. لە دیوارەکانی نزیک بووینەوە. قوڵایی ئاوەکە لەوێ زیاتر بوو. لەناو ئاوە سافەکەوە دیوارێکی بەردی داهاتووی بەرزبووەوە دیاربوو. پاشان بەرەو سەرەوە. بەرەو دوورگەی ڕاوچییەکان چووین... ڕۆژ لەژێر هەورەوە بوو، ئاویش تاریک و مەنگ و سارد بوو. لەگەڵ ئەوەی هیچ ماسییەکمان نەگرت، چەند بازنەیەکمان لەناو ئاوەکەدا بینی لەگەڵ بەرزبوونەوەی ماسییەکان بۆ سەر ئاو پەیدا دەبوون. بۆ دوورگەی ڕاوچییان، بۆ ئەو شوێنەی بەلەمەکانی تیا ڕاگیرابوو سەوڵم لێدا. ڕاوچییەکان خەریکی خستنەوەی تۆڕەکانیان بوون.

– «بچین شتێ بخۆینەوە؟»

– «با بچین.»

بەلەمەکەم هێنایە شۆستە بەردینەکەی لەنگەرگرتن، مەیفرۆشیش داوە ماسییەکەی دەرهێنا و هەڵیکردەوە و لەناو بەلەمەکەی دانا و قوڵابەی چەشەکەشی لە لێواری بەلەمەکە گیرکرد. پازم دایە دەرەوە. لە بەلەمەکەم بەستەوە، ڕوومان لە چایخانەیەکی بچووک کرد، لەسەر مێزێکی دارینی ڕووت دانیشتین. داوای (ڤێرمۆث)مان کرد.

– «لەسەوڵ لێدان ماندوو بووی؟»

– «نەخێر.»

گوتی: «من لەگەڕانەوە سەوڵ لێ دەدەم.»

– «ئاخر، من حەز لەسەوڵ لێدان دەکەم.»

– «بەڵام لەوانەیە گەر تۆ داوە ماسییەکە بگری. بەختمان چاکتر بێ.»

– «باشە.»

– «پێم بڵێ باری شەڕ چۆنە؟»

– «خراپە.»

– «ناچار نیم بۆ شەڕ بچم. زۆر پیرم، وەکو کۆنت گریفی.»

– «لەوانەیە لەو زووانە ناچارت بکەن بەشداری بکەی.»

– «ساڵی ئایندە لەوانەیە ئاوزەکانم بانگ بکرێن. بەڵام ناچم.»

– «گەر نەچی، چی دەکەی؟»

– «وڵات بەجێ دێڵم، دەچمەوە دەرەوە. ناچمە شەڕ. جارێک چووم، بۆ شەڕ، لە شەڕی (حەبەشە)دا بەشداریم کردووە. ناچم. تۆ بۆچی چووی؟»

– «نازانم، لەبێ عەقڵی خۆم.»

– «پێکێکی تر (ڤارمۆث) دەخۆیتەوە؟»

– «بەڵێ.»

لە گەڕانەوە مەیفرۆشەکە سەوڵی لێدا. لە شوێنێکی بەرزی دەریاچەکەوە لە پشت (ستریزا) هەوڵی ڕاومان دا، پاشان لە شوێنێکی نزمتر، زۆر لە لێوارەکەی دوور نەبوو. من داوەکەم گرتبوو، لەوکاتەی سەیری ئاوی نۆڤێمبەری تاریک و قەراغە چۆل و هۆڵەکەم کرد هەستم بەنەرمە جوولانێکی قولابەکە کرد. مەیفرۆشەکە سەوڵی گەورەی لێدا، بەلەمەکەی بەرەو پێش برد. لەگەڵ هەر تەکانێ داوەکە گرژ بوو بۆ دواوە گەڕایەوە. داوەکەم هەڵکێشا، هەستم بەقورسایی ماسییەکی زیندوو کرد، داوەکە جارێکی تر گرژ بووەوە. ماسییەکە ڕزگاری بوو.

– «ماسییەکی گەورە دیاربوو؟!»





– «زۆر گەورە.»

جارێکیان بەتەنیا بووم ڕاوم دەکرد. داوەکەم بەددانم گرتبوو، ماسی کەشینەیەک دەمی لە قولابەکە گیرکرد، ئەوەندەی نەمابوو ددانەکانم دەرکێشێت.

گوتم: «باشترین ڕێگە ئەوەیە داوەکە لەلاقتەوە بێ ئەوکات بەچاکی هەستی پێ دەکەی و ددانەکانیشت لەدەست ناچێ.»

دەستی خۆم خستە ئاوەکەوە، ئاوەکە زۆر سارد و تەزی بوو. کەوتینە بەرامبەر ئوتێلەکە.

مەیفرۆشەکە گوتی: «دەبێت بگەڕێمەوە ئوتێل. لە سەعات یازدە دەبێ لەوێ بم.»

– «زۆر چاکە.»

داوەکەم لە ئاوەکە دەرهێنا و لە دارێکی هەردوو سەر چاڵ هەڵکردەوە. مەیفرۆشەکە بەلەمەکەی لە خلیسکاییەکی بچووکەکەی دیوار بەردینەوە ڕاگرت و بەزنجیرێک بەستییەوە و کلیلی دا. گوتی: «هەر کاتێ پێویستت پێی بوو، کلیلەکەی لە خزمەتت دایە.»

– «سوپاس»

بۆ ئوتێلەکە کشاین، لەوێوە بۆ مەیخانەکە. بەو بەیانییە دڵم هیچی تری نەدەبرد. بۆ ژوورەکەمان سەرکەوتم. خزمەتکارەکە بەر لەمن بەماوەیەکی زۆر کورت ژوورەکەی ڕێک خستبۆوە. کاترین تا ئەو دەم نەگەڕابۆوەوە. لەسەر چوارپایەکە لێ درێژ بووم، هەوڵم دا خۆم تووشی بیرکردنەوە نەکەم. کاتێ کاترین گەڕایەوە جارێکی تر هەستم بەحەسانەوە کرد. پێی گوتم (فێرگسۆن) لە خوارەوەیە هاتووە فراوین لەگەڵ ئێمە بخوا.

گوتی: «دەزانم، لەبەر دڵت گران نییە.»

گوتم: «نەخێر.»

– «چیتە! ئازیزم؟»

– «نازانم.»

– «دەزانم هیچت لا نییە، خۆتی پێوە خەریک بکەی. هەموو ئەوەی هەبێت هەر منم. منیش دەچمە ئەملاو ئیملا.»

– «ئەوە ڕاستە.»

– «ببوورە، ئازیزم، دەزانم شتێکی زۆر ناخۆشە مرۆڤ لە پڕ هەست بکات هیچ نییە.»

– «بەوە لە ژیان ڕاهاتووم کە پڕ بێ لە هەموو شتێ. ئەگەر ئێستا تۆم لەگەڵ نەبێ، هیچ شتێ لەو دونیایە شک نابەم.»

– «بەڵام من هەردەم لەگەڵت دەمێنیم. تەنیا بۆ ماوەی دوو سەعاتێ لێت

دوورکەوتوومەتەوە. لەو ماوەیە هیچ نەبووە خۆتی پێوە خەریک بکەی؟»

– «لەگەڵ کابرای مەیفرۆش چوومە ڕاوەماسی.»

– «پیاسەیەکی خۆش نەبوو؟»

– «بەڵێ خۆش بوو.»

– «کاتێ لەبەرەی جەنگ بووم وام دەکرد بەڵام لەوێ زۆر شت هەبوو خۆمم پێوە خەریک دەکرد.»

– «ئۆتیلۆ، بێ کار و پیشەیە.»

– «ئۆتیلۆ قولەڕەش بوو. لەگەڵ ئەوەش من دڵپیسی لێ ناکەم. من تەنیا کەوتوومەتە داوی خۆشەویستی تۆوە هەر ئەوەندە و هیچی تر لە گۆڕێدا نییە.»

– دەتوانی ببی بەکوڕێکی باش و ڕەفتارت لەگەڵ فێرگسۆن جوان بکەی؟»

– «هەردەم لەگەڵی باشم، ئەگەر ئەو نفرینم لێ نەکات.»

– «لەگەڵی باش بە. بیر بکەوە. بزانە ئێمە لە چ ناز و نیعمەتێکین. کەچی ئەو لە هەموو شتێ بێ بەشە.»

– «من لەو باوەڕە دانیم، کە ئەویش ئەو ناز و نیعمەتەی ئێمە بخوازێ.»

– «تۆ هەرچەندە کوڕێکی زیرەکی بەڵام زۆرزان نیت.»

– «لەگەڵی باش دەبم.»

– «دەمزانی باش دەبی، تۆ زۆر خوێن شیرینی.»

– «خۆ پاش نانخواردن نامێنێتەوە؟»

– «نەخێر، خۆی لێ ڕزگار دەکەم.»

– «پاشان دەگەڕێینەوە ئێرە.»

– «هەڵبەت، وا دەزانێ من دەمەوێ بەچی بکەم؟»

دابەزینە خوارەوە تا لەگەڵ فێرگسۆن فراوین بخۆین. مەزنی ژووری نانخواردن و ئوتێلەکە کارێکی زۆری تێکردبوو. جەمە نانێکی چاکمان لەگەڵ دوو بوتڵ کاپری سپی خوارد. کۆنت گریفی هاتە ژووری نانخواردن. خۆی بۆ دانەواندینەوە کچە براکەی لەگەڵ بوو کە تاڕادەیەکی زۆر بەداپیرەم دەچوو. سەربردەی کۆنتم بۆ فێرگسۆن و کاترین گێڕایەوە. سەربردەکە کاری لە فێرگسۆن کرد. ئوتێلەکە ئوتێلێکی زۆر گەورە و مەزن و چۆڵ بوو، بەڵام خواردنەکەی نایاب بوو، مەیەکەشی بەلەزەت بوو. ئێمەی هێنایە جۆش. کاترین نەیویست سەری خۆی گەرمتر بکا. زۆر بەختیار بوو. فێرگسۆن کەمێ کەیفخۆش بوو. من خۆم هەستم بە سەرگەرمییەکی تەواو کردبوو. پاش نانخواردن فێرگسۆن گەڕایەوە ئوتێلەکەی.

گوتی: «دەچم پاش نانخواردن سەرخەوێ دەشکێنم.»





پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ یەکێ لە دەرگای دا.

– «کێیە؟»

– «کۆنت گریفی، دەیەوێ بزانێ داخوا بلیاردی لەگەڵ دەکەی؟»

سەیری سەعاتەکەمم کرد، لەدەستم کردبۆوە و لەژێر بالیفەکەوەم دانابوو.

کاترین گوتی: «وا پێویست دەکا بچی ئازیزم؟»

– «وابزانم وا چاکە بچم.»

سەعات چوار و چارەگ بوو، بەدەنگێکی بەرز گوتم:

– «بەکۆنت بڵێ بۆ سەعات پێنج لە هۆڵی بلیارد دەبم.»

سەعات چوار و چل و پێنج خولەک کاترینم ماچ کرد. خواحافیزیم لێ کرد چوومە ژووری سەر شۆرک تاجلەکانم لەبەر بکەم، کە قەرەوێتەکەم دەبەست لە ئاوێنەوە سەیری خۆمم کرد، خۆم بەجلی مەدەنی زۆر نامۆ هاتە بەرچاو. واهاتە بیرم هەندێ کراس و گۆرەوی بکڕم. کاترین پرسی: «زۆر دەمێنێیتەوە؟ ئەو شانەیەم نادەیێ؟»

کاترین لەسەر چوارپایەکەوە زۆر جوان و دڵگیر هاتە بەرچاوم. تەماشام کرد پرچی خۆی شانە دەکرد. سەری خۆی شۆڕکردبۆوە تا پرچی هەمووی بەلایێ دابکەوێت. دەرەوە تاریک ببوو، ڕووناکی ئەو گڵۆپەی کە لەسەر سەرییەوە بوو لەسەر پرچ و شان و ملی دەبریسکایەوە. چوومە لای ماچم کرد، لەو دەستەی شانەکەی بەدەستەوە بوو گرتم. سەری خۆی دانایە سەر بالیفەکە. شان و ملیم ماچ کرد. وا هەستم کرد لەبەر خۆشەویستیم خەریکە بۆی لە هۆش خۆم دەچم.

– «نامەوێ بڕۆم.»

– «منیش نامەوێ بڕۆی.»

– «کەوابوو ناڕۆم.»

– «بەڵێ، بڕۆ، تاوێ دوور دەکەویتەوە، دوایی دەگەڕێیتەوە.»

– «نانی شێوان، لێرە، لە ژوورەوە، دەخۆین»

– «زوو بڕۆ، زوو وەرەوە.»

کۆنت گریفی لە ژووری بلیارد بوو. خەریکی مەشق بوو، لەژێر تیشکی ئەو ڕووناکییەی دەکەوتە سەرمێزی بلیاردەوە، کابرا زۆر ناسک دەهاتە بەرچاو. لەسەر مێزێکی قومارەوە. کە کەمێ لە ڕووناکییەکەوە دووربوو، دوسکەیەکی زیوینی بەفر لەگەڵ مل و تەپەدۆری سەری دوو بوتڵی شامپانیا دەبینران.

کۆنت گریفی یەکسەر بەپیرمەوە هات. کاتێ بەرەو مێزەکە چووم دەستی بۆ درێژ کردم. گوتی:

– «زۆر شادمانم بەهاتنت، لە لوتفی خۆتە هاتووی یاریم لەگەڵ بکەی.»

– «لە لوتفی خۆتە داوات لێم کردووە.»

– «ئایا تەندروستیت زۆر چاکە؟ پێیان گوتم لە ئەزیترۆ بریندار بووی. هیوادارم بەتەواوی چاک بووبیتەوە.»

– «زۆر باشم. ئەی تۆش باشی.»

– «ئۆه، من هەردەم باشم، بەڵام پیربووم، نیشانەی پیربوونم لێ بەدیار کەوتووە.»

– «باوەڕ ناکەم.»

– «باشە، دەتەوێ نموونەیەکت بۆ بێنمەوە؟ بۆ من ئاسانترە بەئیتاڵی قسە بکەم. من یاسایەکی وام بۆ خۆم داناوە، بەڵام کاتێ هەست دەکەم ماندوومە بۆ من گەلێ ئاسانترە. بەئیتاڵی قسە بکەم. ئیتر بەو جۆرە دەزانم کە خەریکە بەرەو جیهانی پیری هەنگاو دەنێم.»

– «خۆ دەتوانین بەئیتاڵی قسە بکەین. منیش تۆزێ شەکەتم.»

– «ئۆه، بەڵام کەماندوو دەبی بۆ تۆ وا ئاسانترە بەئینگلیزی قسە بکەی؟»

– «مەبەستت ئینگلیزی ئەمریکییە؟»

– «بەڵێ، ئەمریکی. تکایە بەئەمریکی قسە بکە. زمانێکی خۆشە.»

– «بەدەگمەن چاوم بەئەمریکی دەکەوێ.»

– «شەیدایانی. پیاو شەیدای بینینی هاوولاتیانی خۆیەتی، بەتایبەتی ئافرەتی ولاتی خۆی. خۆم ئەوە دەزانم. یاری بکەین یاخود تۆش ماندووی؟.»

– ماندوو نیم گاڵتەم کرد. چەند خاڵ قانم دەدەیتێ؟»

– «بەم دواییانە یاریت زۆر کردووە؟»

– «قەت نەمکردووە.»

– «تۆ چاک یاری دەکەی. دەخاڵ لەسەد خاڵ.»

– «تۆ پێمدا هەڵدەڵێیت.»

– «با پازدە بێ.»

– «باشە، بەڵام، هەر لێم دەبەیتەوە.»

– «حەز دەکەی لەسەر شت بێ؟ تۆ هەردەم حەز دەکەی لەسەر شت یاری بکەی.»

– «وا بزانم لە سەر شت بێ باشترە.»

– «زۆر چاکە، هەژدە خاڵ قانت بێ. هەر خاڵێ لەسەر ڕەنگێ.»

یارییەکی جوانی کرد. سەرەڕای ئەو خاڵانەی قانی پێدابووم پەنجا خاڵ، بەچوار خاڵ لە پێش ئەو بووم. کۆنت گریفی دەستی بەدوگمەی زەنگی دیوارەوە نا تا مەیفرۆشەکە بانگ بکا.





بە مەیفرۆشەکەی گوت: «زەحمەت نەبێ بوتڵێ بکەوە.» پاشان ڕووی لەمن کرد و گوتی: «کەمێ وریاکەرەوە وەرگرین.» مەیەکە زۆر سارد و ناشیرین و نایاب بوو.

– «خۆ بەلاتەوە سەغڵەت نابێ گەر بەئیتاڵی قسە بکەیت؟ ئەمە نیشانەی بێ دەسەڵاتیمە.»

لە یاری بەردەوام بووین، لە پشووی نێوان لێدانەکاندا، مەیمان فڕ دەکرد. بەئیتاڵی قسەمان دەکرد. بەڵام کەم قسەمان دەکرد. مەیلی خۆمان دابووە گەمەکە، کۆنت گریفی سەد خاڵی تەواو کرد. منیش بەخاڵە قانەکانەوە گەیاندمە نۆهەت و چوار خاڵ. زەردەخەنەیەکی گرت و دەستی لەسەر شانم دانا، گوتی: «ئێستا بوتڵەکەی تریش دەخۆینەوە، تۆش سەرگوزشتەی شەڕم بۆ بگێڕەوە.»

چاوەڕێی کردم تا دانیشتم. خۆشی دانیشت. گوتم: «لەبارەی هەر شتێکی تر بێ نابێ؟!»

– «ناتەوێ دەربارەی شەڕ قسە بکەی؟ باشە بەم دواییە چیت خوێندۆتەوە؟»

– «هیچ. زۆر تەوەزەل بووم.»

– «نەخێر، بەڵام تۆ دەبێ شت بخوێنیتەوە.»

– «چ شتی وا لە ڕۆژانی شەڕ نووسراوە؟»

– «کتێبی (لی خۆ)[١] هی نووسەری فەرەنسی (باربۆس) و کتێبی (مستەر بریتلینگ) لە کلاوڕۆژنەی ئەوەوە دەبینیت.»

– «نەخێر ئەو هیچ نابینێ.»

– «چی؟»

– «ئەو لەنێو بەینی ئەوەوە هیچ نابینی. ئەو کتێبانە لە نەخۆشخانە هەبوون.»

– «کەوابێ ئەمانەت خوێندووتەوە.»

– «بەڵێ، بەڵام شتێکی وا بەکەلکیان تیا نییە.»

– «لەو باوەڕەدام کە کتێبی (مستەر بریتلینگ) لێکۆڵینەوەیەکی چاکی گیانی چینی ناوەڕاستی ئینگلیزییە.»

– «من هیچ دەربارەی گیان نازانم.»

– «ئای قوڕبەسەر، ئێمە هیچێکیان هیچ دەربارەی گیان نازانین، تۆ بڕواداری؟»

– «تەنیا بەشەو.»

کۆنت گریفی زەردەخەنەیەکی هاتێ و بەپەنجەکانی گلاسەکەی سووڕاند.

– «لەو بڕوایەدا بووم، کە هەرچەند بەساڵا بچم بڕوادارتر ببم. بەڵام ئەوە نەهاتە دی ئەمەش جێگەی داخە.»

(١) لی خۆ: دۆزەخ: کتێبی هێزی باربۆسە.

پرسیم: «حەز دەکەی پاش مردن بژی؟»

هەر لەگەڵ درکاندنی وشەی مردن هەستم بەبێ عەقڵی و پەشیمانی کرد، بەڵام گوێی بەو قسە نەدا.

گوتی: «ئەمە دەوەستێتە سەر ژیان. ئەم ژیانە زۆر خۆشە حەز دەکەم هەتا هەتایە بژیم.» بزەیەکی هاتێ «نزیکەی ئەو هیوایەشم بەدەست هێناوە.»

لەسەر دوو کورسی چەرمین دانیشتبووین. شامپانیاکە لەناو دۆڵکەی بەفر و، پەرداخەکانمان لەسەر مێزەکە، لە نێوانمان بوون.

– «گەر بگەیتە ئەو تەمەنەی من گەیشتوومەتێ شتی زۆر سەیر دەبینی.»

– «هەرگیز بەپیران ناچی.»

– « لەشەکەم پیر بووە، هەندێ جار لەوە دەترسام کە پەنجەیەکم بشکێنم. هەروەکو چۆن قالبی تەباشیر دەشکێ. گیانم پیرترە و نەژیرترە لە جاران.»

– «تۆ ژیری.»

– «نەخێر، ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە، ژیرایەتی پیران. تەمەن ژیریان ناکا، بەڵکو تەمەن وایان لێ دەکا بەهودە بن.»

– «لەوانەیە ئەمەش ژیری بێ.»

– «ئەمە ژیری سەرنج ڕانەکێشە. چ شتێ لای تۆ لەهەموو شتێ بەنرخترە؟»

– «ئەو کەسەی خۆشم دەوێ.»

– «منیش وەکو تۆ. ئەمە ژیری نییە. ژیانت لا بەنرخە؟»

– «بەڵێ»

– «منیش هەروەکو تۆ. لەم دونیایە ئەوەندەم هەیە. بۆیەش ئاهەنگی لەدایکبوونی بۆ ساز دەکەم.»

پێکەنی و بەردەوام بوو، گوتی: «خۆ لەوانەیە تۆ لە من ژیرتر بی. تۆ ئاهەنگی لەدایکبوونت ساز ناکەی.»

سەر و فرێکمان خواردەوە.

لێم پرسی: «بەڕاست تۆ چۆن لەم شەڕە دەگەی؟»

– «بێ عەقڵییە.»

– «کێ دەباتەوە.»

– «ئیتاڵیا»

– «لەبەرچیی؟»

– «نەتەوەیەکی خورت و گەنجن.»





– «ئایا نەتەوە خورتەکان هەردەم لەشەڕ سەردەکەون؟»

– «وا هەڵکەوتوون کە بۆ ماوەیەکی باش سەرکەتوو بن.»

– «پاشان چ ڕوو دەدا؟»

– «دەبنە نەتەوەیەکی پیری بەساڵاچوو.»

– «لاوۆ، ئەمە ژیری نییە. ئەمە گاڵتەجاڕییە.»

– «بەلای منەوە ژیرییە.»

– «نەک بەتایبەتی. دەتوانم نموونەی بەڵگەداری پێچەوانەت بۆ بێنمەوە. بەڵام ئەمە خراپ نییە. ئەرێ شامپانیاکانمان تەواو کردووە؟»

– «کەمێ ماوە.»

– «هەندێکی تر بخۆینەوە؟ پاش ئەوە دەبێ جلەکانم لەبەر بکەم.»

– «وا چاکە چی تر نەخۆینەوە.»

– «دڵنیایت کە چیتر نەخۆیتەوە؟»

– «بەڵێ.»

هەستایە سەرپێ.

– «هیوادارم کە بەخت یارت بێ و بەختەوەر بی، تەندروستیت لەوپەڕی باشی دابێ.»

– «سوپاست دەکەم، هیوادارم هەتا هەتایە بژین.»

– «سوپاست دەکەم. من وام، گەر بوویتە پیاوێکی بڕوادار کە مردم نوێژم بۆ بکە. داوام لە زۆر لە هاوڕێیانم کردووە، کە مردم نوێژم بۆ بکەن. من وام لە خۆ ڕادەبینی کە ببم بەبڕواداریکی چاک. بەڵام نەهاتە دی.»

وا تێبگەم زەردەخەنەیەکی غەمباری گرت. بەڵام دڵنیا نەبووم. ئەو زۆر پیر بوو دەموچاوی لۆچدار بوو. کاتێ بزەی هاتێ لۆچی زۆری لێ پەیدا بوو، پێ بەپێ هەمووی بزر بووەوە.

گوتم: «ڕەنگە ببمە مرۆڤێکی بڕوادار. هەر چۆنێ بێ نوێژت بۆ دەکەم.»

– «زۆر لەخۆم ڕادەدیت ببم بەبڕوادار. ماڵەوەمان هەموویان بەبڕوایەکی تەواوەوە مردن. بەڵام ئەوە هەر چۆنێ بێ، بۆ من نەهاتە دی.»

– «هێشتا زۆر زووە، دونیا بەبەریەوە ماوە.»

– «لەوانەیە زۆر درەنگ بێ. ڕەنگە هەستی وام نەمابێ و دوور لە ئاینەوە ژیابم.»

– «تەنیا لەشەودا هەستی ئاینم هەیە.»

– «کەوابێ تۆ لە دوای خۆشەویستی دای. ئەمە لەبیر نەکەی خۆشەویستی هەستێکی ئاینییە.»

- «تۆ بڕوات بەوە هەیە؟»
- «هەڵبەت.»

هەنگاوێکی بەرەو مێزەکە نا. گوتی: «لە لوتفی خۆت بوو یاریت لەگەڵ کردم.»

- «وەختێکی خۆشمان بەسەربرد.»
- «پێکەوە بۆ سەرەوە دەچین.»

## 36

ئەوێ شەوێ تۆف و ڕەشەبا بوو، لەگەڵ دەنگی ترپەی بارانی سەرجامی پەنجەرە بەخەبەر هاتم. باران لە پەنجەرەیەکی کراوەدا دەهاتە ژوورەوە. یەکێ لە دەرگای دا. منیش تا (کاترین) بێزار نەکەم، زۆر بەنەرمی بۆ لای دەرگا چووم و دەرگاکەم کردەوە. کابرای مەیفرۆش لەبەر دەرگا ڕاوەستابوو، پاڵتۆی لەبەرکردبوو، شەپقە تەڕبووەکەشی بەدەستەوە گرتبوو.

- « ڕێگە هەیە قسەیەکت لەگەڵ بکەم، تێنیتا؟»
- «مەسەلە چییە؟»
- «مەسەلەیەکی زۆر ترسناکە.»

تەماشای دەوروبەرمم کرد. ژوورەوە تاریک بوو بینیم ئاو لە پەنجەرەکراوەکەدا هاتبووە ژوورەوە.

گوتم: «فەرموو، وەرە ژوورەوە.»

قۆڵیم گرت و بردمە سەرشۆرک، دەرگامان پێوەدا، گلۆپی سەرشۆرکم داگیرساند، لەسەر دیواری بانیۆ دانیشتم.

- «چ ڕووی داوە (ئیمیلۆ)؟ لەبارێکی ترسناک دای؟»
- «نەخێر، تۆ لەبارێکی ترسناک دای، تێنیتا!»
- «چی؟!!»
- «بەیانی دەتگرن.»
- «بەڵێ؟!»
- «هاتووم پێتی ڕابگەیێنم لە دەرەوە، لەشار، لە چایخانەیێ گوێم لێ بوو باسیان دەکردی.»
- «تێگەیشتم.»

لەوێ ڕاوەستا، پاڵتۆکەی تەڕ بوو. شەپقە تەڕبووەکەشی بەدەستەوە گرتبوو. هیچی تری نەگوت.





- «بۆچی دەمگرن؟»
- «لەبەر چەند شتێ پەیوەندی بەشەڕەوەیە.»
- «دەزانی ئەو شتە چییە؟»
- «نەخێر، هەر ئەوەندە دەزانم، دەزانن تۆ پێشتر بەجلی سەربازی لێرە بوویت. کەچی ئێستا بەجلوبەرگی مەدەنی، پاش ئەم کشانەوەیە، هەموو کەسێ دەگرن.»

چرکەیێ بیرم کردەوە.

- «چ وەختێ دێن بۆ گرتنم؟»
- «سەر لە سبیانێ. کاتەکەی نازانم.»
- «چی بەباش دەزانی؟»

شەپقەکەی لەسەر دەستشۆرکەکە دانا. شەپقەکە زۆر تەڕبوو. دڵۆپ دڵۆپ ئاوی لێ دەچۆڕایەوە سەر زەوی.

گوتی: «ئەگەر لە خۆت ناترسی و دەزانی گرتنەکەت لەسەر هیچ نییە، گیران هیچ گرینگ نییە. بەڵام هەموو ئان و زەمانێ گرتن ناخۆشە، بەتایبەتی لەو سەردەمە.»

- «نامەوێ بگیرێم.»
- «کەواتە بڕۆ سویسرا.»
- «چۆن؟»
- «بە بەلەمەکەم.»

گوتم: «بەڵام دەریاچەکە ڕەشەبایە.»

- «تۆف و ڕەشەبایەکە بەسەرچووە، هەرچەندە دەریاچەیەکی تووشە، بەڵام بەسەلامەتی ڕزگارتان دەبێ.»
- «کەی بڕۆین؟»
- «هەر ئێستا، ڕەنگە لەگەڵ سپێدەی بەیانی بێنە گیانت تا بتگرن.»
- «ئەی جانتاکانمان؟»
- «خێرا بیان بەستە. خێزانەکەشت با جلی خۆی لەبەر بکا منیش جانتاکانتان بۆ دەگوازمەوە.»
- «لەکوێ دەبیت؟»
- «هەر لێرە، نامەوێ کەس لە هۆڵەکە بم بینێ.»

دەرگای سەرشۆرکم کردەوە. لەدوای خۆم دامخستەوە چوومە ژووری نوستن. (کاترین) بەخەبەر هاتبوو.

- «چی بووە، ئازیزم؟»

– «هیچ نەبووە (کات). حەزدەکەی خۆت بگۆڕی و هەر ئێستا بە بەلەم بچیتە سویسرا؟»

– «تۆ حەز دەکەی؟»

– «نەخێر، من حەز دەکەم بگەڕێمەوە ناو نوێن.»

– «بەڵام چی قەوماوە؟»

– «مەیفرۆشەکە دەڵێ، بەیانی دێن بم گرن.»

– «بۆ ئەو پیاوە شێتە؟»

– «نەخێر.»

– «کەوابێ، بەپەلە، ئازیزەکەم، خۆت بگۆڕە تاوەکو بڕۆین.»

هەستایەوە، لەلایەکی چوارپایەکە دانیشت، چاوەکانیشی هەر خەوالووبوون.»

– «ئەوە مەیفرۆشەکەیە لە سەرشۆرک؟»

– «بەڵێ.»

– «کەوا بوو، خۆم ناشۆم، ڕووت وەرگێڕە، ئازیزەکەم. هەر ئێستا بەدەقەیێ خۆم دەگۆڕم.»

لەگەڵ بەرزکردنەوەی جلی شەوێ پشتی سپیم بینی، ئینجا تەماشای ئەولام کرد، لەبەر ئەوەی کۆرپەلەی ورگی گەورەتر ببوو، حەزی نەدەکرد تەماشای بکەم. بۆیە ئەو داوایەی لێ کردم. کە خۆم لەبەر دەکرد، گوێم لە شووڕەی باران بوو بەر پەنجەرەکە دەکەوت. شتم ئەوەندە زۆر نەبوو لەناو جانتاکەی دابنێم.

– «لەناو جانتاکەم جێگە ماوە، (کاترین)، ئەگەر پێویستت پێیەتی.»

هەموو شتەکانم لەناو جانتا داناوە. ئازیزەکەم، لەوە واقم وڕماوە ئەم پیاوە بۆچی خۆی لە سەرشۆرک پەستیوە؟»

– «بێدەنگ بە. چاوەڕوانی جانتاکانمانە تا بیبان باتە خوارەوە.»

– «پیاوێکی زۆر چاکە.»

– «برادەرێکی کۆنمە. بەم دواییانە هەندێ تووتنی پایپم بۆ ناردبوو.»

لە پەنجەرەکراوەکەدا سەیری دەرەوەم کرد. دنیا تاریک بوو، نەمتوانی دەریاچەکە بەدی بکەم. دنیا باران و تاریک بوو، بەڵام بایەکەی هێورتر ببۆوە.

کاترین گوتی: «ئامادەم ئازیزم.»

– «زۆر باشە.»

چوومە لای سەرشۆرک گوتم:

– «ئیمیلۆ، جانتاکان ئەوەتا لێرەن.»





کابرا هەردوو جانتاکەی هەڵگرت.

کاترین گوتی: «لەچاکەی خۆتە یارمەتیمان دەدەی.»

– «وا مەڵێ، خانم، زۆر دڵشادم بەوەی کە بەگوێرەی توانای خۆم یارمەتیتان دەدەم. بەگوێرەی توانا کە تووشی هیچ دەردەسەرییەک نەبم. گوێ بگرە (بەمنی گوت) بەپێبلکەی تایبەت بەخزمەتکارەکان ئەوانە دەگەێنمە ناو بەلەمەکە. ئێوەش هەر ئێستا وەرنە دەرەوە. وا خۆتان نیشان بدەن بۆ پیاسە دەچنە دەرەوە.»

کاترین گوتی: «شەوێکی خۆشە بۆ پیاسە.»

– «لەڕاستیدا شەوێکی شوومە.»

کاترین: «ئای بۆ چەترێ.»

بەهۆڵەکە تێپەڕین. بەو پێبلکە فراوانەی کە بەڕایەخێکی ئەستوور داپۆشرابوو چووینە خوارەوە. لە دامێنی پێبلکەکەوە، لە نزیک دەرگاکەوە، دەرگەوانەکە، لە تەنیشت مێزێ دانیشتبوو بەسەرسوڕمانەوە تەماشای دەکردین.

گوتی: «خۆ ناچینە دەرەوە، گەورەم؟»

– «بەڵێ، دەمانەوێ ڕەشەبای کەنار دەریاچەکە ببینین.»

– «چەترت نییە، گەورەم؟»

– «نەخێر، ئەم پاڵتۆیە لە باران دەمپارێزێ.»

بەچاوی گومانەوە سەیری ئێمەی کرد و گوتی:

– «چەترێکت بۆ پەیدا دەکەم، گەورەم.»

ڕۆیشت دوایی بەچەترێکی گەورەوە گەڕایەوە.

گوتی: «ئەمە کەمێ گەورەیە، گەورەم.»

دە لیرییەکی کاغەزیم دایێ.

گوتی: «ئۆه، پیاوێکی باشی زۆر سوپاس.»

دەرگاکەی کردەوە. چووینە دەرەوە. بزەیەکی بۆ کاترین کرد، (کاترین)یش بزەیەکی بۆ کرد.

دەرگەوانەکە گوتی:

– «ئاغا و خانم، زۆر لەبەر ڕەشەبا مەوەستن ئەگینا تەڕتان دەکا.»

– «ئەو دەرگەوانی دووەم بوو، ئینگلیزییەکەشی وەرگێڕانێکی وشە بە وشەیی بوو.

گوتم: «زوو دەگەڕێینەوە.»

بەسەر پیادەڕێیێ لەژێر چەترە گەورەکەوە، بەتاریکی، بەناو باخچە تەڕبووەکان بەرێگاوە بەپیاسە ڕۆیشتین. لەڕێیەکەشەوە بەرەو دەریاچەکەوە کشاین. بایەکە دوور لەکەنارەوە هەڵی دەکرد. بایەکی ساردی تەڕی (نۆڤێمبەری) بوو. زانیم بەفر لە

چیاکاندا دەکەوێ. بەلای بەلەمە بەزنجیر بەستراوەکاندا، لە خلیسکاییەکاندا، بەدرێژایی شۆستەکەوە ڕۆیشتین تا گەیشتینە بەلەمی کابرای مەیفرۆش. ئاوی بەرامبەر بەردەکە تاریک بوو کابرا لە پشت ڕیزەدارەکانەوە پازی دا.

گوتی: «جانتاکان لەناو بەلەمەکەدان.»

گوتم: «دەمەوێ پارەی بەلەمەکەت بدەمێ.»

گوتی: «چەند پارەت پێیە؟»

– «زۆر نییە.»

– «وا باشە، دوایی بۆم بنێری؟»

– «چەند؟»

– «بەئارەزووی خۆت.»

– «پێم بڵێ چەندت بۆ بنێرم؟»

– «ئەگەر ڕزگارتان بوو (٥٠٠) فرەنکم بۆ بنێرە. وابزانم گەر ڕزگارتان ببێ، هیچ کارێکی واتان لێ ناکا.»

– «زۆر چاکە.»

– «ها، ئەو سەندەویچانە بگرە.» گورزەیەکی دایە دەستم.

– «هەر ئەوەندە لە مەیخانەدا هەبوو. ئەمەش بوتڵێ براندی و بوتڵێ شەڕابە.»

لەناو جانتاکەی خۆمم دانا.

– «دەبا پارەی ئەوانەت بدەمێ.»

– «زۆر باشە پەنجا لیرم بدێ.»

پەنجا لیرم دایێ، گوتی:

– «براندییەکی نایابە. گەر خانمەکەشت بخواتەوە لێی مەترسە. وا چاکە ئەو سواری بەلەمەکە بێ.»

بەلەمەکەی گرت. بەلەمەکە لە بەرامبەر دیوارە بەردییەکەوە بەرز و نزم دەبووەوە. منیش یارمەتی (کاترین)م دا تاوەکو سواری بەلەمەکە ببێ. لەدواوە دانیشت و چارۆگەکەی لەخۆی لوول دا.

– «دەزانیت دەچیتە کوێ؟»

– «دەبێ بەرەو ژوورووی دەریاچەکەوە بڕۆین.»

– «دەزانی بەدوورایی چەند؟»

– «لە پشت لوینۆبە.»

– «لە دوایی لوینۆ، کانیرۆ، کانبیۆ، ترانزانۆ، پێت ناچێتە ناو خاکی سویسرا تا





نەگەیتە بریساگۆ دەبێ بە(مۆنتی تامارا) تێپەڕین.»

کاترین پرسی: «سەعات چەندە؟»

گوتم: «سەعات یازدەی تەواوە.»

– «ئەگەر بە بەردەوامی سەوڵ لێ بدەی لە دەوری سەعات حەوتی بەیانی دەگەیە وێندەر.»

– «ئەوەندە دوورە؟!»

– «نزیکەی (٣٥) کیلۆمەترە.»

– «چۆن بەرێکەوین؟ لەژێر ئەو بارانە پێویستیمان بەقیبلەنامەیێ هەیە.»

– «نەخێر، بۆ (ئیزولابیا) سەوڵ لێ بدە، پاشان دەگەیتە بەرەکەی تر (ئیزۆلامایدر). لەگەڵ ئاراستەی با سەوڵ لێ بدە. (با) دەتگەیێنێتە (پالانزا)وە لەوێوە ڕووناکی گڵۆپەکان بەدی دەکەی. تۆش بەرەو قەراغەکە سەوڵ لێ بدە.»

– «لەوانەیە ئاراستەی بایەکە بگۆڕێ؟»

گوتی: «نەخێر، ئەم بایە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەم ئاراستەیە هەڵدەکا. ئەم بایە یەکسەر لە (مایترۆنەوە) هەڵدەکا. ئەو قوتووەش ئاوی بارانی لە بەلەمەکەوە پێ فڕێ دەنە دەرەوە.»

– «باکەمێ پارەی بەلەمەکەت بدەمێ.»

– «دەبا ئەوەش لەگەڵ بەخت و ڕێکەوت بێت، ئەگەر ڕزگارتان بوو، ئەوا ئەو کات چەندی لە توانات دابوو بۆمی ڕەوانە بکە.»

– «زۆر چاکە.»

– باوەڕناکەم. نقووم بین.»

– «ئەمەیان باشە.»

– «هەردەم لەگەڵ بایەکە، بەرەو باکووری دەریاچەکە برۆ.»

– «زۆر باشە.»

پازم دایە ناو بەلەمەکە.

– «پارەی ئوتێلت بەجێهێشتووە.»

– «بەڵێ، لەناو زەرفێکە، لە ژوورەوەیە.»

– «زۆر باشە. بەخت یارت بێ تێنیتا؟»

– «بەخت یارت بێ. زۆر سوپاست دەکەین.»

– «سوپاسم مەکەن. ئەگەر نقوم بوون و خنکان.»

کاترین گوتی: «ئەوە چی دەڵێ؟»

– «دەڵێ بەخت یارتان بێ.»

کاترین گوتی: «بەخت یارت بێ، زۆر سوپاست دەکەین.»

– «ئامادەن؟»

– «بەڵێ.»

مەیفرۆشەکە خۆی چەماندەوە وە پاڵێکی بە بەلەمەکەوە نا بۆ ناو ئاوەکەوە. بەسەوڵەکان ئاوم شەق کرد، پاشان بەدەست خواحافیزیم کرد، کابراش بەهەناسەیەکی ساردەوە خواحافیزی وەرگرتەوە. ڕووناکی ئوتێلەکەم بینی و هەر سەوڵم لێدا. تا لەبەر چاوان ون بووین دەریاکە بەهێواشی سەری دەکرد، بەڵام ئێمە لەگەڵ ئاڕاستەی بایەکە دەڕۆیشتین.

## 37

لە تاریکیدا سەوڵم لێدا و ڕووی خۆم لە (با) دەپاراست، باران وەستابوو، بەڵام ناوبەناو ڕێژنەیەکی لێ دەهات، دونیا زۆر تاریک بوو، بایەکەشی سارد بوو، دەمتوانی (کاترین) لە دواوەی بەلەمەکە ببینم، بەڵام لە تواناما نەبوو ئاوەکە ببینم کە دەمی سەوڵەکانی تیا نقووم بوون. سەوڵەکان درێژبوون، چەرمی پێستەیان پێوە نەبوو تا نەیەڵن دەرخزن. سەوڵم لێدا، بەرزم کرد و، خۆمم لارکردەوە، ئاوم بەدی کرد، سەوڵم نقووم دەکرد و بەرزم دەکردنەوە و زۆر بەئاسانی سەوڵم لێدەدا، بەڵام نەمدەویست سەوڵەکان بەئاسۆیی بەرزکەمەوە، چونکە بایەکە لەگەڵ ئاڕاستەی ئێمە بوو، دەمزانی دەستەکانم پفکەیان لێ دێ. بۆیە ویستم تا دەکرێ و لە توانام دابێ سەوڵ لێدان دواخەم. بەلەمەکەش خۆی سووک بوو، بەئاسانی سەوڵی لێ دەدرا، نەمتوانی هیچ ببینم، لە خوام دەویست هەرچی زووترە بگەینە بەرانبەر (پالانزا).

بەڵام تۆ چەند چاوت بە (پالانزا) کەوت ئێمەش هەر ئەوەندە. (با) لەسەر دەریاچەکەوە هەڵیکردبوو. لە تاریکیدا بەو جێگایانە تێپەڕین کە پەنایان لە (پالانزا) کردبوو، ئەوەی ڕووناکیش بێ نەمان بینی، لە کۆتاییدا هەندێ ڕووناکیمان لەو سەری دەریاچەکەوە لە نزیکی قەراغەکەوە بینی. ئەویش (ئەنترا)بوو. بێنێکی باش ئەوەی ڕووناکی بێ بەرچاومان نەکەوت و نە قەراغیشمان کەوتەوە بەرچاو، بەڵام بەبەردەوامی لە تاریکیدا سەوڵم لێدا، جارناجاریش لەبەر تاریکییەوە، لەو کاتەی شەپۆڵەکان بەلەمەکەیان سەر ئاو دەخست سەوڵەکان نەدەگەیشتنە ئاوەکە، دەریاچەکە یەکجار دژوار بوو، بەڵام لەسەوڵ لێدان بەردەوام بووم، تا لەناکاو بەرامبەر قووچەکێکی بەردین لە قەراغەکە نزیک بووینەوە کە لە تەنیشتمان قیت ببووەوە و شەپۆڵی ئاوی بەردەکەوت، ئاوەکەی بەرەو ئاسمان پەرش دەکردەوە، پاشان دەگەڕایەوە. هەموو تێنی خستە سەر سەوڵی ڕاستە، بەسەوڵی چەپەش ئاوم گل دەدایەوە، جارێکی تر گەڕاینەوە ناو





دەریاچەکە و قووچەکەکە لەبەر چاوان ون بوو، ئێمەش هەر بەرەو سەرەوەی دەریاچەکەوە دەچووین.

بە (کاترین)م گوت:

– «بۆ بەرەکەی تری دەریاچەکە دەڕۆین.»

– «باشە، ئەی نەدەبوو (پالانزا) ببینین؟»

– «دەبێ بەجێمان هێشتبێ.»

– «چۆنی ئازیزم؟»

– «باشم.»

– «با من بەینێک سەوڵ لێ بدەم.»

– «نەخێر، هێشتا ماندوونەبوومە.»

کاترین گوتی: «فێرگسۆنی بەسەزمان، بەیانی دەچێتە ئوتێلەکە دەبینێ لەوێ نەماوین.»

– «ئەوە بەقەدەر ئەو شتە حەجمانم ناکات کە بەیانی دەبێ بەر لە گزنگدان بگەمە بەشە ئاوی سویسرا و پۆلیسەکانی گومرگ بمان بینن.»

– «ئایا هێشتا زۆر ماوە؟»

– «نزیکەی سی کیلۆمەتر لێرە دوورە.»

– «ئەو شەوە کار و پیشەم سەوڵ لێدان بوو، دەستەکانم ئەوەندە ژانیان زۆر ببوو، کە نەمدەتوانی زۆر بەقایمی سەوڵەکان بەدەستمەوە بگرم. چەند جارێ ئەوەندە نەدەما بە بەلەمەکەوە خۆمان لە لێواری دەریاچەکەوە بدەین زۆر لە نزیکی لێوارەکەوە ڕۆیشتم چونکە لەوە دەترسام ڕێگە بزر بکەم و وەختم بەفیڕۆ بڕوا. هەندێ جار ئەوەندە نزیک دەبووینەوە بەڕادەیێ دەمانتوانی ڕیزەدار و ڕێگاکەی سەر قەراغی دەریاچەکە و چیاکانی پشتی ببینین.

باران وەستا. (با) هەوری بەجۆرێ ڕامالّی کە مانگ لەژێر هەورەوە هاتەدەر. ئاوڕێکی دواوەم دایەوە؛ چاوم بەلووتکەی درێژ و تاریکی (گاستاگنۆلا) و شەپۆڵی سەر بەکەفی دەریاچەکە و مانگی سەر چیای بەرزی لووتکەی بەفرین کەوت. جارێکی تر هەور بەری مانگی گرتەوە، چیاکان و دەریاچەکە لەبەر چاوان بزر بوون. بەڵام ئەمجارە لەجاری پێشوو ڕووناکتر بوو توانیمان قەراغی دەریاچەکە بەدی بکەین. زۆر بەچاکی قەراغەکەم بینی. سەوڵم لێدا تا ئەگەر پۆلیسی گومرگ بەدرێژایی ڕێگاکانی (پالانزا)ش هەبن، نەتوانن بەلەمەکە بەدی بکەن. کاتێ مانگ دەرکەوتەوە توانیمان ڤێلایەکی سپی بەدی بکەین کە لەسەر کەنارەکە لەبناری چیاکاندا، ڕێگایەکی سپی لە نێوان ڕیزە دارێ، دیاربوو. بەدرێژایی ئەو کاتە هەر من سەوڵم لێدەدا. دەریاچەکە لێرە فراوانتربوو، لەوبەری کەنارەکە لە بناری چیاییێکەوە ڕووناکی چەند گلۆپێکمان بینی.

بێ شک (لۆنیۆ)یە. دۆڵێکم لەنێوان چیاکانی ئەو بەری کەنارەکەوە بینی، گوتم هەبێ و نەبێ دەبێ (لۆنیۆ)بێ. گەر (لۆنیۆ) بێ مانای وایە ماوەیەکی باشمان بڕیوە. سەوڵەکانم لە ئاو دەرهێنا، لەسەر کورسی بەلەمەکە لەسەر گازی پشتێ لێ ڕاکشام. لەبەر سەوڵ لێدان زۆر زۆر ماندوو ببووم. باسک و شان و پشتم ژانیان دەکرد. دەستیشم ژانی زۆر بوو.

کاترین گوتی: «دەتوانم چەترەکە هەڵبگرم، وەکو چارۆگەی لێ بکەین تا بە(با) بڕوا.»

– «دەتوانی بەلەمەکە باژۆیت؟»

– «لەوانەیە بتوانم.»

– «تۆ ئەم سەوڵە بگرە لە نزیک لایەکی بەلەمەکەوە لەژێر هەنگڵتی دابنێ پێی لێ بخورە منیش چەترەکە هەڵدەگرم.»

چوومە دواوەی بەلەمەکە تێم گەیاند چۆن سەوڵ بگرێ، چەترەکەم لێ وەرگرت، کە کاتی خۆی دەرگەوانی ئوتێلەکە پێی دابووین. لەسەر لمووزی بەلەمەکە دانیشتم. چەترەکەم هەڵدا و قرتەیەکی لێوەهات. لە هەردوولاوە گرتم. قاچیم لێک کردەوە، دەسکەکەیم لە کورسییەکەوە گیرکرد چەترەکە پڕ هەوا بوو. هەستم کرد بەلەمەکە بەرەو پێشەوە دەچێ. کاتێ بەهەموو تێنمەوە لە هەردوولاوە بەقایمی گرتبووم بەلەمەکە بەکاری بایەکەوە تیژ دەڕۆیی.

کاترین گوتی: «زۆر باش دەڕۆین.»

ئەوەی لە توانام دابوو ببینم، تەنیا تێلەکانی چەترەکەبوو. چەترەکە لەبەر تێنی (با) بەرزبووەوە و ڕاپێچی دا، هەستم کرد لەبەر تێنی بایەکەوە خەریکە منیش لەگەڵ خۆی ڕادەپێچێ. بەپێیەکانم ڕکابەریم لەگەڵ پشتی بەلەمەکە کرد تا بیگەڕێنمەوە. پاشان لەناکاو چەترەکە بەرەواژبوو، هەستم کرد تێلێکی چەترەکە بەنێو چەوانم کەوت، هەوڵم دا ئەو تێلە بگرم کە بەکاری (با)وە لوولی خواردبوو، بەڵام فریای نەکەوتم بەتەواوی بەرەواژ بوو، وە خۆمم بەلینگ بڵاوی لە نزیک دەسکی چەترە بەرەواژبووەکە بینی، هەڵم کردبوو تا پڕ (با) ببێ و بیکەمە چارۆگە. دەسکەکەیم لە کورسییەکە کردەوە.

چەترەکەم بەشێوەیەکی کراوەیی لەسەر بەلەمەکە دانا. چوومە لای کاترین تا سەوڵەکانی لێ وەرگرم. کاترین پێدەکەنی و دەستی گرتم و لە پێکەنینی بەردەوام بوو. سەوڵەکەم وەرگرت و گوتم: «چیتە؟»

– «کە چەترەکەت هەڵگرتبوو زۆر سەیر دەهاتیە بەرچاو.»

– «وا بزانم وایە.»

بەدەنگ گیراوی گوتی:

«پێت ناخۆش نەبێ. زۆر سەیر بووی. وا پێدەچوو کە پانتایت بیست پێ بێ. زۆر





بەئارەزوومەندانەوە چەترەکەت لە هەردوولاوە گرتبوو.»

– «من سەوڵ لێدەدەم.»

– «پشووێ بدە، کەمێ مەی بنۆشە. شەوێکی خۆش و مەزنە. زۆرمان بڕیوە.»

– «دەبێ بەلەمەکە لە چاڵایی نێوان شەپۆڵەکان دوور بخەمەوە.»

– «براندییەکەت بۆ دێنم، پاشان پشووێک بدە، ئازیزم.»

سەوڵەکانم بەرزکردنەوە، بەسەوڵەکەوە لەناو دەریاچەکەدا ڕۆیشتین، کاترین جانتاکەی کردەوە و بوتڵە براندییەکەی دایە دەستم منیش بەقەڵەمبڕ سەر قەپاغەکەم لێکردەوە و فڕێکی گەورەم لێدا. بەتام و گەرم بوو، کە خواردمەوە هەموو هەناوی گەرم کردمەوە هەستم بەگەرمی و خۆشی کرد. گوتم:

– «براندییەکی چاکە.»

جارێکی تر مانگ بەبن هەورەکە کەوتەوە. بەڵام توانیم کەنارەکە بەدی بکەم. واپێدەچوو قووچەکێکی تر لەو سەری دەریاچەکەوە بکەوێتە بەراییمان.

– «لەگەڵ گەرمی چۆنی کاترین؟»

– «زۆر باشم، بەڵام کەمێ لەشم ڕەق بووە.»

– «بەدۆلکەکە ئاوەکە فڕێدە دەرەوە، ئەوکاتە دەتوانی قاچت درێژ بکەیتە خوارەوە.»

پاشان سەوڵم لێدا، گوێم لە سیرەی کلیلەی سەوڵ و شەپ و هۆڕی ئاوەکە بوو کە لەژێر کورسییەکەوە دەچووە ناو ئەو قووتووەوە کە ئاوی پێ دەردەدرا.

گوتم: «دەتوانی ئەو قووتووەم بدەیتێ؟ دەمەوێ کەمێ ئاو بخۆمەوە.»

– «زۆر پیسە.»

– «قەیدی ناکا. ئاوێکی تێوەر دەکەم.»

گوێم لە خڕە و شەپەی قووتووەکە بوو، کە کاترین لەسەر لێواری بەلەمەکەوە ئاوی تێوەر کرد. پاشان بەپڕی دایە دەستم. دوای خواردنەوەی براندییەکە زۆر تێنوو بووم. ئاوەکە ئەوەندە ساردبوو. ددانی تەزاندم سەیری کەنارەکەم کرد. لە قووچەکە درێژەکەوە نزیک بووینەوە لە کەنداوەکەی بەرامبەرمان چەند ڕووناکیێ دەبینرا. قووتووەکەم دایەوە دەستی و گوتم: «سوپاس.»

– «عافیەت بێ، هێشتا زۆر ماوە گەر دەتەوێ.»

– «ناتەوێ شتێ بخۆی؟»

– «نەخێر، پاش کەمێکی تر برسیم دەبێ. خواردنەکە بۆ ئەوکات هەڵدەگرین.»

– «زۆر چاکە.»

ئەو شتەی بەقووچەکی تێگەیشتبووین خاکێکی سەر دەریای درێژبوو. لە قەراغەکە دوورکەوتمەوە. تا لێی تێپەڕیم. دەریاچەکە لەو ناوچەیە زۆر تەسک بوو. مانگ لەژێر

هەور دوورکەوتەوە. ئێشکگرانی کەناریش لە توانایاندا دەبوو بەلەمەکەمان بەرەشی ببینن گەر چاودێری دەریایان بکردبایە.

– «کات[١]، چۆنی؟»

– «زۆر باشم. ئەرێ ئێمە لە کوێندەرین؟.»

– «وا بزانم لە هەشت میل زیاترمان نەماوە.»

– «بۆ سەوڵ لێدان ئەو ماوەیە ماوەیەکی زۆرە. خۆشەویستە شیرینەکەم، ئاخۆ لە ماندوێتییان نەمردووی؟»

– «نەخێر، زۆر باشم. تەنیا دەستەکانم ژان دەکەن.»

بۆ سەرەوەی دەریاچەکە بەردەوام بووین. لەلای ڕاستی قەراغەکەوە کەلێنێک لە نێوان چیاکان هەبوو، گوتم هەبێ و نەبێ (کانۆبیۆ)یە، دوور لە کەنارەکەوە مامەوە چونکە لێرە بەدواوە لە ترسی گەیشتنمان بەئێشکگرانی کەنارەوە دەبێ ئاگاداری خۆمان بین. لەوبەری لە پێشمان چیایەکی بەرز هەبوو، کە سەری لووتکەکەی وەکو گۆمەز بوو. زۆر ماندوو ببووم. ئەو ماوەیەی مابووەوە بۆ سەوڵ لێدان زۆر نەبوو. بەڵام کە مرۆڤ حاڵی شڕ بێ ناچارم ئەو چیایە ببڕم. ئێنجا بەلای کەمەوە پێنج میلی تر ببڕم، بەر لەوەی بگەینە بەشە ئاوی سویسری مانگیش خەریک بوو ئاوا بێ، جارێکی تر هەور ئاسمانی داگرتەوە، تاریک داهات. دەم نادەم سەوڵم لێدەدا، پشتیەکم دەدایێ، سەوڵەکانم بەشێوەیێ هەڵگرت تا (با) لە تیغی سەوڵەکان بدا.

کاترین گوتی: «با من کەمێ سەوڵ لێ بدەم.»

– «دەترسم، باش نەبێ بۆت.»

– «قسەی بێ مانا. سەوڵ لێدان بۆ من باشە، لە ڕەقبوون دەمپارێزێ.»

– «لەو باوەڕەم نەتوانی، کات.»

– «قسەی بێ مانا، سەوڵ لێدانی نەرم بۆ ئافرەتی سک پڕ سوود بەخشە.»

– «زۆر باشە، تۆ کەمێ هێواش سەوڵ لێ بدە. با من بچمە دواوە ئێنجا تۆش وەرە پێشەوە و خۆت بەهەر دوولای بەلەمەکەوە بگرە.»

لە دواوەی بەلەمەکە دانیشتم چاکەتەکەم لەبەرا بوو، یەخەکەیم قیت کردبۆوە و تەماشای کاترینم کرد، زۆر بەچاکی سەوڵی لێدەدا. بەڵام درێژی سەوڵەکان (کاترین)یان سەغڵەت کردبوو. جانتاکەم کردەوە. دوو سەندەویچم خوارد، براندیشم خواردەوە. هێنامیەوە سەرەخۆ، بۆیە فرێکی تریش براندیم خواردەوە.

گوتی: «ئێستا چۆنیت؟»

– «زۆر باش.»

(١) کات: کاترین





– «کە ویستت چیتر سەوڵ لێ نەدەی پێم بڵێ.»

– «زۆر چاکە.»

فرێکی تریشم خواردەوە، پاشان دەستی خۆمم لە هەردوو لێواری بەلەمەکە گرت، چوومە پێشەوە.

کاترین: «نەخێر، سەوڵ لێدانم پێ خۆشە.»

– «برۆ دواوە پشوویێکی باشم داوە.»

بۆ ماوەیەکی کەم بەسایەیی سەرگەرمی براندییەوە بەسووک و سانایی و بەردەوامی سەوڵم لێدا. لەدوایی ئەوەندەی نەبرد چاپووکانە سەوڵم لێدایەوە، تامی زەرداوێکی ڕۆن لە ئەنجامی توند سەوڵ لێدان و لەدوای خواردنەوەی براندییەوە لە دەممەوە پەیدا بوو.

گوتم: «دەتوانی هەندێ ئاوم بدەیتێ؟»

کاترین: «جا ئەوە چی تیایە نەتوانم.»

بەرلەوەی گزنگ بدا نمە نمەی باران دەستی پێکرد. (با) لە هەڵکردن وەستا بوو. یان کەوتبووینە پەنای ئەو چیایەی کە کەوانەیەکی لە دەوری دەریاچەکە دروست کردبوو. کاتێ هەستم کرد دنیا خەریکە شەبەق دەدات، سووربووم لەسەوڵ لێدان و هەموو تێنی خۆم دایێ. نەمزانی گەیشتووینەتە کوێ. هەوڵم دا بگەمە بەشە ئاوی هەرێمی سویسرا. لە قەراغی دەریاچەکە نزیک بووینەوە. ڕۆژ نزیکی هەڵاتنی کردبوو، توانیم قەراغە بەردییەکە و دارەکان بەدی بکەم.

کاترین گوتی: «ئەمە چییە؟»

لەسەوڵ لێدان وەستام گوێم بۆ دەنگێک شل کرد. دەنگەکە دەنگی هاژەی ماتۆڕی بەلەمێ بوو. لە قەراغی دەریاچەکەوە نزیک بوومەوە. بەلەمەکەم ڕاگرت، کڕ و بێدەنگ مامەوە. هاژەکە نزیکتر بووەوە. بەلەمێکی ماتۆڕ دارمان، لەبەر باران بینی، کە لە تەنیشتمانەوە بوو.

چوار ئێشکگری کەناری لەدواوەی دانیشتبوون. شەپقەکانیان، کە لە چەشنی (ئەلپینی) بوون، ڕووی گرتبوون. تفەنگەکانیان بەپشتەوە بوو. پێدەچوو بەم بەیانییە زووە خەواڵووبن. توانیم زەردایێ لەسەر کڵاوەکانیان بەدی بکەم و نیشانەی زەردیش بەیەخەیانەوە بوو. هاژەی بەلەمەکەش دوورکەوتەوە و لەبەر باران لە چاوان گوم بوو.

گەڕامەوە ناو دەریاچەکە، چونکە خۆم نەمدەویست ئەوەندە لە (سنوور) نزیک ببمەوە نەبادا ئێشکگران ڕێم لێ بگرن. لەسەوڵ لێدان بەردەوام بووم. قەراغی ئەو بەریم بەدی کرد، بۆ ماوەی سێ چارەگە سەعات لەبەر باران سەوڵم لێدا. گوێمان لە دەنگی ماتۆڕێکی تر بوو، تا ماتۆڕەکە لە دەریاچەکە دوورکەوتەوە، بێدەنگ بووین.

– «وابزانم گەیشتووینەتە سویسرا، کات.»

- «بەڕاستیتە.»
- «هیچ ڕێگەیێ نییە بۆ زانین، مەگەر سەربازی سویسری ببینین.»
- «یا گەلەکەشتی سویسری.»
- «گەلەکەشتی سویسرا گاڵتەی ئێمە نییە. ئەو ماتۆڕەی بینیمان ڕەنگە هی گەلەکەشتی سویسرابێ.»
- «ئەگەر لە سویسرا بین دەبێ چاشتێکی باش بخۆین و ئەستوورک و سەرتوو و مرەبای باشیان هەیە.»

ڕۆژێکی سامالّ بوو و بارانێکی نەرم دەباری. (با) بەسەر دەریاچەکە هەر هەڵی دەکرد و دەمانتوانی چەند شەپۆڵێکی سەربەکەفی سپی ببینین کە بەلامان ڕەت دەبوون و بەرەو سەرووی دەریاچەکەوە دەچووین. لەوە دڵنیابووم کە ئێستا ئێمە گەیشتووینەتە سویسرا. چەند خانوویێ لە پشت ڕیزەداری سەر قەراغەکەوە هەبوو خانووەکانی لەبەرد دروست کرابوون، چەند ڤێلایەک و کلیسەیێ لەسەر تەپۆلکەیەکدا هەڵکەوتبوون. چاوم بڕیبە ئەو ڕێگایەی لەلای قەراغەکەوە بوو، نەبادا ئێشکگرانی کەناربیان لێ بێت. بەلاّم چاوم بەهیچ کەسێ نەکەوت. ڕێگایەکە لە دەریاچەکەوە زۆر نزیک ببۆوە. چاوم بەسەربازێ کەوت لە چایخانەیەکی سەر ڕێگاکە دەهاتە دەرەوە، جلێکی سەوزی مەیلەو بۆری لەبەردا بوو، کڵاوێکی ئاسنی لە چەشنی ئەڵمانییەکانی لەسەر کردبوو. دەموچاوێکی گەش و سمێڵێکی بەقەدەر سەری فلچەی ددانی هەبوو سەیری ئێمەی کرد. بەکاترینم گوت:

- «بەدەست سەلامی لێ بکە.»

سڵاوی لێ کرد، سەربازەکە زەردەخەنەیەکی لە ڕوودامانی گرت. سڵاوی وەرگرتەوە. سەوڵم هێواشتر لێدا، بەبەردەم ئاوی پێش گوندەکە تێپەڕین. گوتم: «دەبێ ئێمە لەناو سنووری سویسرا بین.»

- «دەبێ لەوە خۆمان دڵنیا بکەین. نامانەوێ بمانگێڕنەوە سەر سنووری ئیتاڵیا.»
- «ماوەیەکە سنوورمان بەجێهێشتووە. وابزانم ئەمە شارێکی گومرگییە. سوڕ دەزانم (بریساگۆیە).»
- «گەر وابێ ئەی نابێ پۆلیسی ئیتاڵی لێرە هەبن؟ چونکە هەردەم پۆلیسی هەردوولا لە شارە گومرگییەکاندا دەبن.»
- «نەک لەکاتی شەڕ. باوەڕناکەم، ڕێگەی ئیتاڵییەکان بدەن پێ بخەنە سەر سنوور.»

شارۆچکەیەکی خۆش و دڵارا بوو. ژمارەیێ بەلەمی ماسیگرەکان بەدرێژایی شۆستە ڕاگیرابوون. تۆڕەکانیش لەسەر بەربەستی ئاو هەڵخسترابوون.

بارانێکی نۆڤێمبەری جوانی لێ دەهات، هەرچەندە بارانیش بوو، شارێکی خۆش و





خاوێن دیاربوو.

- «دابەزین چاشتمان بخۆین؟»
- «لە جێی خۆیەتی.»

هەموو تێن و توانام خستە سەر سەوڵی چەپە. پاشان بەلەمەکەم ڕاست کردەوە. هەر هاتمە شۆستەکە و بەلەمەکەم هێنایە تەنیشتی. دوو سەوڵەکەم لەناو ئاودا دەرهێنا. دەستم بەئەڵقەیەکی ئاسنی گرت. پازم دایە سەر بەردێکی تەڕ و کەوتمە سەر خاکی سویسرا. بەلەمەکەم بەستەوە دەستم بۆ کاترین درێژکرد.

- «وەرە، کات. هەستێکی بەجۆش و خرۆشە.»
- «ئەی جانتاکان؟»
- «لەناو بەلەمەکە بەجێیان بهێڵە.»

کاترین پازی دا. وا پێکەوە لە سویسراین.

کاترین گوتی: «وڵاتێکی چەند بەردڵە!»

- «ئەرێ وڵاتێکی مەزن نییە؟»
- «با بچین چاشتمان بخۆین.»
- «توخوا وڵاتێکی مەزن نییە؟ من حەز دەکەم پێم پێی کەوێ.»
- «قاچەکانم تەزیون، ناتوانم بەچاکی هەستی پێ بکەم، بەلاّم وا هەست دەکەم کە وڵاتێکی مەزنە. ئازیزم، تۆ باوەڕ دەکەی کە ئێمە لە سویسرا بین، لەو شوێنە خوێناوییە ڕزگارمان بووبێ؟»
- «بەڵێ، باوەڕ دەکەم، باوەڕ دەکەم. بەلاّم پێشتر بڕوام بەهیچ نەدەکرد.»
- «سەیری ئەو خانووانە بکە. ئەی ئەم گۆڕەپانە خۆش نییە؟ ئا ئەوەتا شوێنێ دەتوانین چاشتمانی تیا بخۆین.»
- «ئەی بارانێکی خۆش نییە؟ هەرگیز ئیتاڵیا بارانی وای بەخۆوە نەدیوە، بارانێکی خۆشە.»
- «ئەوە ئێمەین لێرەین؟ ئازیزم لەو باوەڕەی کە لێرەین؟»

چووینە چایخانەیێ، لەسەر مێزێکی دارینی پاک دانیشتین. شێتانە چاومان بەولاو بەولادا دەگێڕا، ئافرەتێکی مەزنی دەموچاو خاوێنی بەروانکە لەبەر هاتە لامان و لێی پرسین ئارەزوومان لە چییە.

کاترین گوتی: «ئەستوورک و مرەبا و قاوە.»

- «بەداخەوە لە سەردەمی شەڕدا ئەستوورکمان نییە.»
- «کەوابێ نان بێنە.»
- «دەتوانم نانی برژاوتان بۆ ئامادە بکەم.»

– «زۆر چاکە.»

– «من هێلکەی کوڵاوم دەوێ.»

– «چەند هێلکە بۆ گەورەم؟.»

– «سێ.»

– «با چوار بێ ئازیزم.»

– «با چوار بێ.»

ئافرەتەکە ڕۆیشت، کاترینم ماچ کرد. دەستەکانیم توند ڕاگوشی، سەیری یەکترمان دەکرد، چاومان بەچایخانەکەدا دەگێڕا.»

– «ئازیزم، جێگایەکی بەردڵ نییە؟»

گوتم: «زۆر.»

کاترین گوتی: «نەبوونی ئەستوورک بەلامەوە گرینگ نییە، هەرچەندە ئەمشەو هەموو بیر و خولیام لەگەڵ ئەستوورک بووە. بەڵام بەلامەوە گرینگ نییە.»

– «دڵم وا خەبەر دەدا کە هەر ئێستا دەمانگرن.»

– «بیری لێ مەکەوە، با جارێ چاشتەکەمان بخۆین ئەگەر پاش نانخواردن بشمان گرن بەلامانەوە گرینگ نییە. دوایی ئەوان ناتوانن هیچ شتێ لەگەڵ ئێمە بکەن. ئێمە هاووڵاتی ئەمریکی و بەریتانین و خاوەنی ناوبانگێکی چاکین.»

– «تۆ پاسەپۆرتت هەیە، نیتە؟»

– «هەڵبەت، هەمە توخوا با چیتر باسی ئەوە نەکەین، با کەیفخۆش بین.»

گوتم: «لەوە کەیفخۆشتر نابم.»

پشیلەیەکی قەڵەوی خۆڵەمێشی کە کلکی وەکو پەڕاموچە قیت کردبۆوە بەناو چایخانەکەدا دەڕۆیی. بۆ لای مێزەکەمان هات لە نزیک قاچم درێژبوو. هەر کە پێم پێی دەکەوت دەیمڕاند. دەستی خۆمم شۆڕکردەوە و دەستم بەپشتی داهێنا، کاترین زۆر بەبەختیارییەوە پێکەنی و گوتی:

– «ئەوا قاوەکە هات.»

پاش نانی بەیانی ئێمەیان گرت. پیاسەیەکی کورتمان بەناو گوندەکەدا کرد. پاشان بۆ لای شۆستەکە چووین تا جانتاکان بێنین. سەربازێ لەوێ ڕاوەستابوو، کرابووە پاسەوانی بەلەمەکە.

– «ئایا ئەوە بەلەمی ئێوەیە؟»

– «بەڵێ.»

– «لەکوێوە هاتوون؟»

– «لەوبەری دەریاچەکەوە.»





– «کەوابێ دەبێ لەگەڵمان بێن.»

– «ئەی جانتاکان؟»

– «دەتوانن هەڵیان گرن.»

جانتاکانم هەڵگرت، کاترین لە تەکمەوە و سەربازەکەش بەدواوەمان بۆ فەرمانگەی گومرگی کۆن ڕۆیشتین. لە فەرمانگەکەوە ئەفسەرێکی ڕەقەڵە بەجلی سەربازی لێی پرسین: «خەڵکی چ وڵاتێکن؟»

– «ئەمریکا و بەریتانیا.»

– «زەحمەت نەبێ، دەتوانم پاسەپۆرتەکانتان ببینم؟»

هی خۆم داییێ. (کاترین)یش هی خۆی لەناو جانتاکەی دەستی دەرهێنا. بۆ ماوەیەکی زۆر سەری پێداگرتن.

– «بۆچی بە بەلەم هاتوونەتە سویسرا؟»

– «من پیاوێکی وەرزشەوانم. سەوڵ لێدان پەسەندترین وەرزشە لام، هەر کاتێ دەرفەتم بۆ بڕەخسێ بەو کارە هەڵدەستم.»

– «بۆچی هاتوونەتە ئێرە؟»

– «بۆ یارییە زستانییەکان. ئێمە گەڕیدەین. دەمانەوێ بەشداری لەیاری زستانییەکان بکەین.»

– «ئێرە شوێنی یاری زستانی نییە؟»

– «ئەوە دەزانین. دەمانەوێ بچینە ئەو شوێنەی یاری زستانەی لێیە.»

– «ئەی لە ئیتاڵیا چیتان دەکرد؟»

– «من هونەری بیناسازی و ئامۆزاشم هونەری وێنەکێشانی دەخوێند.»

– «بۆچی ئیتاڵیاتان بەجێهێشتووە؟»

– «بۆ ئەوەی یاری زستانە بکەین. خۆ ناشکرێ لەگەڵ بەردەوام بوونی شەڕ هونەری بیناسازی بخوێندرێ.»

ئەفسەرەکە گوتی: «زەحمەت نەبێ لێرە چاوەڕێ بکەن.»

چووە ژوورەوە پاسەپۆرتەکەمانی لەگەڵ خۆی برد.

کاترین گوتی: «تۆ مەزنی. ئازیزم، لەسەر ئەم فێڵەی خۆت بەردەوام بە. دەمانەوێ وەرزشی زستانە بکەین.»

– «چ لەبارەی نیگارکێشان دەزانی؟»

کاترین گوتی: «ڕۆبنز.»[1]

گوتم: «فیلەتەن و قەڵەو بوو.»

کاترین گوتی: «تیتان[٢].»

گوتم: «پرچی تیتانانی بوو. ئەی دەربارەی (مانتینا)[٣]؟»

کاترین گوتی: «پرسیاری گران مەکە. لەگەڵ هەندێش دەیناسم یەکێکی زۆر تووشە.»

گوتم: «زۆر تووشە. دەڵێی کۆمەڵێک کونە بزمارە.»

کاترین گوتی: «دەبینی من دەبمە هاوسەرێکی دڵخۆشکەر، دەتوانم لەگەڵ پیاوانی گومرگ قسە لە هونەر بکەم.»

گوتم: «ئەوا هاتەوە.»

ئەفسەرە ڕەقەڵەکە گەڕایەوە و پاسەپۆرتەکانی بەدەستەوە بوون.

گوتی: «دەبێ بۆ (لوکارتۆ)تان ڕەوانە بکەم. دەتوانن سواری پەیتوونێ ببن. سەربازێکتان تا وێندەر لەگەڵ ڕەوانە دەکەم.»

گوتم: «زۆر چاکە. ئەی چی لە بەلەمەکە بکەین؟»

– «بەلەمەکە دەستی بەسەرداگیراوە. ئەو جانتایانە چیان تیایە؟»

جانتاکانی پشکنی، چارەگێ براندی دەرهێنا.

گوتم: «هەندێکمان لەگەڵ ناخۆیتەوە؟»

هەستایە سەرپێ گوتی:

– «نەخێر، سوپاس، پارەت چەند هەیە؟»

– «دوو هەزار و پێنج سەد لیر.»

لەگەڵ پارە هاتە بار و گوتی: «ئەی ئامۆزاکەت چەندی هەیە؟» کاترین هەزار و دوو سەد وە یا زیاتری هەبوو، ئەفسەرەکە کەیفخۆش بوو هەڵوێستی بەرامبەرمان ئەوەندە لووت بەرزانە نەما.

گوتی: «ئەگەر بۆ وەرزشگای زستانە دەچن، (وێنگن) شوێنی خۆیەتی. باوکم ئوتێلێکی قەشەنگ و گەورەی لەوێ هەیە، دەرگای هەردەم لەسەر پشتە.»

گوتم: «شتی چاکە. دەتوانی ناوەکەیم بدەیێ؟»

– «لەسەر کارتێ بۆتانی دەنووسم.»

زۆر بەڕێزانە کارتەکەی پێدام.

– «ئەم سەربازە دەتانباتە (لۆکارتۆ) پاسەپۆرتەکەتان لای ئەو دەبێ، دەبێ ببوورن، بەڵام وا دەخوازێ پێویستە ئەم ئەرکەمان ئەنجام بدەین. هیوام بەرزە (ڤیزا) یا (پسوولەی نەگیرانتان) دەدەنێ.»

دوو پاسەپۆرتەکەی دایە دەست سەربازەکە، منیش جانتاکانم هەڵگرت بەناو

(٣،٢،١) ناوی هونەرمەندانی وێنەکێشانن.





گوندەکەدا ڕۆیشتین. تا پەیتوونێ پەیدا بکەین.

– «هێی!»

ئەفسەرەکە بانگی سەربازەکەی کرد و بەئەڵمانی قسەی لەگەڵ کرد. سەربازەکە تفەنگەکەی بەکۆڵ خۆی دا و دوو جانتاکەی هەڵگرت.

بەکاترینم گوتی: «شارێکی خۆشە.»

– «شارێکی زۆر کردەییە.»

بەئەفسەرەکەم گوت: «زۆر سوپاس.»

دەستی خۆی هەڵشەقاند و گوتی: «خزمەتتان نییە!»

بەدوای سەربازەکە بەنێو گوندەکەدا ڕۆیشتین. بەپەیتوون. بەرەو (لۆکارتۆ) ئۆغرمان کرد، سەربازەکە لەگەڵ پەیتوونچییەکە دانیشت. لە (لۆکارتۆ) کاتێکی خۆشمان بەسەربرد. پرسیاریان لێ کردین، بەڵام لەگەڵمان زۆر ڕەوشت بەرز بوون. چونکە خاوەن پارە و پاسەپۆرت بووین. لەو باوەڕەدا بووم کە بڕوایان بە وشەیێ لە چیرۆکە هەڵبەستووەکەم نەکردبێ. ئەوەم بەشتێکی بێ عەقڵانە دانا، بەڵام ئەوەش هەروەک لێپرسینەوەی دادگای وابوو، تۆ شتی ماقووڵت پێویست نەبوو، بەڵکو هەندێ شتی تەکنیکیمان پێویست بوو تا ملی ئەو شتانە بگرین.

بەڵام ئێمە پاسەپۆرتمان هەبوو، پارەشمان خەرج دەکرد. بەم شێوەیە (ڤیزای) کاتیان پێ بەخشین. ئەم ڤیزایانە لە هەموو کاتێ دەکرا لێمان بسەننەوە، بۆ هەر شوێنێکیش چووباین دەبوایە بەپۆلیسمان بگوتبایە.

– «ئایا دەتوانین بچینە هەر جێگەیەکی بمانەوێت؟ بەڵێ. دەبێ بمانەوێ بچینە کوێ؟»

– «کات، دەتەوێ بچینە کوێ؟»

– «مۆنترۆکس.»

کاربەدەستێ گوتی: «شوێنێکی زۆر خۆشە. دەزانم دڵتان پێی دەکرێتەوە.»

کاربەدەستەکەی تر گوتی:

– «ئێرەش، (لۆکارتۆ) شوێنێکی سەرنج ڕاکێشە.»

– «حەزمان لە شوێنێکە وەرزشی زستانەی لێ بێ.»

– «مۆنترۆکس هیچ شوێنی وەرزشی زستانەی تیانییە.»

کاربەدەستەکەی تر گوتی:

«ببوورە. من خۆم لە (مۆنترۆکس)ەوە هاتووم، وەرزشی زستانە لە نزیک هێڵی ئاسنی (مۆنترۆکس)، (ئۆبەرلاند)، (بیرنۆس) سازدەکرێ، ڕاست نییە گەر نکۆڵی لەوە بکەین.»

– «نکۆڵی ئەوە ناکەم. هەر ئەوەندەم گوتووە لە (مۆنترۆکس) وەرزشی زستانە نییە.»

کاربەدەستەکەی تر گوتی:

– «گومانم لەو قسەیە هەیە. باوەڕناکەم.»

– «من باوەڕ دەکەم»

– «گومانم لێی هەیە، چونکە خۆم بەتاخورک لەسەر شەقامەکانی (مۆنترۆکس) هەڵخلیسکانێم کردووە. نەک تەنیا جارێ، بەڵکو زۆرجار و هیچ گومانیشم لەوەدا نییە هەڵخلیسکانێی تاخورک وەرزشێکی زستانییە.»

کاربەدەستەکەی تر، ڕووی تێکردم و گوتی:

– «ئەرێ کابرا، لەوەرزشی زستانە مەبەستت هەڵخلیسکانێی تاخورگە؟ پێت دەڵێم لە (لۆکارتۆ) زۆر دڵخۆش دەبی هەوایەکی زۆر ساف و سازگارە. دەوروبەرێکی دڵارای هەیە ئەو ناوچەیەت زۆر بەدڵ دەبێ.»

– «کابرا، بڕیاری داوە بچێتە مۆنترۆکس.»

پرسیم: «هەڵخلیسکانی تاخورک (لیوگ) چییە؟»

– «دەبینی قەتاوقەت گوێی لە هەڵخلیسکانێی تاخورک نەبووە.»

– «(ئۆخس براذەر- برایانی ئۆخس) کەرەسەی تۆبۆگان دەفرۆشن. ئەوان تۆبۆگانی خۆیان لەدەرەوە دەهێنن.»

کاربەدەستی دووەم ڕووی تێکردم و گوتی:

– «هەڵخلیسکانی (تۆبۆگانینگ) پێویستی بەگۆڕەپانی تایبەتی هەیە، ناتوانی لەناو شەقامەکانی مۆنترۆکس هەڵخلیسکانێ بکەی. ئێوە لێرە لەکوێ دادەبەزن؟»

– «نازانین، ئەوەندە دەزانم بەپەیتوون لە (برسیاگۆ)ە هاتووین، پەیتوونەکە لە دەرەوە چاوەڕێمانە.»

کاربەدەستی یەکەم گوتی:

– «گەر بچنە مۆنترۆکس پەشیمان نابنەوە. بەچاوی خۆتان هەوای مۆنترۆکس دەبینن کە چەند خۆش و سازگارە. وەرزشی زستانەش لەتەک خۆتانەوەیە، زۆر دوور نییە لێتان.»

کاربەدەستی دووەم: «گەر ڕاست دەکەی مەبەستت وەرزشی زستانەیە دەبێ ڕوو لە (ئینگادین) یا (موورتین) بکەیت. لەگەڵ بڕیاری ئێوە نیم بۆ وەرزشی زستانە بچنە مۆنترۆکس.»

– «لە (لیە ئاڤانت) لە سەرەوەی مۆنترۆکس وەرزشگای زستانی نایاب هەیە هەموو جۆرە یارییەکی تیایە.»





ئەوەی لایەنگیری مۆنترۆکس بوو وای گوت و بەتووڕەییەوە سەیری هاوڕێیەکەی کرد.

گوتم: «پیاوینە، ئێمە دەبێ بڕۆین، ئامۆزاکەم زۆر ماندووە بەشێوەیەکی کاتی دەچینە مۆنترۆکس.»

کاربەدەستی یەکەم تۆقەی لەگەڵ کردم، گوتی:

«پیرۆزباییت لێ دەکەم.»

کاربەدەستی دووەم گوتی: «لەو باوەڕەم لە بەجێهێشتنی (لۆکارتۆ) پەشیمان دەبنەوە، هەرچۆنێ بێ کە گەیشتنە (مۆنترۆکس) دەبێ پولیس ئاگادار بکەنەوە.»

کاربەدەستی یەکەم بەپێ داگرتنەوە گوتی:

– «هیچ تەنگ و چەڵەمەیەکتان لەگەڵ پۆلیس بۆ پەیدا نابێ، دەشبینن کە دانیشتوانی (مۆنترۆکس) هەموو بەڕووخۆشی و برادەرانە ڕەفتارتان لەگەڵ دەکەن.»

گوتم: «زۆر سوپاستان دەکەم. ئامۆژگاریەکانتان سەرچاوم و نرخ و پایەیان لام دەبێ.»

کاترین گوتی: «خواحافیز، سوپاس بۆ هەردووکتان.»

تا دەرگا لەگەڵمان هاتن خۆیان بۆ چەماندینەوە. کابرای لایەنگیری (لۆکارتۆ) کەمێ بەساردتر و نابەدڵییەوە خواحافیزی لێ کردین لە پایەکانی پێبلکە دابەزین و هاتینە دەرەوە تا سواری پەیتوونەکە بین.

کاترین گوتی: «ئەی خوایە، ئازیزم، نەماندەتوانی کەمێ زووتر دەرچین؟»

ناوی ئوتێلێکم دایە پەیتوونچییەکە، کە کاربەدەستێک ئامۆژگاری کردم، بچم بۆ ئەوێ. پەیتوونچی جڵەوی ئەسپەکەی گرت.

کاترین گوتی: «سەربازەکەت لە بیرکرد.»

سەربازەکە لە تەک پەیتوونەکە ڕاوەستابوو، دە لیرم دایێ گوتم:

– «تا ئێستا پارەی سویسریم نییە.»

سوپاسی کردم. سەلامی بۆ کردم. ڕۆیشتە ڕێی خۆی، پەیتوونچییەکەش بەرەو ئوتێلەکە کەوتە ڕێ.

لە کاترینم پرسی: «چۆن وات بۆ هات کە مۆنترۆکس هەڵبژێری؟ تۆ لە دڵەوە دەتویست بۆ ئێرە بێیت؟»

– «تاکە ناوێ بوو لە مێشکمدا زرینگایەوە. شارێکی خراپ نییە. دەتوانین جێگایێ لە چیاکاندا بدۆزینەوە.»

– «خەوت دێ؟»

– «هەر ئێستا خەریکە بخەوم.»

– «خەوێکی خۆشی لێ دەکەین. (کات)ی داماو، شەوێکی درێژی ناخۆشت بەسەربرد.»

– «وەختێکی خۆشم بەسەربرد، بەتایبەتی کە چەترەکەت کردبووە چارۆگە بۆ بەلەمەکە.»

– «باوەڕ دەکەی لە سویسرا بین.»

– «نەخێر، دەترسم ڕاست نەبێ و بەخەبەر بێم خەون دەرچێ»

– «منیش وەکو تۆ.»

– «بەڵام ڕاستە ڕاست نییە، ئازیزم؟ خۆ ئێستا بۆ ئێستگەی (میلانۆ) بەرێ ناکەوم تا لێت داببڕێم و خواحافیزیت لێ بکەم.»

– «خوا نەکا وا بێ.»

– «توخوا وا مەڵێ، ئەم قسەیە دەمترسێنێ. لەوانەیە بەڕاستی بۆ وێ بچین.»

گوتم: «مێشکم لەسەر خۆم نییە، نازانم.»

– «با سەیرێکی دەستەکانت بکەم.»

دەستەکانم پان کردنەوە، سەرتاپا ببوون بەپفکە.

گوتم: «هێشتا کەلەکەم کون نەبووە»(١)

– «کفری مەکە.»

– «هەستم بەماندوویی و مێشک ئاڵۆزییەکی لەڕادە بەدەرکرد. ئەو خۆشییە هەمووی تێ هێنایەوە. پەیتوونەکە بەشەقامەکەدا دەڕۆیی.

کاترین گوتی: «ئای دەستە بەسەزمانەکانت.»

– «دەستیان لێ مەدە. بەخوا نازانم لە کوێین و بۆ کوێ دەچین. ئەرێ کابرای پەیتوونچی بۆ کوێ دەچین؟»

کابرای پەیتوونچی ئەسپەکەی ڕاگرت و گوتی:

– «بۆ ئوتێلی (میترۆپۆل)، ناتەوێ بچینە وێ؟

گوتم: «بەڵێ، زۆر چاکە کات.»

– «زۆر چاکە، ئازیزەکەم، مەشێوێ، خەوێکی خۆشی لێ دەکەین تا بەیانی لەخەو هەڵدەستی بەڵات لێ نەماوە.»

گوتم: «بەتەواوی مێشکم لەسەرخۆم نەماوە. ئەمەی ئەمڕۆ ئۆپرایەکی گاڵتەجاڕی بوو، خۆ ڕەنگە برسیشم بێ.»

– «تۆ تەنیا ماندووی، هیچت نییە، چاک دەبیتەوە.»

(١) مەبەست لە سێدارەدانی عیسایە چونکە کەلەکەکانی کون کرابووون.





پەیتوونەکە لەبەردەم ئوتێلەکە وەستا، یەکێک هاتە دەرەوە تا جانتاکانمان هەڵبگرێ.

گوتم: «هەست دەکەم چاکتر بوویم.»

دابەزیبووینە سەر شۆستەکە و بەرەو ئوتێلەکە دەڕۆیشتین.

– «دەزانم چاک دەبیت. تۆ تەنیا ماندووی. زۆر لە مێژە نەخەوتوویت.»

– «هەرچۆنێ بێ، خۆ ئێمە وا لێرەین.»

– «بەڵێ بەڕاستی لێرەین.»

بەدوای کوڕە جانتا هەڵگرەکە چووینە ئوتێلەکە.

# کتێبی پێنجەم

## 38

ئەوێ پاییزێ بەفر دواکەوت. ئێمە لە خانووێکی دارینی قاوەیی لەنێو دارکاژان لە قەدپاڵی چیاییێدا دەژیاین. شەوانیش شەختەی دەبەست. بۆیە بەیانیان شەختەیەکی تەنک لەسەر ئاوی دوو ئافتاوەکەی سەر دۆڵابی ژوورەکەمان پەیدا دەبوو.

خاتوو (گوتنگن) بەیانی زوو هاتە ژوورەوە تا پەنجەرەکان دابخات و ئاگر لەناو سۆپەکەدا دابگیرسێنێت. پارچە دارکاژەکان قرچوهۆڕیان لێوە هات و پرووشکیان هاوێشت و پاشان مەشخەڵی ئاگردانەکە بەرز بووەوە. هەر کە خاتوو (گوتنگن) جاری دووەم هاتە ژوورێ پارچە داری گەورەی بۆ ئاگردانەکە هێنا، لەگەڵ ئافتاوێ ئاوی گەرم. کە ژوورەکە گەرم داهات چاشتی بۆ هێناین.

ئێمە لەسەر چوارپایەکەوە نانی بەیانیمان دەخوراد. دەمانتوانی دەریاچەکە و چیاکانی ئەوبەری دەریاچەکە لەبەری فەرەنساوە ببینین. سەرتۆپی چیاکان بە بەفر داپۆشرابوون ئاوی دەریاچەکەش ڕەنگە شینێکی مەیلەو بۆر بوو.

لەدەرەوە، لەبەردەم خانووەکەوە ڕێگایێ بەسەر چیایەکە هەڵدەگەڕا شوێنی تایەی گالیسکەکان و کۆسپەکان لەبەر شەختە وەکو ئاسن ڕەق ببوون. کە بەبەردەوامی بەنێو دارستانەکە و بەدەوری چیاکەوە بۆ ئەو شوێنە هەڵکشابوو کە مێرگوزار و گەوڕ و زنجی لەناو مێرگوزارەکاندا هەبوو، لە بناری دارستانەکەدا هەڵکەوتبوون بەسەر دۆڵێکی دادەڕوانی دۆڵەکە دۆڵێکی قووڵ بوو، چۆمێکی تیابوو کە دادەڕژایە ناو دەریاچەکە کاتێ با لەدۆڵەکەوە هەڵیکردبایە گوێت لە خوڕە و هاژەی چۆمەکە دەبوو کە بەنێو بەردانادا دەڕۆیشت.

هەندێ جار لە ڕێگا دوور دەکەوتینەوە، لامان دەدایە سەر ڕێچکەیەکی ناو کاژستانەکە، خاکی دارستانەکە بۆ ڕۆیشتن زۆر نەرم بوو. شەختەکە خاکی ناو دارستانەکەی وەکو ڕێگاکە ڕەق نەکردبوو. بەڵام باکمان بەڕەقی ڕێگاکە نەبوو، چونکە پاشپانی پووتەکانمان بزمارڕێژ بوو. بزمارەکان لە شەختەکە دەچەقین و شوێنەکانیان بەچاڵی بەجێ دەما بەسایەی ئەم پێڵاوانە پیاسەکردن لەسەرئەم چەشنە ڕێگایە زۆر خۆش بوو. بەڵام پیاسەی ناو دارستانەکە خۆشتربوو.

لەبەردەم ئەو خانووەی کە تیای دەژیاین چیایەکە زۆر بەلێژی بەرەو دەشتێکی بچووک شان بەشانی دەریاچەکە درێژ ببووەوە. لەبەر تارمەی خانووەکە لە بەربەرۆشک دادەنیشتین. ڕێگا پێچاوپێچ لە بناری چیاکەوە بەرەو خوار دەبۆوە و ڕەزی ترێ لەلای خواری چیاکە و دارمێوە مردووەکان لەبەر سارد و سۆڵی زستان و کێڵگە ناوبڕە بەردینەکان و لە خوارەوەی ڕەزەمێوەکانیش خانووەکانی شارۆچکەیەک لە دەشتێکی





تەنگەبەر کە بەدرێژایی کەناری دەریاچەکەوە کشابوو، ئەمانەمان هەمووی بینی. دوورگەیێ لەناو دەریاچەکەوە هەبوو، دوو درەختی تیابوو، ئەم دوو درەختە لە جووتە چارۆگەی بەلەمی ماسیگرەکانیان دەکرد چیاکان لە دیوەکەی تری دەریاچەکەوە تیژ و لێژبوون لە خوارەوەش لەو سەری دەریاچەکەوە دەشتی دۆڵی (ڕۆن) بوو. دەشتێکی پان و تەخت بوو، کەوتبووە نێوان دوو زنجیرە چیاوە، لەسەرەوەی دۆڵەکە، کە چیاکان دەشتەکەیان دابڕ کردبوو، چیای (دان دومیدی) بوو. (دان دومیدی) چیایەکی بەفرینی گەردەنکەش بوو، بەسەر دۆڵەکەی دادەڕوانی بەڵام لەبەر زۆر دووری سێبەری دروست نەکردبوو. هەر کاتێ خۆرەتاو بوایە لەبەر تارمەی خانووەکە نانمان دەخوارد، بەڵام لە هەموو بارەکانی تر لە نهۆمی سەرەوە لە ژوورێکی بچووک نانمان دەخوارد کە لەدار دروست کرابوو، لە قوژبنێکەوە ئاگردانێکی گەورەی تیابوو چەند کتێب و گۆڤار و کتێبێکی (هۆیلە)مان لە شاردا کڕی. گەلێ جۆرە یاری کاغەزی دووقۆڵی فێربووین. ئەو ژوورە بچووکەی ئاگردانی تیابوو ژووری دانیشتنمان بوو. دوو کورسی و مێزێکی بۆ کتێب و گۆڤارەکان تیابوو. کە مێزەکە لە شتەکانی سەری پاک دەکرایەوە یاری کاغەزمان دەست پێدەکرد. (گوتنگن) و هاوسەرەکەی لە نهۆمی خوارەوە دەژیان. هەندێ ئێواران کە قسەیان دەکرد گوێمان لە قسەکانیان دەبوو. ئەوانیش لەگەڵ یەکتری زۆر بەختیار بوون. (گوتنگن) لە وەختی خۆی سەرۆکی خزمەتچییەکان بووە، خێزانەکەشی لە هەمان ئوتێل کارەکەر بووە. پارەیان کۆکردبۆوەوە و ئەم خانووەیان بۆ خۆیان کڕیبوو. کوڕێکیان هەبوو ئەویش دەیخوێند تا ببێ بەسەرۆکی خزمەتچییان. کوڕەکەیان لە ئوتێلێکی (زویرخ ) بوو، لە خوارەوە ژووری پێشوازیان هەبوو مەی و بیرەیان تیا دەفرۆشت. ئێواران گوێمان لە دەنگی پەیتوونان دەبوو لەسەر ڕێگاکە دەوەستان. خەڵکی بۆ مەی خواردنەوە بەپێپلکەکانەوە سەردەکەوتن و دەهاتنە ژووری پێشوازی.

سندووقێ دار لە هۆڵەکەوە، لە دەرەوەی ژووری دانیشتن، هەبوو، منیش ئاگرم پێ خۆش کرد. بەڵام شەو تا درەنگ نەماینەوە. لە تاریکی چووینە سەر چوارپایەکەوە لە ژووری گەورەی نووستنەوە، وە کاتێ کە ڕووت بووم پەنجەرەکانم کردەوە سەیری شەو، ئەستێرەی سارد و دارکەژەکانی ژێرەوەی پەنجەرەکەم کرد دوایی بەپەلە خۆم کوتایە نێو جێگەوە. نێو جێگە زۆر خۆش بوو. لەو کاتەی کە هەوا زۆر سارد و سافە، شەویش لە دەرەوە، لە پەنجەرەوە دیاربێ. خەوێکی خۆش خەوتین، وە کە بەخەبەر هاتم زانیم لەبەر هۆبێ بووە ئەویش ئەوەبوو کە لێفم لەسەر لاچووبوو، منیش زۆر بەنەرمی و هێواشی بەسەر خۆم دادایەوە تاوەکو کاترین لەخەو نەبێ، پاشان خەوتمەوە، گەرم، لەژێر لێفەی نەرم و نوێوە. وا دیاربوو شەڕ لێرە زۆر دووربێ، بەڵام لە ڕۆژنامەکانا دەمزانی کە لە چیاکاندا کوشتن و بڕین هەر بەردەوامە، چونکە بەفر هێشتا نەباریبوو.

هەندێ جار لە چیاکەوە بۆ مۆنترۆکس دادەبەزین پیادە ڕێیێ لە چیاکەوە بۆ خوارەوە

چووبوو، بەڵام زۆر لێژ بوو و ئێمەش زۆر بەئاسایی، بەپیاسە بەسەر ئەو ڕێگا بەرین و ڕەقەی لە نێوان کێڵگەکاندا تێدەپەڕین، پاشان بەخوارەوە بەنێوانی تیغە دیوارە بەردەکانی ڕەزەمێوەکان و پاشان بەنێوان خانووەکانی گوندەکەوە بەدرێژایی ڕێگاکەوە دەڕۆیشتین.

سێ ئاوایی تیابوو (چیرنیکس)، (نۆتانیڤیت) ناوی ئەوی تریانم لەبیرچووە. پاشان بەسەر ڕێگاکەوە بەلای کۆشکێکی چوارگۆشەی لەبەرد دروستکراو تێپەڕین کە لە بناری چیاکەوە بوو، هەر چوار دەوری دارمێو بوو، هەر دارمێوێ بەسەر ساباتێ هەڵواسرابوو مێوەکان وشک و قاوەیی، زەویش باوەشی بۆ میوانداری بەفر کردبۆوە. ئاوی دەریاچەکەی خوارەوەش تەخت و بۆر بوو دەتگوت پۆڵایە. ڕێگاکە ماوەیەکی باش بەدامێنی کۆشکەکەدا تێپەڕ دەبوو، پاشان بەلای ڕاستەوە دەسووڕایەوە، زۆر بەلێژی و هەڵدێرییەوە لە (مۆنترۆکس)ەوە دەرچووبوو، تەختکراو بەپلووکە بەرد بەردڕێژ کرابوو.

لە (مۆنترۆکس) کەسمان نەناسی، هێدی هێدی بەقەراغی دەریاچەکەوە ڕۆیشتین، قاز و تیلەکناچەمان بینی کە لێیان نزیک بووینەوە دایانە شەقەی باڵ و هەڵفڕین و چاویشیان بڕیبووە ئاوەکەوە و دەیان قیژاند. وە لەولای دەریاچەکەوە ڕەوە باڵندەی سێ لەسەری بچووک و ڕەش هەبوون، لە کاتی مەلەکردندا شوێنەواریان بەجێ دەهێشت. لە شارەکە بەناو شەقامە سەرەکییەکەدا ڕۆیشتین، لە جامخانەکەوە سەیری دوکانەکانمان کرد، زۆر ئوتێلی گەورە و داخراوی تیابوو، بەڵام زۆربەی دوکانەکان لەسەر پشت بوون، خەڵکەکە بەدیتنمان دڵشاد بوون. دوکانێکی قژ جوانکردنی قشتی تیابوو، کاترین چووە ژوورەوە، تا پرچی ڕێک بخات، ئافرەتە قژ ڕێکخەرەکەی سەرتاشخانەکە زۆر ڕووخۆش بوو. ئەو ژنە تاکە کەس بوو لە مۆنترۆکس ئاشنایەتیمان لەگەڵ پەیدا کردبوو. لەو بێنەی کاترین لە سالۆنی دوکانەکە بوو، چوومە مەیخانەیێ بیرەی (میونیخ)ی خەستم خواردەوە، ڕۆژنامەم خوێندەوە، ڕۆژنامەی (کۆریر دیلاسێرا) و ڕۆژنامەی ئینگلیزی و ئەمریکیم خوێندەوە کە لە پاریسەوە هاتبوون. هەموو ئاگادارنامە و جاڕدانێکی لێ بڕابوو، لەوانەیە بۆ ئەوە وا کرابێ تا بەهیچ جۆرێ پەیوەندی لەگەڵ دوژمنەوە نەبەسترێ. خوێندنەوەی ڕۆژنامە مرۆڤی دڵتەنگ دەکرد، هەموو شتێ لە هەموو لایێ بەرەو خراپی دەچوو. لە قوژبنێ دانیشتم گۆزەیەکی بیرەی خەست و پاکەتێ (پریتسل)ی بەرگ لووسم لەلا بوو، هەندێ (پریتسل)ی بۆدراوی سوێرکراوم خوارد، ئەمە تامی بیرەکەی خۆش کردبوو. دەستم بەخوێندنەوەی کارەساتەکان کرد. لەو باوەڕە بووم کە کاتی دەرچوونی کاترین لە سالۆنەکەوە نزیک بووبێ، تا بێتە لام، بەڵام نەهاتەدەر، ڕۆژنامەکەم لەسەر ڕەفەکە دانایەوە پارەی بیرەکەم دا و بەدوای ئەو هاتمە سەر شەقامەکە، ڕۆژەکەی سارد و تاریک و زستانی بوو، بەردی خانووەکانیش ساردی لێ دەڕژا. کاترین تا ئێستا هەر لە دوکانەکە بوو ئافرەتەکە پرچی کاترینی لوول دەکرد، لە کونجێکی بچووکی دوکانەکە دانیشتم چاوەڕوانیم کرد، ئەوەندە چاوەڕێم کرد تا زۆر





بێزار بووم، کاترین زەردەخەنەیەکی هاتێ و قسەی لەگەڵ کردم، لە تووڕەیی و بێزاری قورگم نووسابوو. کرتەکرتی مووکێشەکە دەنگێکی خۆشی پەیداکردبوو، لە سێ ئاوێنەوە دەمتوانی کاترین ببینم. ناو ژوورەکە کەمێ خۆش و گەرم بوو پاشان ئافرەتەکە پرچی کاترینی شانەکرد، کاترین لە ئاوێنەکەوە سەیری خۆی کرد، کەمێ لە مۆدەی (شێوەی) شانەکردنەکەی گۆڕی، تۆقەکانی دەرهێنا و لە شوێنێکی تری قایم کردن پاشان هەستایە سەرپێ و گوتی:

– «ببوورە زۆرم ڕاگرتی.»

ئافرەتەکە زەردەخەنەیەکی گرت و گوتی:

– «ئەرێ کابرا، زۆر کەیفت لەمە وەرنەگرت، وایە یان نا؟»

گوتم: «بەڵێ.»

هاتینە دەرەوە، بۆ سەرەوەی شەقامەکە ڕۆیشتین، ڕۆژێکی زۆر سارد و زستانی بوو، باشی دەهات.

گوتم: «ئۆهـ، ئازیزم، من تۆم زۆر خۆشدەوێ.»

کاترین گوتی: «ئەرێ کاتێکی خۆشمان نییە؟ گوێ بگرە با بچینە شوێنێ لەجیاتی چا بیرە بخۆینەوە بیرە بۆ کاترینی ساوا زۆر بەسوودە، بەبچووکی دەیهێڵێتەوە.»

گوتم: «کاترینی ساوا، ئەو بێ ئیش و کارە»

– «کچێکی چاک دەبێ، کەمێ گیروگرفت پەیدا دەکا. دکتۆر دەڵێ بیرە خواردنەوە بۆ من زۆر بەسوودە ئەویش بەبچووکی دەهێڵێتەوە.»

– «ئەگەر بەبچووکی بمێنێ پاشان کوڕ دەرچێ کچ نەبێ، ئەوا دەبێتە ئەسپ سوار.»

کاترین گوتی: «منداڵەکە هەر لە دایک دەبێ، دەبێ یەکتری بخوازین.»

لە قوژبنی مەیخانەیێ لەسەر مێزێ دانیشتبووین، دەرەوە تاریک داهاتبوو هێشتا زوو بوو، بەڵام دونیا تاریک داهات ئێوارە زوو داهات.

گوتم: «با ئێستا یەکتری بخوازین.»

– «نەء، ئێستاکە شەرمەزارییە. حاڵم وا بەئاشکرا هاوار دەکا، بەو حاڵەش لەبەرچاوی کەس خۆم بەمارەکردن نادەم.»

– «خۆزیا پێشتر یەکتریمان بخوازتبایە.»

– «ئەگەر وامان کردبا باشتربوو، ئازیزم. بەڵام کەی ئەوەمان بۆ ڕەخساوە، ئازیزم؟»

– «من شتێ دەزانم، ئەویش ئەوەیە بەزگی پڕەوە و بەو حاڵە شوو ناکەم.»

– «پێ ناچێ زگپڕ بی.»

– «بەڵێ، زگپڕم، ئافرەتە قژچاکەرەکە لێی پرسیم ئایا ئەم زگەم زگی نۆبەرەمانە؟ درۆم کرد و گوتم: نەخێر دوو کوڕ و دوو کچمان هەیە.»

– «کەی یەکتری بخوازین؟»

– «پاش ئەوەی زگ دادەنێم، دەمەوێ زەماوەندێکی گەورە و خۆش ساز بکەین، تا خەڵک هەمووی بڵێ بووک و زاوایەکی جوانن.»

– «لەوە بێ ئارام نابیت؟»

– «بۆچی بێ ئارام بم، ئازیزم؟ تاقە جارێ کە شەرمم لە خۆم کردبێتەوە ئەو جارەبوو کە لە (میلانۆ) خۆم بەسۆزانی هاتە بەرچاو. کە هەمووی لە حەوت دەقە زیاتری نەخایاند، پتر لەوەش بەناو ماڵەکە بێ ئارام بووم. ئەی باشە من هاوسەرێکی باش نیم؟»

– «هاوسەرێکی بێ هاوتای.»

– «کەوابوو مرۆڤێکی زۆر تەکنیکی مەبە، ئازیزم، هەر زگەکەم دانا، شووت پێ دەکەم.»

– «زۆر چاکە.»

– «بەچاکی دەزانی بیرەیەکی تر بخۆمەوە؟ دکتۆر پێی گوتم کلۆتم کەمێک تەسکە. بۆیە بیرە خواردنەوە باشترین شتە کە (کاترین)ی ساوا بەلەڕ و لاوازی بهێڵێتەوە.»

پەشۆکام و گوتم: «چی تری گوت؟»

– «هیچی تری نەگوت، گوتی پاڵەپەستۆی خوێنم زۆر چاکە، لە پاڵەپەستۆی خوێنم واقی ورما.»

– «ئەی دەربارەی کلۆتت چی گوت؟»

– «هیچی نەگوت. گوتی نابێ بەفرەخلیسکێ بکەم.»

– «زۆر ڕاستە.»

– «گوتی کاتی ئەوە بەسەرچووە بەفرەخلیسکێ بکەم. ئەگەر پێشتر نەمکردبێ. وە پێی گوتم دەتوانم بەفرەخلیسکێ بکەم بەمەرجێ بەرنەبمەوە.»

– «کابرایەکی دڵفراوان و گاڵتەبازە.»

– «بەڕاستی پیاوێکی باشە، لەکاتی منداڵبوونم دەبێ ئەو بێ بەدایەنم.»

– «لێت پرسی کە دەبێ شوو بکەی؟»

– «نەخێر، پێم گوت چوار ساڵە شووم کردووە. تۆش ئازیزم، خۆ دەزانم ئەگەر شوو بەتۆ بکەم، دەبێ ببم بەئەمریکی، هەر کاتێ بەپێی یاسای ئەمریکی یەکتری بخوازین. منداڵەکە بەشێوەیەکی یاسایی بەئەمریکی دادەندرێ.»

– «ئەمەت لە کوێ دۆزییەوە؟»

– «لە کتێبخانە لە ساڵنامەی (ئەڵمانەک وێرد)ی نیوۆرکی.»

– «تۆ کچێکی لێهاتووی.»





– «زۆر خۆشحاڵم بەوەرگرتنی ڕەگەزنامەی ئەمریکی. ئەو کات دەچمە ئەمریکا تۆش حەزناکەی، ئازیزم؟ دەمەوێ تاڤگەکانی (نیاگارا) ببینم.»

– «تۆ کچێکی جوانی.»

– «شتێکی تریش هەیە دەمەوێ ببینم. بەڵام نایەتەوە یادم.»

– «ئاخەڵی ولاغان.»

– «نەخێر، نایەتەوە بیرم.»

– «ساختمانی وۆل وت؟»

– «نەخێر.»

– «گراند کانیون؟»(١)

– «نەخێر، بەڵام حەز دەکەم ئەویش ببینم.»

– «ئەو شتە چییە؟»

– «گۆلدن گێیت(١) –دەروازەی زێڕین– ئەو شتەیە حەز دەکەم بیبینم. گۆلدن گێیت لە کوێیە؟»

– «لە سان فرانسیسکۆیە.»

– «کەوابێ، با بچینە وێندەر، هەرچۆنێ بێ دەمەوێ سان فرانسیسکۆ ببینم.»

– «زۆر چاکە. دەچینە وێندەر.»

– «ئێستا با بچینە چیا. بچین؟ دەبێ هۆکانی گواستنەوەمان دەستکەوێ؟»

– «لەسەعات پێنج شەمەندەفەرێ دەردەچێ.»

– «دەخێرا با پێی ڕابگەین.»

– «زۆر باشە، یەکەم جار بیرەیەکی تر دەخۆمەوە.»

کە چووینە دەرەوە تا برۆینە سەر شەقامەکە. بەسەر پێبلکەی ئێستگە کەوتین، زۆر ساردبوو، دۆڵی (ڕۆن)یش بایەکی ساردی لێوە دەهات. گلۆپەکانی جامخانەی دوکانەکان داگیرسابوون بۆچوونە سەر شەقامەکانی سەرەوە بەسەر پێبلکەیەکی ڕکی بەردین کەوتین، پاشان چووینە سەر یەکی تر کە بەرەو ئێستگە دەکشا. شەمەندەفەری کارەبایی لەوێ وەستابوو، گلۆپەکانی داگیرسابوون تابلۆیەکی ئاگاداری، کاتی دەرچوونی شەمەندەفەری لەسەر دیار کرابوو. کاتژمێری دەستم پێنج و دە دەقە بوو، سەیری کاتژمێری ئێستگەم کرد پێنج دەقە لە پاش بوو. کاتێ چووینە ناو شەمەندەفەرەوە، کابرای مەکینەوان و پلیتبڕم بینین لە مەیخانەی ئێستگەوە دەهاتنە

(١) ناوی باخچەیەکی گشتییە.

(١) پردێکی هەڵواسراوە درێژییەکەی (٣,٢کم)ە.

دەرەوە. دانیشتین پەنجەرەکانمان کردەوە، شەمەندەفەرەکە بەسۆپەی کارەبایی گەرم دەکرا، هەوای ژوورەوە پیس بوو، بەڵام لە پەنجەرەکەوە هەوایەکی سازگاری خۆش دەهاتە ژوورەوە.

لە کاترینم پرسی: «ماندووی کاترین؟»

– «نەخێر، لەوپەڕی خۆشیدام.»

– «ڕێگاکەمان دوور نییە.»

– «حەز لە سواربوونی شەمەندەفەر دەکەم، خەمی منت نەبێ ئازیزم هەست بەخۆشی دەکەم.»

بەفر تا سێ ڕۆژ بەر لە (کریسمس) نەباری. بەیانییێ لەخەو هەستاین بەفر دەباری، ئێمە لەناو جێگا ماینەوە. ئاگر قرچوهۆڕی بوو، سەیری بەفرکەوتنمان دەکرد خاتوو (گوتنگن) خوانچەکانی نانی بەیانی بردەوە پارچەداری تری خستە ناو ئاگردانەکەوە، بەفرێکی ئەستوور باری. خاتوو (گوتنگن) گوتی لە نیوەی شەوێوە دەبارێ. چوومە لای پەنجەرەوە، سەیری دەرەوەم کرد. بەڵام نەمتوانی ڕێگاکە ببینم، بای دەهات بەفریش بەئەستووری دەباری. گەڕامەوە سەر چوارپایەکە، پاڵم دایەوە، دەستمان بەقسە کرد.

کاترین: «خۆزیا بمتوانیبایە بەفرەخلیسکێ بکەم، شتێکی زۆر ناخۆشە نەتوانی بەفرەخلیسکێ بکەی.»

– «قاپقاپی بەفرەخلیسکێ پەیدا دەکەین، لە ڕێگاوە پێی دادەبەزین، بۆ تۆ ئەمە لە سواربوونی ئوتومبیل خراپتر نییە.»

– «سواربوونی ناخۆش نییە؟»

– «دەتوانین بیبینین.»

– «بەو هیوایەم سواربوونی ناخۆش نەبێ.»

– «پاش ماوەکی کەم لەناو بەفرەکە پیاسە دەکەین.»

کاترین: «بەر لەنانی نیوەڕۆ، ئەوکات بەردڵمان باشتر دەکرێتەوە.»

– «هەردەم برسیمە.»

– «هەروەها منیش.»

چووینە دەرەوە تا لەناو بەفرەکە بڕۆین، بەڵام بەفرەکە دەیوەشاند بۆیە نەمانتوانی زۆر بڕۆین، من لە بەرایی ڕۆیشتم، ڕێگام بۆ کاترین خۆشکرد، تا گەیشتینە ئێستگە، بەڵام کە گەیشتینە وێندەر ویستمان ماوەیەکی دوورتر بڕۆین بەفر بەتاوتر باری و نەمانتوانی شتێ بەدی بکەین، بۆیە چووینە خانێکی بچووکی نزیک ئێستگەوە، هەریەکەمان بەگەسکێ بەفری سەر جلی ئەوی تری داوەشاند. لەسەر قەنەفەیێ لێ دانیشتین و ڤێرموثمان خواردەوە.





ئافرەتێکی مەیگێڕ گوتی: «بەفرێکی ئەستوورە.»

– «بەڵێ.»

– «ئەمساڵ بەفر زۆر دواکەوت.»

– «بەڵێ.»

کاترین پرسی: «دەتوانم شوکولاتێ بخۆم؟ یا لە نانی نیوەڕۆ نزیک بووینەوە؟ بە بەردەوامی برسیمە.»

گوتم: «شوکولاتێ بخۆ.»

– «یەکێکی بوندقدار دەخۆم.»

ئافرەتەکە گوتی:

– «ئەمانە بابەتی نایابن، بەچاکترین بابەتی دەزانم.»

گوتم: «ڤێرمۆثێکی تر دەخۆمەوە.»

کاتێ هاتینە دەرەوە، تا بەڕێی خۆمان بگەڕێینەوە، شوێن پێمان بەتەواوی بەبەفر پڕبوونەوە، تەنیا چەند ئاکارێکی کەمی مابووەوە، بەفر بەرەو ڕوومان دەباری، بەزەحمەت، دەمانتوانی شت بەدی بکەین پاشان بەفرمان لە خۆمان داوەشاند بۆ فراوین چووینە ژوورەوە، گوتنگن جەمی نیوەڕۆی بۆ هێناین.

گوتی: «بەیانی بەفرەخلیسکێ دەست پێدەکا ئەرێ مستەر هێنری تۆ بەفرەخلیسکێ دەزانی؟»

– «نەخێر بەڵام دەمەوێ فێربم.»

– «زۆر بەئاسانی فێردەبی، کوڕەکەم بۆ کریسمس دەگەڕێتەوە با ئەو فێرت بکا.»

– «زۆر جوانە. کەی دێتەوە؟»

– «سبەی شەو.»

لە پاش نانخواردن لەوکاتەی لە نزیک ئاگردانەکەوە لە ژوورە بچووکەکە دانیشتبووین، لە پەنجەرەوە سەیری بەفر بارینمان دەکرد.

کاترین گوتی: «حەز دەکەی بەتەنیا گەشتێک لەگەڵ خەڵک بۆ جێگایێ بکەی و لەگەڵ پیاوان بەفرەخلیسکێ بکەی؟»

– «نەخێر، بۆچی من بەتەنیا بچم.»

– «هەندێ جار وا بەچاک دەزانم، کە بێجگە لەمن دەبێ خەڵکی تر ببینی.»

– «ئەی تۆ ناتەوێ خەڵک ببینی؟»

– «نەخێر.»

– «منیش نامەوێ.»

– «دەزانم، بەڵام تۆ جیاوازی. من بارم گرانە، ئەمەش وام لێ دەکا نەتوانم هیچ بکەم، دەزانم ئێستاکە زۆر بێ عەقڵم، زۆر قسە دەکەم، وا بیر دەکەمەوە کە دەبێ بچیە دەرەوە تا لێم وەرس نەبی.»

– «دەتەوێ لێت دوور بکەومەوە؟»

– «نەخێر، دەمەوێ لەگەڵم بمێنێیتەوە.»

– «باشە، منیش وا دەکەم.»

– «وەرە ئێرە، دەمەوێ هەست بەئاوسانەکەی سەرت بکەم، ئاوسانێکی گەورەیە.»

پەنجەکانی بەسەر هێنا و برد، گوتی:

– «حەز دەکەی ڕیش دابنێیت؟»

– «حەز دەکەی دای بنێم؟»

– «ڕەنگە بەوە عەنتیکە بی، حەز دەکەم بەڕیشەوە بتبینم.»

– «زۆر چاکە دای دەنێم، لەو چرکەوە دەست پێدەکەم، بیرێکی باشە. وام لێ دەکا هەندێ ئیش ڕاپەڕێنم.»

– «ئەرێ تۆ لەوە نیگەران نی کە هیچ ئیشێ نییە پێیوە خەریک بیت؟»

– «نەخێر، وا حەز دەکەم. بەو شێوەیە ژیانێکی خۆشم هەیە. تۆش وانیت؟»

– «ژیانێکی خۆشم هەیە، بەڵام لەوە دەترسم کە زگم گەورە بووە تۆم بێزار کردبێ.»

– «ئۆه، کات، تۆ نازانی من چەند شەیدای تۆمە.»

– «ئەوەندە شەیدای منی؟»

– «هەروەکو تۆ کەیفخۆشم، توخوا ژیانێکی خۆشمان نییە؟»

– «بەڵێ هەمانە، بەڵام وام زانی ڕەنگە تۆ بێ ئارام بووبی.»

– «نەخێر، بەڵام هەندێ جار بیر لەبەرەی جەنگ و خەڵکی ناسیاوم دەکەمەوە. بەڵام نیگەران نیم، لەوە زیاتر بیر لەهیچ شتی تر ناکەمەوە.»

– «ئەوانەی بیریان لێ دەکەیەوە کێن.»

– «ڕینالدی و قەشە و زۆربەی ئەوانەی دەیانناسم، بەڵام نامەوێ زۆر بیریان لێ بکەمەوە، نامەوێ بیر لەشەڕ بکەمەوە، شەڕ بەگوێرەی من کۆتایی هاتووە.»

– «ئێستا بیر لە چ دەکەیەوە؟»

– «لە هیچ.»

– «بەڵێ، بیر لە شتێ دەکەیەوە. پێم بڵێ.»

– «لە خۆم دەپرسی دەبێ ڕینالدی تووشی نەخۆشی ئاتەشەک بووبێت؟»

– «هەر ئەوەیە بیری لێ دەکەیەوە؟»





– «بەڵێ.»

– «جا ئەو تووشی ئاتەشەک ببوو؟»

– «نازانم.»

– «بەختیارم بەوەی کە تووشی ئاتەشەک نەبووی. چ جار شتی وات تووش بووە؟»

– «تووشی سووزەنەک بووم.»

– «نامەوێ هیچم دەربارەی ئەوەوە گوێ لێ ببێ، ئێش و ئازاری زۆر بوو ئازیزم؟»

– «زۆر!»

– «خۆزیا من لە جیاتی تۆ تووش ببام.»

– «نا تۆ نا.»

– «خۆزیا تووشی ببام تاوەکو هیچم لە تۆ کەمتر نەبووایە. خۆزیا هەموو دەزگیرانەکانیشتم بناسیبانە تا لە بەرامبەر تۆوە گاڵتەم پێ کردبان.»

– «ئەوە بەزمێکی خۆشە.»

– «سوزەنەک گرتنت بەزم نییە.»

– «دەزانم، ئێستا سەیری بەفر بارین بکە.»

– «حەز دەکەم سەیری تۆ بکەم ئازیزەکەم، بۆچی ناهێڵی قژت درێژبێ.»

– «چۆن درێژ بێ؟»

– «ئێستا زۆر درێژە.»

– «نەخێر، با کەمێ درێژتر بێ. منیش دەتوانم پرچم کورت بکەمەوە تا بەتەواوی بەیەکتری بچین. تەنیا ئەوە نەبێ کە یەکێکمان قژکاڵە و ئەوی تریشمان ڕەشتاڵەیە.»

– «ناهێڵم پرچت ببڕی.»

– «زۆر جوان دەبێ گەر ببڕم، لەبەری بەهیلاک چوویمەوە لێی بێزار بووم بەتایبەتی، لەشەودا کاتێ لەسەر جێگە درێژ دەبم.»

– «من حەز دەکەم درێژ بێ.»

– «بەکورتی لات جوان نییە؟»

– «بەڵێ، بەڵام ئەوها زیاتر حەزی لێ دەکەم.»

– «کورت بێ جوانترە ئەوکات هەردووکمان وەکو یەک دەبین، ئۆه ئازیزم من تۆم زۆر خۆشدەوێ، بەو ڕادەیە دەمەوێ لە هەموو شتێکەوە بەتۆ بچم.»

– «تۆ وای، ئێمە هەردووکمان یەکێکین.»

– «ئەوە دەزانم لە شەودا تاکە کەسێکین.»

– «شەو شتێکی مەزنە.»

– «دەمەوێ بەتەواوی تێکەڵ یەکتر بین. نامەوێ لێم دوورکەویتەوە ئەوە قسەیێ بوو کردم. دەتوانی برۆی گەر ئارەزووی ڕۆیشتنت هەیە بەڵام دەبێ زوو بگەڕێیتەوە. لەبەرچی، ئازیزم، کاتێ لەگەڵ تۆ نیم هەرگیز هەست بەژیان ناکەم؟»

گوتم: «قەتاوقەت لێت دوور ناکەومەوە هەست بەهیچ خۆشییەک ناکەم کە تۆی لێ نەبێت، بێی تۆ هەرگیز ژیانم نابێ.»

– «دەمەوێ ژیان بۆ تۆ بێ، ژیانێکی پڕ خۆش و پێکەوەی دەبەینەسەر. وا نییە؟»

– «ئێستا حەز دەکەی ڕیشەکەم لەو قایدە لێ گەڕێم یا گەورەتر بێ؟»

– «با گەورەتر بێ. زۆر جوان دەبێ. وە لەوانەیە جەژنی ساڵی تازەی پێ بکەین.»

– «ئێستا دەتەوێ یاری شەترەنج بکەین؟»

– «حەز دەکەم لەگەڵ تۆ یاری بکەم.»

– «نەخێر! یاری شەترەنج بکەین.»

– «پاش ئەوە پێکەوە دەست لەملانێ دەکەین؟»

– «بەڵێ.»

– «زۆر چاکە.»

تەختەی شەترەنجەکەم دەرهێنا، بەردەکانیم ڕیزکرد. بەفربارین بەردەوام بوو. شەوێ جارێک واگا هاتم، زانیم کاترینیش بەخەبەر هاتبوو. مانگ لە پەنجەرەوە تریفەی دەدا جامەکانی پەنجەرەکە سێبەریان لە چوارپایەکەمان کردبوو.

– «تۆ واگای شرینەکەم؟»

– «بەڵێ، خەوت لێ ناکەوێ؟»

– «هەر ئێستا واگا هاتم، بیر لەوە دەکەمەوە کە بۆ یەکەم جار تۆم بینی چۆن خەریک بوو شێت بم، لەبیرتە؟»

– «کەمێ شێت بووی.»

– «وا نەماوم. ئێستا مەزنم تۆ وشەی مەزن زۆر خۆش دەڵێیت. دەبیلێ.»

– «مەزن»

– «ئۆه، تۆ شیرینی. ئێستا شێت نیم ئێستا زۆر زۆر بەختیارم.»

گوتم: «دەبخەوەوە دەی»

– «زۆر چاکە. با لەیەک وەختا چاومان بچێتە خەوەوە.»

– «زۆر چاکە.»

بەڵام نەکرا وا بکەین، من ماوەیەکی زۆر بەهۆشیاری مامەوە بیرم لەزۆر شت کردەوە، تەماشای کاترینم کرد خەوتبوو تریفەی مانگەشەو لەڕووی دەدا. پاشان منیش کەوتمەوە خەو.





## 39

لە نیوەی مانگی کانوونی دووەمدا ڕیشم درێژبوو. زستانیش داهات، بەڕۆژە ساردە سامالەکانی و شەوە ساردە تووشەکانی توانیمان جارێکی تر بەناو ڕێگاکاندا پیاسە بکەین بەفرەکە لەبن پێچکەی تاخوڕگەی کا و تاخوڕگەی کۆلکەداری گەورە کە لە چیاکانا دەهێنرایە خوارەوە لووس و پەسترابووەوە، بەفر هەموو کون و قوژبنێکی لە ئاواییەوە تا (مۆنترۆکس)ی داپۆشیبوو، چیاکانی ئەوبەری دەریاچەکە و دەشتی دۆڵی (ڕۆن)یش لەبەر بەفر سپی دەچۆوە. لە بەرەکەی تری چیاکەوە پیاسەی دوور و درێژمان دەکرد. چووینە چیای (باینز دی ئەلباز). کاترین پۆتینی بزمارداری لە پێ کردبوو چارۆگەی لەخۆی وەرگرتبوو، داردەستێکی نووک پۆلاشی بەدەستەوە گرتبوو. بەچارۆگەکەوە ورگی گەورە دیار نەبوو، خێراش نەدەڕۆیی، بەڵام کە وەستاین لەسەر کۆلکە دارەبڕاوەکانی تەنیشت ڕێگاوە دانیشتین تا بسێینەوە. کاتێ ماندوو دەبوو. خانێ لەناو دار و درەختی چیای (باینز دی ئەلباز)دا هەبوو. داربڕەکان بۆ خواردنەوە لەوێ دەوەستان، لە ژوورەوە لە نزیک سۆپەوە دانیشتین و خۆمان گەرم کردەوە. مەیێکی سووری تیژی تێکەڵ بەبەهارات و لیمۆمان خواردەوە، پێیان دەگوت (گلۆڤاین) بۆ سەرگەرمی ئاهەنگ سازکردن شتێکی نایاب و بێ وێنە بوو.

خانەکە لە ژوورەوە تاریک و پڕ دووکەڵ بوو پاش ئەوەی لەخانەکە دەهاتینە دەرەوە بایەکی سارد و تووش خۆی دەسییەکانت دەکرد، لەگەڵ هەڵمژینی سەری لووتی دەبردی. ئاوڕێکمان لەدواوە دایەوە ڕووناکی خانەکە لە پەنجەرەکانەوە دەهاتە دەرەوە. ئەسپەکانی داربڕەکانیش پێکۆڵیان دەکرد سەریشیان دەهێنا و دەبرد تا گەرم ببنەوە. شەختەش داوەمووی سەر قەپۆزیانی بەستبوو هەناسەکانیان گورزەیەک شەختەیان بەهەوادا بڵاو دەکردەوە. بەڕێگاکە هەوراز بووینەوە. دەگەڕاینەوە ماڵەوە ڕێگاکە کەمێکی لووس و خلیسکاوی بوو. لەو پێچەی داربڕەکان لێی دەسووڕانەوە شەختەکەی لەبەر هاتوچۆی ئەسپەکان ڕەنگێکی پرتەقاڵی وەرگرتبوو. دواوەی ئەم پێچە، ڕێگاکەی بە بەفرێکی خاوێن داپۆشرابوو. ئەم ڕێگایە دەچووە ناو دارستانەوە. دووجار لە ڕێگەی گەڕانەوەمان بۆ ماڵەوە لەشەودا چاومان بەچەند ڕیوییێ کەوت.

شارێکی خۆش بوو، هەر کاتێ چووباینە دەرەوە کاتەکەمان بەخۆشی ڕادەبوارد.

کاترین گوتی: «ئێستا ڕیشێکی نازدارت هەیە، دەڵێی ڕیشی داربڕەکانە. ئەو پیاوەت دیت کە گوارەی بچووکی زێڕی لەگوێ کردبوو؟»

– «ئەو ڕاوچی کارمامزانە، ئەو گوارانە لەگوێ دەکەن، گوایە گوێیان سووکتر دەکا.»

– «بەڕاست؟ من باوەڕ ناکەم. وام دەزانی، بۆیە ئەمانە لە گوێیان دەکەن تا خۆیان وا نیشاندەن کە ڕواچی کارمامزانن. ئایا کارمامز لەو نزیکانە هەنە؟»

– «بەڵێ، لە دەوروبەری (دێنت دی جامەن)دا هەنە.»

– «خۆش بوو ڕێویمان دیت.»

– «کاتێ دەخەوێ کلکی لەخۆی وەردەگرێ، تا گەرم دابێ.»

– «ڕەنگە زۆر خۆش بێت.»

– «منیش حەزم دەکرد کلکێکی وەکو ئەوم هەبوایە، توخوا خۆش نییە ئەگەر کلکێکی وامان هەبوایە؟»

– «ئەو کات جل لەبەرکردنت زەحمەت دەبوو.»

– «ئەوسا جلی وامان دەدووری کە تایبەت بۆ ئەم مەبەستە دوورابایە. یا لە وڵاتێ بژایابایین کە ئەمە گرینگ نەبوایە.»

– «ئێمە لە وڵاتێ دەژین کە هیچ جیاوازییەکی تیا نییە؟ ئایا ئەمە مەزن نییە کە تۆ هیچ کەسێ نابینی؟ حەز ناکەی هیچ کەسێ چاوی پێت کەوێ؟ حەز دەکەی خۆشەویستم؟»

– «نەخێر»

– «کەمێ لێرە دانیشین؟ تۆزێ ماندووم.»

لە تەنیشت یەکتری لەسەر کۆلکە دارەبڕاوەکانی سەر ڕێگاکە دانیشتین. ڕێگاکە بەرەو دارستانەکە دەکشا.

– «ئەو بەبەیە لێکمان ناکات، وا نییە؟»

– «نەخێر، ڕێگەی ئەوەی نادەینێ.»

– «لەگەڵ پارە چۆنین؟»

– «زۆرمان هەیە. دوا چەکم لە چەکەکانم وەرگرت.»

– «ماڵەوەتان، هەوڵی گەڕانەوەت نادەن؟ پاش ئەوەی دەزانن لە سویسرای؟»

– «لەوانەیە، شتێکیان بۆ دەنووسم.»

– «بۆت نەنووسیون؟»

– «نەخێر، تەنیا بۆ پارە نەبێ.»

– «سوپاس بۆ خوا لەبنەماڵەی ئێوە نیم.»

– «برووسکەیان بۆ دەنێرم.»

– «بیریان ناکەی؟»

– «بیریان دەکەم، بەڵام بەینمان لەگەڵ یەک ئەوەندە خۆش نییە.»

– «لەو باوەڕەم کە خۆشم دەوێن. زۆریشم خۆش دەوێن.»

– «با باسیان نەکەین. ئەگینا هەستی غەریبیم بۆیان هەڵدەستێ.»

پاش کەمێک گوتم: «گەر حەسایەوە با بڕۆین.»





– «حەسامەوە.»

بەڕێگاکە شۆڕبووینەوە، دونیا تاریک ببوو، بەفر لەژێر پۆتینەکانمان خرچەی دەهات، شەویشی سارد و وشک و ساماڵ بوو.

کاترین گوتی: «حەز لە ڕیشەکەت دەکەم، لە پەروەردەکردن و دانانی زۆر سەرکەتووانە و پیتۆڵ بووی. پێدەچێ زۆر و دڕ بێت. بەڵام لای من نەرم و خۆشە.»

– «کێهانت پێ خۆشترە هەم بێ یا نەم بێ؟»

– «وا بزانم بەڕیشەوە. دەزانی من چۆنم لا پەسندە خۆشەویستم من وام لا پەسندە پرچی خۆم نەبڕم تا کاترینی بچووک لە دایک نەبێ. من ئێستا زۆر گەورە و ڕەزاگران دیارم، بەڵام پاش ئەوەی (کاتۆکە) لە دایک دەبێ جارێکی تر باریک دەبمەوە پرچی خۆم دەبڕم، بۆ تۆ جوان و جاحێڵ دەبمەوە، دەبمە کچێکی تر و ئەوکات پێکەوە دەچین، من پرچم دەبڕم و تۆش سەرت بتاشە. یا بەتەنیا دەچم، تا بگەڕێمەوە چاوت پێم بکەوێ و سەرت سوڕمێنێ.»

نقەم لێوە نەهات.

– «خۆ ناڵێی وا نابێت، ڕێگەم لێ دەگری؟»

– «نەخێر، لەو باوەڕەم کە زۆر جوان دەبی.»

– «ئۆ بەڕاستی تۆ خوێن شیرینی گیانەکەم. لەوانەیە جوانتر و لاوازتر و کۆکتر بم، تۆش جارێکی تر هەتا هەتایە لەگەڵم دەکەویەوە داوی ئەڤینییەوە.»

– «قسەی بێ مانا، من ئێستا تۆم زۆر خۆشدەوێ، دەتەوێ چیم لێ بکەی؟ دەتەوێ بم فەوتێنی؟»

– «بەڵێ، دەمەوێ بتفەوتێنم.»

گوتم: «باشە، منیش ئەوەم دەوێ.»

## 40

ژیانێکی خۆشمان بەسەربرد. مانگی کانوونی دووەم و شوباتمان لەوێ گوزەراند، زستانێکی خۆش بوو، ئێمەش بەختیاربووین. کاتێ بای گەرم هەڵیکرد شەختە بڕێ توایەوە و بەفریش خاو بووەوە و ئاو و بایەکەی دەتگوت هی بەهارە، بەڵام هەر کە سارد و تووشی گەڕایەوە زستانیش دەهاتەوە هەواران. لە خاکەلێوەدا (ئازار) زستان یەکەم کەلێنی تێکەوت. شەوان باران دەباری تا بەیانیش بەردەوام بوو، بەفرەکەی تواندەوە و کردیە لیتراو و بناری چیای بەجارێ بەرباد کرد، هەور سەر دەریاچە و دۆڵەکەی داپۆشتبوو، لەسەر چیاش باران بوو.

کاترین پێڵاوی چەرمەگای لە پێ کردبوو، منیش پۆتینی مستەر (گوتنگن)م لەپێ

کردبوو. بەپیاسە لەژێر چەترەوە بەناو گۆماوی بەفراو و ئاوی ڕۆیشتووی سەر زەوییەوە چووینە ئێستگە. ئاوەکە شەختەی سەر ڕێگاکانی لەگەڵ خۆی ڕادەماڵی و ڕێگاکانی ڕووت کردەوە. پێش نانی نیوەڕۆ لە مەیخانەیێ بۆ ڤێرمۆث خواردنەوە ڕاوەستاین، کە لە ژوورەوە بووین گوێمان لە خوڕەی باران بوو.

کاترین پرسی: «بەپێویستی دەزانی بچینە شار؟»

– «تۆ چۆنی بەباش دەزانی؟»

– «ئەگەر زستان بەسەربچێ و باران ڕێگەی دەرەوەمان نەدا، گوزەران لێرە ناخۆش نابێ؟ چەندت ماوە کاترینۆکەت ببێت؟»

– «نزیکەی مانگێ یا کەمێ پتر.»

– «ڕەنگە بچین لە (مۆنترۆکس) جێگیر بین.»

– «بۆچی نەچینە (لۆزانا) ئەوێ نەخۆشخانەی تیایە.»

– «ژیان لە شارێکی گەورەی وەکو لۆزانا وەک ئێرە تەنیایە بەڵام خۆشترە.»

– «کەی بڕۆین.»

– «گرینگ نییە هەر کەی بێ، ئازیزم، هەرکاتێ خۆت ویستت من نامەوێ ئێرە بەجێ بێڵین گەر تۆ مەبەستت نەبێ.»

– «با بزانین ئاووهەوا چی لێ دێ.»

سێ ڕۆژ لەسەر یەک باران باری. بەفری سەر چیاکەی لای ئێستگەکە هەمووی ڕەش بووەوە و هیچی بەسەرەوە نەما، ڕێگاکانیش لێشاوی بەفر و قوڕاویان بەسەردا دەڕۆیی، زەوی زۆر قوڕ و زێلاق بوو بەجۆرێ کە چوونەدەرەوە کارێکی ئاسان نەبوو. سبەینەی ڕۆژی سێیەمی بارانەکە بڕیارمان دا دابەزین و بۆ شار بەڕێکەوین.

گوتنگن گوتی:

– «زۆر باشە، هێنری، پێویست ناکا ئاگادارم بکەنەوە، باوەڕناکەم پاش ئەوە کەشەکەی وا دژوار بووە لێرە بمێنین.»

گوتم: «هەرچۆنێ بێ لەبەر حاڵی ئالۆزی خانم دەمانەوێ لە نزیک نەخۆشخانەیێ ئۆقرە بگرین.»

گوتی: «دەزانم، باشە ڕۆژێ دێ بەکۆرپەلەی ساواوە بگەڕێنەوە و لێرە بمێنین؟»

– «بەڵێ، گەر ژوورت هەبێ.»

– «لەبەهاردا کاتێ کەش خۆش بێ دەتوانن بێن بۆ خۆتان لێرە بەخۆشی گوزەران بکەن. با ساواکەتان لەگەڵ دایەنەکەی لەو ژوورە گەورەیە بن کە ئێستاکە داخراوە، تۆ و خانمیش هەر لە ژوورەکەی خۆتان بن کە دەڕوانێتە سەر دەریاچەکەوە.»

گوتم: «بۆ گەڕانەوە نامەت بۆ دەنووسم.»





شتەکانمان پێچایەوە، پاش ئەوەی فراوینمان خوارد سواری شەمەندەفەر بووین. مستەر گوتنگن خۆی و هاوسەرەکەی هاتنە خوارەوە تا ئێستگە لەگەڵمان هاتن. پڕوپیتاڵەکانمان لەسەر تاخوڕک دانا، بەناو بەفراودا ڕۆیشتین، لە تەنیشت ئێستگە لەبەر ڕێژنەی باران ڕاوەستان، بەدەست خواحافیزیان لێ کردین.

کاترین گوتی: «مرۆڤی چاکن.»

– «نەخوازەڵا لەگەڵ ئێمە.»

لە (مۆنترۆکس)ەوە سواری شەمەندەفەر بووین بۆ (لۆزانا). لە پەنجەرەکەوە سەیری ئەو خانووەمان کرد کە تیایدا دەژیاین بەڵام لەبەر چڕی هەور نەمانتوانی چیاکان بەدی بکەین. شەمەندەفەر لە (ڤیڤی) ڕاوەستا، دوایی لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو، بەدەریاچە و کێڵگە قاوەییە شێدارەکان و دارستانە ڕووتەکان و خانووە نمدارەکاندا تێپەڕین. گەیشتینە (لۆزانا)، لە ئوتێلێکی مام ناوەندی دابەزین، کە بەنێو شەقامەکاندا ڕۆیشتین تا گەیشتینە دەروازەی پەیتوونەکانی ئوتێلەکەوە، باران هەر دەباری، کە هاتینە ژوورەوە، دەرگەوان بەخۆی و بەکلیلێکی مسییەوە کە بەسەر یەخەی وەبوو، ڕاوەستابوو. بەرزکەرەوە و ئەو ڕایەخەی عەردی ئوتێلەکەی ڕووپۆش کردبوو و دەستشۆرێکی سپی بریقەداری قایم کراو و چوارپایەکی مسی گەورە و ژوورێکی گەورەی نووستن ئەمانە هەمووی بەڵگەی خۆشیمان بوون، پاش ئەوەی لە ماڵی (گوتنگن) دەرچووین. پەنجەرەی ژوورەکە بەسەر باخچەیەکی شێداریدا دەڕوانی کە بەدیوار دەورە درابوو، سەرەوەی دیوارەکە پەرژینێکی ئاسنی تێ گیرابوو. لەوبەری شەقامەکەوە کە لێژاییەکی ڕک بوو، ئوتێلێکی تر هەبوو کە دیوارێک و پەرژینێکی ئەو ئاسای لێ بوو. سەرم بەرزکردەوە ڕوانیمە دڵۆپە بارانی قەڵبەزەی باخچەکە.

کاترین گلۆپەکانی داگیرساند. جانتاکانی کردەوە دەستی بەشت کردنەوە کرد. منیش داوای ویسکی و سۆدەم کرد. لەسەر چوارپایەکە پاڵکەوتم. دەستم بەخوێندنەوەی ئەو ڕۆژنامەیە کرد کە لە ئێستگە کڕیبووم لە خاکەلێوەی (١٩١٨)دا هێرشی ئەڵمانیا بۆ سەر فەرەنسا دەستی پێکرد. ویسکی و سۆدەم خواردەوە، ڕۆژنامەم خوێندەوە. کاترین شتەکانی لەناو جانتاکاندا دەرهێنا و لە دەوری ژوورەکە سووڕایەوە. کاترین گوتی:

– «دەزانی چیم پێویستە؟»

– «چی؟»

– «جلوبەرگی مەلۆتکە. هیچ ئافرەتێ نییە بگاتە وەختی من و جلی مەلۆتکەی نەبێ.»

– «دەتوانی بیانکڕی.»

– «دەزانم. بەیانی دەچم دەیانکڕم. با بیر بکەمەوە بزانم چیم پێویستە.»

– «دەبێ بزانی چونکە خۆت ستەر بوویت.»

– «بەڵام ئەو سەربازانەی لە نەخۆشخانە منداڵیان دەبێ زۆر کەمن بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن.»

– «من یەکێکم لەوانە.»

بالیفێکی تێ گرتم، ویسکی و سۆدەکەی بەگۆڕێ وەرکرد و ڕژان.

کاترین: «داوای پێکی ترت بۆ دەکەم. ببوورە کە ئەوەم لێ ڕژاندی.»

– «زۆری تیا نەمابوو، وەرە سەر چوارپایەکە.»

– «نەخێر، نایێم، ئەو ژوورە ڕێک دەخەم. تا بە شتێ بچێ.»

– «بە چی بچێ؟»

– «بەماڵی خۆمان.»

– «ئاڵای سوێندخۆرەکانی لەسەر بەرز بکەوە.»

– «تۆ بێدەنگ بە.»

– «دووبارەی کەوە.»

– «بێدەنگ بە.»

– «زۆر بەئاگایی و وشیارییەوە ئەمەت گوت دەڵێی ناتەوێ کەس بریندار بکەی؟»

– «نەء، نامەوێ بەقسە کەس بریندار بکەم.»

– «کەوابێ وەرە سەر چوارپایەکەوە.»

– «باشە.»

هات لەسەر چوارپایەکە دانیشت و گوتی:

– «دەزانم گاڵتەجاڕی تۆ نیم، خۆشەویستم، بەڵام لە کەندوویەکی گەورەی ئارد دەکەم.»

– «نەخێر، تۆ وا نیت. تۆ جوان و ئێسک سووکی.»

– «من کەسێکی زۆر شڕوشپرێوم، تۆ منت خواستووە.»

– «نەخێر، وا نییە، ئێستا لە هەموو کاتێ جوانتری.»

– «بەڵام جارێکی تر باریک دەبمەوە، ئازیزم.»

– «ئێستا باریکی.»

– «زۆرت خواردۆتەوە.»

– «پێکێ سۆدە و ویسکیم خواردۆتەوە.»

– «پێکێکی تریش وا لە ڕێگایە، ئەوجا داوای خواردن دەکەین بیهێننە سەرەوە.»

– «شتی چاکە.»

– «ئەوجا ناچینە دەرەوە. دەچین؟ ئەمشەو دەبێ لێرە بمێنین.»





گوتم: «یاری دەکەین»

کاترین گوتی: «هەندێ مەی دەخۆمەوە، ئەوە ئازارم نادات. لەوانەیە بتوانین بڕێ کاپری، سپی جاران، پەیدا بکەین.»

گوتم: «بێ گومان، دەتوانین، ئوتێلێکی وا گەورە دەبێ مەی ئیتاڵییان هەبێ.»

خزمەتکارەکە لە دەرگای دا پەرداخێکی ویسکی بە بەفری هێناوە لە تەنیشت پەرداخەکە لەناو سنییێ بوتڵێ سۆدای بچووک هەبوو.

گوتم: «سوپاس، لێرەی دانێ، دەتوانی نانی دوو نەفەر و دوو بوتڵ کاپری سپی بەستیمان بۆ بهێنیە سەرەوە؟»

– «حەز دەکەن، خواردنەکە، شۆربای لەگەڵ بێ.»

– «کاترین شۆربات دەوێ؟»

– «گەر زەحمەت نەبێ.»

– «تەنیا نەفەرێ شۆربای لەگەڵ بێ.»

– «سوپاس گەورەم.»

ئەو چووە دەرەوە، دەرگای داخست، منیش هاتمە سەر ڕۆژنامە خوێندنەوە و دەنگوباسی شەڕم خوێندەوە. بەهێواشی سۆدەم بەسەر سەهۆڵی ناو ویسکییەکە داکرد، دەبوایە پێم گوتبایە سەهۆڵەکە لەناو ویسکییەکە دانەنێ، دەبوایە سەهۆڵەکەی بەتەنیا هێنابا، ئەو وەختە پیاو دەیزانی کە بڕێ ویسکی ناو پەرداخەکە چەندە، ئەوکات ئاوا لە پڕەوە بەسۆدە بەسەرداکردن سووک نەدەبۆوە. ئەو جارە بێ دەبێ قاپێ ویسکی داوا بکەم، داوایان لێ دەکەم سۆدە و سەهۆڵم بۆ بێنن. ئەمە بەجێیە. ویسکی شتێکی خۆشە، بەشێکە لە خۆشترین بەشی ژیان.

– «تۆ بیر لە چی دەکەیتەوە، خۆشەویستم؟»

– «لە ویسکی.»

– «لە چ بارێکەوە بیر لە ویسکی دەکەیتەوە؟»

– «لەبارەی خۆشی ویسکییەوە.»

کاترین ڕووێکی گاڵتەجاڕانەی بۆ نواند و گوتی: «با وابێ»

بۆ ماوەی سێ هەفتە لەم ئوتێلە ماینەوە، خراپ نەبوو، ژووری نانخواردن هەردەم چۆڵ بوو. زۆر جاران شەوان لە ژوورەکەی خۆمان نانمان دەخوارد. بەناو شاردا دەگەڕاین و بەڕێگەی شەمەندەفەری یایەیی گرنی گرنی بۆ (ئۆخی) دەچووین. لە تەنیشت دەریاچەکەدا پیاسەمان کرد، هەواکەی کەمێک گەرمتر بوو. لە هەوای بەهارانی دەکرد، خۆزگەمان دەخواست بگەڕێینەوە ناو چیاکان. بەڵام ئەم هەوایە بەهارییە تەنیا چەند ڕۆژێکی کەمی خایاند. پاش ئەوە هەوایەکی سارد و شێدار گەڕایەوە کە هیچ

جیاوازییەکی لەگەڵ زستانێکی کوشندە نەبوو.

کاترین شتی پێویستی بۆ منداڵەکە کڕی منیش چوومە یانە بۆ مەشقی جیمناستیکی و کۆڵەمستێن. هەموو بەیانیان، هەر کە کاترین تا درەنگ لەناو جێگەی دەمایەوە، دەچوومە یانە. مایەی خۆشی بوو، کە لە ڕۆژانی وا بەهاری بەشەقامەکاندا پیاسەت کردبا و لە چایخانەدا پشیەکت دابایێ و سەیری ئەو خەڵکەت کردبایە و ڕۆژنامەت بخوێندبایەوە و (ڤێرموث)ت بخواردبایەوە پاشان گەڕابایەوە ئوتێل و بۆ فراوین لەگەڵ کاترین دامەزرابای.

پرۆفیسۆری یانەی کۆڵەمستێن و جیمناستیک، سمێڵدار بوو، زۆر وردەکار و بەدیقەت و تووڕە و توند بوو. شێت دەبوو گەر لە دوای ئەو مەشقت کردبایە. بەڵام ئەو وەختەی لەوێم بەسەر برد وەختێکی خۆش بوو، هەوایەکی پاک و خاوێنی هەبوو ڕووناکییەکی چاکی لێ بوو، خۆم زۆر ماندوو کرد، تا توانیم بەسەر پەتدا پاز بدەم و لەبەرامبەر سێبەری خۆم لە ئاوێنەدا کۆڵەمستانێ بکەم، هەندێ مەشقی زگانەشم دەکرد. لەسەر زگ، لەسەر زەوی یانەکە لە بەرامبەر تیشکی خۆرەوە کە لە پەنجەرەی کراوەدا دەهاتە ژوورەوە، لێی ڕادەکشام جار بەجاریش لەکاتی بۆکسێندا پرۆفیسۆرم دەترساند. لەسەرەتادا نەمدەتوانی لە ئاوێنەیەکی گەورەی بەرتەسک لەگەڵ سێبەرم بۆکسێن بکەم، چونکە زۆر بەسەیرم دەزانی کە کۆڵەمستانێ لەگەڵ کابرایەکی ڕیشدار بکەم. لە کۆتاییدا ئەو ڕەفتارەم بەعەنتیکە دەهاتە بەرچاو. بڕیارم دا هەرکاتێ دەست بەمەشقکردن بکەم ڕیشەکەم بتاشم، بەڵام ئەوە بەدڵی کاترین نەبوو، ڕێگەی نەدام.

هەندێ جاریش من و کاترین سواری پەیتوون دەبووین و دەچووینە دەرەوەی شار، سواربوونی لە ڕۆژانی سایەقەدا زۆر خۆش بوو، هەر کاتێ سواری پەیتوون ببایین، دوو شوێنمان بۆ نانخواردن دەستنیشان دەکرد. کاترین توانای ڕۆیشتنی نەمابوو، بۆیە حەزم دەکرد بەپەیتوون لەگەڵیا بەڕێگاکانی دەرەوەدا بگەڕێم. ئەگەر ڕۆژەکانیشی خۆش بوایە ئێمەش کاتی چاکمان بەسەر دەبرد. هەرگیز کاتی ناخۆشمان نەبووە. دەمانزانی کاتی زگ دانانی نزیک بووتەوە، ئەمەش وای لە هەردووکمان کردبوو هەست بەوە بکەین وەک بلێی شتێک ڕاوەدوومان دەنێت، بۆیە نەدەبوو تاوێ پێکەوەبوونمان لەکیس بدەین.

## 41

بەیانییێ دەوروبەری سەعات سێ بەخەبەر هاتم گوێم لە خشەی کاترین بوو کە لەسەر چوارپایەکە دەجوولایەوە.

– «چ خێرتە کاترین؟»

– «بەرەژانم گرتووە، ئازیزم.»





– «بە بەردەوامییە؟»

– «نەخێر، دەم دەمە.»

– «ئەگەر ژانەکەت بە بەردەوامی بێ، دەبێ بچینە نەخۆشخانە.»

زۆرم خەو دەهات و لێکەوتمەوە خەو. پاش ماوەیەکی کەم دووبارە واگا هاتمەوە.

کاترین گوتی: «وا چاکە تەلەفۆن بۆ دکتۆر بکەی وا بزانم ژانەکە دەستی پێکردەوە.»

بۆ لای تەلەفۆن چووم، تەلەفۆنم بۆ دکتۆر کرد. دکتۆر پرسی:

– «ماوەی نێوان ژانەکان چەندە؟»

گوتی: «لەهەر چارەگە سەعاتێ جارێ.»

دکتۆرەکە گوتی:

– «کەوابێ دەبێ بچین بۆ نەخۆشخانە، منیش هەر ئێستا خۆم دەگۆڕم و یەکسەر دێم بۆ نەخۆشخانە.»

تەلەفۆنم بەرزکردەوە، بۆ گەراجەکەی نزیک ئێستگە تەلەفۆنم کرد، تاکو تاکسییەکمان بۆ ڕەوانە بکەن. بۆ ماوەیەکی تەواو کەس وەڵامی نەدایەوە لە دواییدا پیاوێ وەڵامی دامەوە و هەرێی دامێ هەر ئێستا تاکسییەکمان بۆ بنێرێ. کاترین جلی خۆی گۆڕی و جانتاکەشی پڕی ئەو شتانەکرد کە خۆی لە نەخۆشخانە پێویستی پێی دەبوو، لەگەڵ پێداویستی بەبەکە، لە دەرەوە لە هۆڵەکە زەنگم بۆ هێنانی بەرزکەرەوەکە لێدا، بەڵام وەڵام نەبوو، خۆم دابەزیمە خوارەوە، لە ئێشکگری شەو بترازێ کەس لە خوارەوە نەبوو. بەرزکەرەوەکەم سەرخست، جانتاکەی (کاترین)م لەناو دانا چووە ناویەوە. دابەزینە خوارەوە، ئێشکگر دەرگاکەی بۆ کردینەوە. لەسەر سەکۆیەکی بەردین لە تەنیشت پایەی خوارەوەی سەرەڕێی ئوتومبیل دانیشتین. چاوەڕێی تاکسی بووین، شەو ساماڵ بوو، ئەستێرەش دەدرەوشانەوە. کاترین زۆر شڵەژابوو.

گوتم: «خۆشحاڵم بەدەست پێکردنی ژانەکە، پاش ماوەیەکی کەم هەموو شتێ تەواو دەبێ و دەبڕێتەوە.»

– «تۆ کچێکی ئازا و بەجەرگی.»

– «باکم نییە. حەز دەکەم تاکسییەکە بێ.»

گوێمان لە هاژەی تاکسییەکە بوو، بەرەو سەرەوەی شەقامەکەوە دەهات. ڕووناکی گلۆپەکانی پێشەوەیمان بینی لەسەرە ڕێیەکە سووڕایەوە یارمەتی (کاترین)م دا تا سواری تاکسییەکە بێ، شوفێرەکەش جانتاکەی لە پێشەوە دانا.

گوتم: «بۆ نەخۆشخانە لێخوڕە.»

لە سەرەڕێیەکە دەرچووین بەسەرگردێ کەوتین. لە نەخۆشخانە، چووینە ژوورەوە و جانتاکەم هەڵگرت. ئافرەتێ لەسەر مێزێ دانیشتبوو، ناوی کاترین و تەمەن،

ناونیشان، خزم، ئاینی لە دەفتەرێ نووسی. کاترین گوتی هیچ ئاینێکی نییە، ئافرەتەکەش خەتێکی لەو بۆشاییییە دا کە لە دوای وشەی ئاینەوە بوو. خۆیشی بە (کاترین هێنری) لەقەڵەم دا.

ئافرەتەکە گوتی: «بۆ ژوورەکەت دەتبەمە سەرەوە.»

بە بەرزکەرەوەکە سەرکەوتین، ئافرەتەکە بەرزکەرەوەکەی وەستاند. ئێمەش هاتینە دەرەوە، بەدوای ئەو بە هۆڵەکەدا ڕۆیشتین. کاترین قۆڵمی توندگرت.

ئافرەتەکە گوتی: «ئەمە ژوورەکەیە، زەحمەت نەبێ جلەکانت لەبەرناکەیتەوە و ناچیتە ناو جێگەت؟ جلی شەویشی بۆ لەبەرکردن لێیە.»

کاترین: «جلی شەویم هەیە.»

ئافرەتەکە گوتی: «باشتر وایە ئەوە لەبەر بکەی.»

چوومە دەرەوە، لەسەر کورسی داڵانەکە دانیشتم. ئافرەتەکە لەبەر دەرگاوە گوتی: «ئێستا دەتوانی بێیتە ژوورەوە.»

کاترین لەسەر قەرەوێڵەیەکی بەرتەسک درێژ ببوو. جلێکی شەوی سادەی چوارگۆشەیی لەبەرکردبوو کەوا دیار بوو لە قوماشێکی ئەستوور هەڵبڕابێ. کاترین زەردەخەنەیەکی بۆ کردم.

گوتی: «ژانەکەی ئێستا باش بووە.»

ئافرەتەکە مەچەکی کاترینی گرتبوو ماوەی ژانەکەی بەسەعات دەژمارد.

کاترین گوتی: «ئەو ژانەیان توند بوو.»

لە سیمایدا تێبینی ئەو ژانەم کرد. لە ئافرەتەکەم پرسی:

– «دکتۆر لە کوێیە؟»

گوتی: «لە خوارەوە نووستووە، هەر کاتێ وای خوازت بێ دێت.»

هەروەها گوتی: «دەبێ شتێ بۆ خانم بکەم. زەحمەت نەبێ جارێکی تر ناچیتەوە دەرەوە؟!»

چوومە داڵانەکە، داڵانێکی ڕووت بوو، دوو پەنجەرە و چەند دەرگایەکی داخراو بەدرێژایی داڵانەکە هەبوون. بۆنی نەخۆشخانەی لێ دەهات. لەسەر کورسییەکە دانیشتم و چاوم بڕیبوونە زەوییەکە بۆ کاترین نزام دەکرد.

ئافرەتەکە گوتی: «دەتوانی بێیتە ژوورەوە.»

چوومە ژوورەوە کاترین گوتی:

– «چۆنی ئازیزم؟»

– «ئێستا چۆنی؟»

– «ئێستا ژانەکە لەسەریەک دەمگرێت.»





ڕووی گرژبوو پاشان زەردەخەنەیەکی گرت.

– «ئەو ژانە بەڕاستی بوو، سستەر گیان، دەتوانی جارێکی تر دەست لەسەر پشتم دابنێییەوە؟»

سستەرەکە گوتی: «گەر بەباشی دەزانی؟»

کاترین: «تۆ دوورکەوە، ئازیزم، بچۆ شتێ بخۆ. ئەم سستەرە دەڵێ لەوانەیە درێژە بکێشێ.»

سستەرەکە گوتی:

– «شتێکی ئاساییە زگی یەکەم درێژە دەکێشێت.»

کاترین: «تکایە بڕۆ دەرەوە شتێ بۆ خۆت بخۆ. من زۆر باشم.»

گوتم: «کەمێکی تر دەمێنمەوە.»

ژانەکە بەردەوامی وەرگرت، دوایی خاو بووەوە، کاترین زۆر شڵەژابوو هەر کاتێ ژانەکە بەهێز بووایە دەیگوت ئەوەیان باش بوو، هەر کاتێ ژانەکە بشکابا، بێ هیوا و تەریق دەبۆوە.

گوتی: «تۆ بڕۆ دەرەوە، وا بیر دەکەمەوە، تۆ وام لێ دەکەی شەرم لە خۆم بکەمەوە.»

ڕووی گرژبوو لەقسەکانی بەردەوام بوو:

– «ئەوەیان باشتربوو، دەمەوێ هاوسەرێکی باش بم ئەو منداڵەم بەبێ گەوجێتی ببێت. تکایە خۆشەویستم بڕۆ چاشت بخۆ، پاشان بگەڕێوە. لەبیرت ناکەم ئەو سستەرە لەگەڵم زۆر باشە.»

سستەرەکە گوتی: «هێشتا زۆری ماوە بۆ نانی بەیانی.»

– «کەوابوو، من دەڕۆم، خواحافیز، ئازیزم»

کاترین: «خواحافیز، خواردنێکی چاکیش بۆ من بێنە.»

لە سستەرەکەم پرسی: «لە کوێ نانی بەیانیم دەست دەکەوێت؟»

– «لە خوارەوەی شەقامەکە، لە مەیدان، کافتریایێ هەیە لەوانەیە ئێستا کرابێتەوە.»

تاریک و ڕوونی بەیانی دابوو، بەو شەقامە چۆڵ و هۆڵە چوومە خوارەوە. ڕێگەی کافتریام گرتەبەر، پەنجەرەکەی ڕووناک بوو. پێم نایە ژوورەوە لەبەر لەمپەرە تۆتیاییەکەی وەستام. پیاوێکی پیر پێکێ مەی سپی بۆ تێکردم و پارچەیێ (بڕێوشی)ی دامێ. بڕێوشەکە هی دوێنێ بوو مابووەوە، منیش لەناو مەیەکەم هەڵهێنا و خواردم، لە پاشان پەرداخێ قاوەشم خواردەوە. پیاوە پیرە لێی پرسیم:

– «بەو ناوەختییە لێرە چی دەکەی؟»

– «خێزانەکەم، لە نەخۆشخانەیە، ژانی گرتووە.»

– «ئاوا. بەخت یارت بێ.»

«پێکێکی ترم بدێ.»

ئەو پێکەی لە بوتڵێ تێکرد، کە لاری کردەوە کەمێ ڕژایە سەر لەمپەرە تۆتیاکە. ئەو پێکەم خواردەوە و پارەکەیم دا. هاتمە دەرەوە بەدرێژایی شەقامەکە تەنەکەی زبڵی فڕێدراوی بەر دەرگای ماڵەکان چاوەڕوانی زبڵ کێش بوون. سەگێ لووتی لەیەکێک لەو تەنەکانەوە دەژەند. بەسەگەکەم گوت:

– «تۆ چیت دەوێ؟»

تەماشای تەنەکەکەم کرد تا بزانم چی تیایە تا بۆی دەربهێنم، لەسەرەوە هیچ نەبوو، لە هەندێ ورتک و پرتکی زبڵ و گوڵی وشک بترازێ هیچی تری تیانەبوو.

گوتم: «سەگەکە، هیچی تیا نییە.»

سەگەکە لەشەقامەکە پەڕییەوە. بەپێپلکە سەرکەوتمە ئەو نهۆمەی (کاترین)ی تیابوو. لە داڵانەکە بەرەو ژوورەکە چووم لە دەرگام دا وەڵام نەبوو. دەرگاکەم کردەوە چۆڵ و هۆڵ بوو. لە جانتاکەی (کاترین)، کە لەسەر کورسیێ بوو، جلە شەوییەکەشی، کە بەئەڵقەیەکی سەر دیوارەکەوە هەڵواسرابوو، بترازێ هیچی تری تیا نەبوو. چوومە دەرەوە لە داڵانەکە چوومە خوارەوە بەدوای یەکێ دەگەڕام، سستەرەکەم بینی:

– «خانم هێنری لە کوێیە؟»

– «هەر ئێستا بردیانە ژووری منداڵبوون.»

– «ژووری منداڵبوون لە کوێیە؟»

– «نیشانت دەدەم»

بەهۆڵەکەیدا بردمە خوارەوە. دەرگای ژوورەکە کەمێ کرابووەوە، کاترین لەسەر مێزێ درێژ کرابوو بەقوماشێ داپۆشرابوو. سستەرەکە لەلایێ و دکتۆریش لەلایەکەی ترەوەی مێزەکەوە لە تەنیشت چەند ئەستەوانەیێ ڕاوەستابوون. دکتۆرەکە دەمامکێکی لاستیکی بەدەستەوەبوو، سۆندەیەکی پێوە بەسترابوو.

سستەر پێی گوتم:

– «جلێکت دەدەمێ لەبەری بکە، دەتوانی بەو جلە بچیتە ژوورەوە وەرە ئێرە زەحمەت نەبێ.»

کراسێکی سپی بەسەر داهێنام، لە پشتی ملەوە بەسنجاقێک بۆی بەستم.

گوتی: «ئێستا دەتوانی بچیتە ژوورەوە.»

چوومە ژوورەوە. کاترین بەدەنگێکی خەفەتبارەوە گوتی:

– «ڕۆژ باش، ئازیزم، هێشتا هیچم بەهیچ نەکردووە.»

دکتۆرەکە پرسی: «تۆ مستەر (هێنری)ت؟»





– «بەڵێ. چۆنی تێدەگەی دکتۆر؟»

– «باش دەبێ. هاتووینەتە ئێرە دەتوانین بەئاسانی گازی بدەینێ تا ئازاری کەم بکاتەوە.»

کاترین گوتی: «ئێستا گازم پێویستە.»

دکتۆر دەمامکە لاستیکییەکەی لەسەر دەموچاوی (کاترین) دانا زمانەکەی سووڕاند. تەماشای (کاترین)ی کرد بەقوولی و خێرایی هەناسەی دەدا. پاشان (کاترین) دەمامکەکەی دوورخستەوە ئەویش زمانەکەی گەڕاندەوە جێگەی خۆی.

کاترین گوتی: «ئەم ژانە زۆر بەتێن نەبوو، ماوەیێ لەمەوبەر ژانێکی بەتێنترم گرت. دکتۆر هەوڵی دا ئازارەکەی کەم بکاتەوە، وا نییە دکتۆر؟»

دەنگەکەی زۆر سەیر بوو، بەرز بۆوە، لە وتنی وشەی دکتۆر زەردەخەنەیەکی گرت.

کاترین گوتی: «دیسان گازم پێویستە.»

کاترین دەمامکەکەی هەڵگرت و لەسەر دەموچاوی خۆی دانا و خێرا هەناسەی دەدا. من کەمێ گوێم لە نووزەی بوو پاشان دەمامکەکەی لادا و زەردەخەنەیەکی گرت و گوتی:

– «ئەمەیان بەتێن بوو. زۆر بەتێن بوو، دڵگیر مەبە ئازیزم بڕۆ دەرەوە، بڕۆ چاشتێکی تر بخۆ.»

گوتم: «لێرە دەمێنێم.»

نزیکەی سەعات چواری بەیانی بوو چووینە نەخۆشخانە تا نیوەڕۆ کاترین هەر لە ژووری منداڵبوون مایەوە ژانەکەی جارێکی تر هێور بووەوە. زۆر ماندوو و شەکەت دیاربوو. بەڵام دڵخۆش بوو.

گوتی: «توانام نەما، ئازیزم، زۆر بەداخەوە لەو باوەڕەدا بووم کە زۆر بەئاسانی ئەو منداڵەم ببێ. وا یەکێکی تر...»

دەستی خۆی بۆ دەمامکەکە درێژکرد و لەسەر دەموچاوی خۆی دانایەوە، دکتۆریش زمانەکەی سووڕاند و سەیری (کاترین)ی کرد و چەندی بلێیی یەک و دوو ژانەکەی بەسەرچوو.

کاترین گوتی: «ئەمەیان چ نەبوو.» بەزەردەخەنەیەکەوە درێژەی پێدا و گوتی: «من شێت و شەیدای گازم، شتی چاکە.»

گوتم: «هەندێکی لێ دەبەینەوە ماڵەوە.»

کاترین بەخێرا گوتی: «ژانەکە گەڕایەوە.»

دکتۆر زمانەکەی سووڕاندەوە سەیری سەعاتەکەی خۆی کرد و لێم پرسی: «ماوەی نێوانی چەند بوو؟»

– «نزیکەی دەقەیێ.»

– «فراوینت ناخۆی؟»

دکتۆر گوتی: «ئێستا شتێ دەخۆم.»

کاترین گوتی: «دەبێ شتێ بخۆی، دکتۆر، ببووره، زۆر درێژەی داییێ. ئایا پیاوەکەم ناتوانێ بەم کاره هەڵبستێ و گازم بداتێ؟»

دکتۆر گوتی: «گەر ئارەزووت لێیه... زمانەکه دوو نمره بسووڕێنه»

گوتم: «تێگەیشتم»

لەسەر زمانەکه نیشانەییێ هەبوو بەدەسک دەسووڕا.

کاترین گوتی: «ئێستا گازم دەوێ.»

دەمامکەکەی لەسەر ڕووی خۆی دانایەوه، منیش زمانەکەیم دوو نمره سووڕاند، کاتێ کاترین دەمامکەکەی لادا منیش زمانەکەیم گەڕاندەوه جێگەی خۆی. دکتۆر له چاکەی خۆیەتی ڕێگەی منی داوه ئەو کاره بکەم.

کاترین دەستی لەمەچەکم دا و گوتی:

– «ئەوه تۆ بووی بەم کاره هەستای ئازیزم؟»

– «بەڵێ، من بووم.»

– «تۆ زۆر بەردڵی.»

لەبەر کاری گازەکه کەمێ سەرمەست ببوو.

دکتۆر گوتی: «له ژوورەکەی تەنیشتمان لەسەر سنییێ نان دەخۆم هەر تاوێ وای خواست دەتوانی بانگم بکەی.»

پاش بێنەک سەیرم کرد نانی دەخوارد، دوایی لێ ڕاکشابوو، جگەرەی دەکێشا. کاترین ماندووتر ببوو.

کاترین لێی پرسیم: «لەو باوەڕەی ئەو مندالّەم ببێت.»

– «بەڵێ، هەڵبەت دەتبێت.»

– «بەهەمـوو توانای خـۆم هەوڵ دەدەم ئەو زگـه دابنێم. بەڵام بێ سـووده. ئەوەتا هاتەوه، گازم بدێ.»

لەسەعات دوو چوومه دەرەوه.فراوینم خوارد، ژمارەیەکی کەم پیاو له کافتیریایەکه بوون. سەر و قاوه یا پەرداخێ (کریشیا) یا (مارک)یان لەبەردەم بوو. لەسەر مێزێ دانیشتم. له خزمەتچییەکەم پرسی:

– «دەتوانم نان بخۆم؟»

– «کاتی فراوین بەسەرچووه.»

– «له کاتی جەمێ بترازێ، چ کاتی تر شت پێشکەش ناکەن؟»





– «دەتوانی شۆکرۆت بخۆی.»

– «شۆکرۆت و بیرەم بۆ بێنه.»

– «سووک بێ یان خەست؟»

– «سووک بێ.»

خزمەتچییەکه قاپێ (ساوەرکرات)ی بۆ هێنام که گۆشتی بەرازی لەسەر بوو لەگەڵ باسترمه، که لەناو مەیەکی تیژی لەناو کەلەرەم خوساوی شاردرابووەوه. قاپه خواردنەکەم خوارد بیرەکەشم خواردەوه. زۆرم برسی بوو سەیری خەڵکەکەی سەر مێزەکانی ناو چایەخانەم کرد، لەسەر مێزێ کاغەزیان یاری دەکرد، دوو پیاوی تریش لەسەر مێزەکەی تەنیشتم قسەیان دەکرد و جگەرەیان دەکێشا. کافتریاکەش پڕ دووکەڵ ببوو. له پشت مێزه توتیاکەوه که بەیانی نانم خوارد، سێ کەسی لێ بوو، پیاوێکی پیر و، ژنێکی قەڵەوی ڕەشپۆش له تەنیشت کاونتەرەوه دانیشتبوو چاودێری ئەو شتانەی دەکرد که دەدرایه میوانەوه، لەگەڵ مندالّێکی بەروانکه لەبەر. له خۆمم پرسیار کرد ئاخۆ ئەم ئافرەته دەبێ چەند مندالّی هەبێ و مندالّەکانی به چ بچن.

کاتی قاپه (شۆکرات)ەکەم تەواوکرد، بەرەو نەخۆشخانه گەڕامەوه. ئێستا شەقامەکه هەموو پاک بوو، تەنەکه فڕێدراوەکانی تیا نەمابوو، ڕۆژەکەی هەوراوی بوو، بەڵام خۆر خەریک بوو له ژێر هەورەوه بەبەرزکەرەوەکه چوومه سەرەوه، له بەرزکەرەوەکه هاتمه دەرەوه، بەهۆڵەکه دابەزیمه خوار و بەرەو ژوورەکەی (کاترین) هەڵکشام، که کراسه سپییەکەم لێ بەجێ هێشتبوو. لەبەرم کرد و له پشت ملەوه گرێم دا، له ئاوێنەوه سەیری خۆمم کرد بەڕیشەکەوه خۆمم بەدکتۆرێکی ساختەچی دەهاته بەرچاو، بەهۆڵەکەوه بەرەو ژووری مندالّبوون ڕۆیشتم، دکتۆر دەرگاکەی داخستبوو له دەرگام دا، دەنگ نەبوو، بۆیه منیش دەسکی دەرگاکەم بادا و چوومه ژوورەوه، دکتۆر له تەک کاترین دانیشتبوو، سستەرەکەش لەلایەکی ژوورەکەوه بەشتی ترەوه خەریک بوو.

دکتۆر: «ئەوەتا پیاوەکەت.»

ـ «ئۆه، ئازیزم، دکتۆرێکی زۆر خانەدانم هەیه.»

کاترین بەدەنگێکی سەیرەوه وای گوت و بەردەوام بوو،– «چیرۆکێکی زۆر خۆشی بۆ گێڕامەوه، هەر کاتێ ژانەکەم گرتبێ هەوڵی داوه بەزووترین کات لەژانەکه ڕزگارم بکا، دکتۆرێکی خانەدانه، تۆ زۆر عەگیدی! دکتۆر.»

گوتم: «تۆ بێ هۆشی.»

کاترین گوتی: « گازم بدەرێ، گازم بدەرێ.»

دەمامکەکەی هەڵگرت و هەناسەیەکی کورت و قووڵی هەڵمژی، ئەوەش وای له کۆئەندامی هەناسەدانی کرد خرتەخرتی لێوه بێت. پاشان ئاهێکی درێژی کێشا و، دکتۆریش، دەستی چەپی درێژ کرد و دەمامکەکەی دوور خستەوه. کاترین بەدەنگێکی

پڕ لە کەسیاسییەوە گوتی: «ئەمەیان بەتێن بوو، من تازە نامرم، ئازیزم، لەوە چوومەتە دەرەوە کە بمرم. تۆ کەیفخۆش نی؟»

– «جارێکی تر ناگەڕێینەوە ئەم شوێنە.»

– «نامەوێ جارێکی تر بگەڕێمەوە ئێرە، هەرچەندە ناترسم. من نامرم، ئازیزم.»

دکتۆر گوتی:

ـ «ناشێ شتی وا بێ عەقلانە بکەی، تا مێردەکەت بەتەنیا بەجێ بهێڵی. تۆ نامری نا.»

کاترین: «ئۆه! نەخێر، نامرم، نامرم، گێلاتییە بمرم ئەوەتا ژان هات گازم بدەرێ.»

ماوەیەکی بەسەرچوو دکتۆر گوتی:

– «هێنری دەبێ بچیتە دەرەوە. بۆ ماوەیێ، دەمەوێ لێی بڕوانم.»

کاترین گوتی:

– «دەیەوێ بزانی چیم بە چی کردووە. پاشان دەتوانی بگەڕێیتەوە ئازیزم، ئەی ناتوانێ بگەڕێتەوە دکتۆر؟»

دکتۆر: –«بەڵێ، من پێی دەڵێم کەی بگەڕێتەوە.»

چوومە دەرەوە. بەهۆڵەکەدا تێپەڕیم، بۆ لای ئەو ژوورە چووم کە دوای منداڵبوون دەیبەنە ئەوێ. لەسەر کورسییێ دانیشتم تەماشای ژوورەکەم کرد. ڕۆژنامەیێ لەناو گیرفانم بوو، کە بۆ فراوین چووم لە ڕێگەی خۆمدا کڕیبووم، دەرم هێنا خوێندمەوە. دەرەوە تاریک ببوو، منیش گلۆپەکانم داگیرساند تا ڕۆژنامەکە بخوێنمەوە، پاش بێنەک لە خوێندنەوەی وەستام، گلۆپەکانم کوژاندەوە. تەماشای دەرەوەم کرد بەتەواوی تاریک ببوو. پرسیارم لەخۆم کرد، بۆچی دکتۆر بەدوایدا نەناردم، لەوانەیە وا باش بێ لەوێ دوور بم، ویستوویەتی کەمێ دوورکەومەوە. سەیری سەعاتم کرد، لە دڵی خۆمدا گوتم ئەگەر بۆ دە خولەکی تر لەدوام نەنێرێ یەکسەر خۆم دەچم.

(کاترین)ی هەژار و بێ کەس و خۆشەویستم بەهای ئەو شەوانەت دانەوە کە پێکەوە دەنووستین. ئەمە سەرەنجامی تەڵە و داوەکەیە. مرۆڤ ئەمە لە پاداشتی خۆشەویستی دەدوورێتەوە. سوپاس بۆ خوا بۆ ئەم گازە. هەر چۆنێ بێ بەر لەوەی ئەم سڕکەرە بدۆزنەوە دەبێ چی ڕوویدابێ؟ جاران کە ژانیان بگرتبایە، ئەوا دەکەوتنە بەردەم تەوژمێکی توندەوە. کاترین لە ڕۆژگاری زگپڕیدا کاتی خۆشی بەسەربرد. ئەو کات حاڵی وا شڕ نەبوو، بەدەگمەنیش نەخۆش دەکەوت. هەتا ئەم دواییە حاڵی وا شڕ و نارەحەت نەبوو، لە سەرەنجام هەر تووشی ئەمە بوو. مرۆڤ لە توانای نییە لە هەموو شتێ دەرباز بێ. دەربازبوون! ئەگەر بۆ پەنجا جاریش یەکترمان خوازتبا هەر وای بەسەر دەهات. چ دەبێ گەر بمرێ؟ نامرێ. ئافرەت لەم ڕۆژگارەدا بەمنداڵبوون ناچێ. مێردەکان هەموویان لەسەر ئەم ڕایەن. بەڵێ، بەڵام چ دەبێ گەر بمرێ؟ نامرێ، تەنیا کاتێکی ناخۆش بەسەر دەبات. زگی یەکەم هەر درێژە دەکێشێ. تەنیا کاتێکی ناخۆش و دژوار





بەسەر دەبات. پاش ڕزگاربوونی پێی دەڵێین بارێکی چەند نالەبار و سەختت بینی، کاترین پێیان دەڵێ: نا، زۆر سەخت و نالەبار نەبوو. بەڵام چ دەبێ گەر بمرێ؟ نامرێ. بەڵام چ دەبێ گەر بمرێ؟ پێت دەڵێم نامرێ. گێل مەبە. تەنیا حاڵی خراپە و بڕایەوە. سروشت ئەو دۆزەخەی بۆ سازداوە. ئەوە زگی یەکەمە، هەمیشە بەئازار و درێژخایەنە. بەڵێ چی دەبێ گەر بمرێ؟ نابێ بمرێت. بۆچی بمرێت؟ چ هەیە ببێتە هۆی مردنی؟ تەنیا منداڵێ لەدایک دەبێ کە بەرهەمی شەوە خۆشەکانی (میلانۆ)مانە. ئەو منداڵەیە ئارامی لێ بڕیوە. کە لەدایک دەبێ پەروەردەی دەکەین و لەچاوی خۆمانمان خۆشتر دەوێ. بەڵام چ دەبێ گەر بمرێ؟ نامرێ. تەندروستی زۆر باشە. بەڵام چ دەبێ گەر بمرێ؟ نامرێ. بەڵام گەر بمرێ؟ نامرێ. بەڵام گەر بمرێ؟ ها چۆنی تێدەگەی چ دەبێ گەر بمرێ؟

دکتۆر هاتە ژوورەوە.

– «دکتۆر ئیشەکە چۆن دەڕوات؟»

دکتۆر گوتی: «ناڕوات.»

– «مەبەستت چییە؟»

– «مەبەستم هەر ئەوەیە لێیم ڕوانی...»

ئەنجامی لێ ڕوانینەکەی بەدوورودرێژی پێ گوتم:

گوتی: «لەوکاتەوە چاوڕێی ئەنجامەکەمە. بەڵام کارەکە ناڕوات.»

– «تۆ چی پێشنیار دەکەی؟»

– «دوو ڕێگە هەن، یا ئەوەتا بە بەکارهێنانی ماشەی ڕاکێشان کە ئەمەش دەبێتە هۆی هەڵزڕاندنی لەش و مەترسیشی لەسەر منداڵەکە هەیە. وەیا زگ هەڵدڕین.»

– «نەشتەرگەری زگ هەڵدڕین چ مەترسییەکی هەیە؟ گەر بمرێ؟»

– «مەترسییەکەی لە لەدایکبوونێکی ئاسایی زیاتر نییە.»

– «تۆ خۆت پێی هەڵدەستی؟»

– «بەڵێ، پێویستم بەماوەی سەعاتێ هەیە، تا شتەکان و ئەو کەسانەی پێویستم پێیانە تەیاریان بکەم. لەوانەیە سەعاتێ کەمتر بخایێنێ.»

– «تۆ چ دەڵێی؟»

– «من نەشتەرگەری زگ هەڵدڕینم پێ باشترە. خۆم گەر هاوسەری خۆشم بوایە هەر ئەوەم بۆ دەکرد.»

– «کاریگەری پاشتری چی دەبێ؟»

– «کاریگەری پاشتری هیچ نابێ. تەنیا جێگەی دیار دەبێ.»

– «ترسی پیسبوونی لێ ناکرێ؟»

– «مەترسییەکەی وەکو مەترسی ڕاکێشان زۆر نییە.»

– «دەبێ شتێ بکەین. خانم (هێنری) تێنی تێدا نەماوە، هەرچەند زووتر

نەشتەرگەرییەکە بکەین، سەلامەتتر دەبێ.»

گوتم: «هەرچەندە پێت دەکرێ نەشتەرگەرییەکە زووتر بکە.»

دکتۆر: «دەچم رێ و شوێن دادەنێم.»

چوومە ژووری منداڵبوون. سستەرەکەی لەگەڵ بوو، کاترین لەسەر مێزێ درێژ کرابوو. بەچەرچەفێ داپۆشرابوو، لەژێریەوە گەورە دیاربوو. ڕەنگی گۆڕا بوو. ماندو و شەکەتی پێوە دیار بوو. کاترین پرسی:

– «پێت گوت، ئەو دەتوانێ نەشتەرگەرییەکە بکا؟»

– «بەڵێ.»

– «ئەی، وا باش نییە. پاش سەعاتێ هەموو شتێ تەواو دەبێ. زۆر ماندوو و شەکەتم. خەریکە لەت لەت بم، تکایە ئەم گازەم بدێ. کار ناکا. ئۆه، کار ناکا.»

– «هەناسەیەکی قووڵ هەڵکێشە.»

– «وا دەکەم. ئۆه، گاز نایێ چیتر نایێ، گاز نایێ.»

بە سستەرەکەم گوت:

– «ئەستەوانەیەکی تر بێنە.»

– «ئەمە ئەستوانەیەکی نوێیە.»

کاترین گوتی: «بێ عەقڵم، ئازیزم، بەڵام گاز نایێ.»

دەستی بەگریان کرد و گوتی:

– «ئۆه، هیوام وابوو بەبێ گیروگرفت لەم زگە ڕزگارم ببێ. هەرچییەکی لە توانامدا بوو کردم. ئێستاش خەریکە لەت لەت بم، گازم ناگاتێ، گەر بشمرم بەلامەوە گرینگ نییە. بەمەرجێ ژانەکە بوەستێ. ئەوەتا ژانم گرتەوە ئۆه، ئۆه، ئۆه.»

لەژێر دەمامکەوە هەناسەی دەدا. نووزە نووزی بوو.

گوتی: «گاز نایێ، گاز نایێ. کار ناکا، کار ناکا. گوێ مەدە من خۆشەویستم. تکایە مەگری، گوێ مەدە من تێنم تیا نەما. ئەی هەژاری شیرینم. منیش تۆم خۆشدەوێ جارێکی تر چاک دەبمەوە ئێستا چاک دەبمەوە. داخوا دەتوانن شتێکم بدەنێ؟ گەر دەتوانن تەنیا شتێکم بدەنێ؟»

– «وا دەکەم کار بکا تا دوا نمرە دەیکەمەوە.»

– «ئێستاکە بمدێ.»

تا دوا نمرە، زمانەکەم کردەوە، هەر کە هەناسەیەکی توند و قووڵی هەڵمژی دەستەکانی لەسەر دەمامکەکە خاوبوونەوە، گازەکەم گرتەوە دەمامکەکەم لابرد. واپێدەچوو لە ڕێگەیەکی دوور گەڕابێتەوە.

– «ئەمە باش بوو، خۆشەویستم. تۆ خەمخۆری منی.»

– «تۆش ئازا بە، چونکە ناتوانم هەر ئەوها بکەم لەوانەیە بتکوژێ.»





– «لەوە زیاتر نابم. ئازیزم، خەریکە تێکبشکێم، تێکیان شکاندم. تازە وا تێدەگەم.»

– «هەموو کەس، ئەو ژانە هەر دەبینێ.»

– «بەڵام ئەمەش زۆر زەحمەتە تا نەترەتێنێت، وازت لێ ناهێنێ.»

– «پاش سەعاتێ هەموو شتێ تەواو دەبێ.»

– «ئەی ئەمە کارێکی دڵگیر نییە؟ ئازیزم، نامرم، وا نییە؟»

– «نەخێر، پەیمانت دەدەمێ، تۆ نامری.»

– «چونکە من نامەوێ بمرم و تۆ بەجێ بهێڵم، بەڵام زۆر ئازار و ئەشکەنجە دەکێشم. وا هەست دەکەم بەرەو مردن دەچم.»

– «قسەی بێ مانا، هەموو ئافرەتێ ئازار هەر دەچێژێ.»

– «دەزانم، کاتێ دێ هەر دەمرم.»

– «تۆ ناتەوێ بمری. نامریت.»

– «بەڵام چی دەبێ گەر بمرم؟»

– «نایەڵم بمری.»

– «گازم بدێ، خێرا گازم بدێ.»

– «پاش ماوەیێ گوتی: «نامەوێ بمرم، نایەڵم بمرم.»

– «هەڵبەت، ناتەوێ.»

– «لەگەڵم دەمێنیتەوە؟»

– «نەک بۆ ئەوەی تەماشات بکەم.»

– «نەخێر، بۆ ئەوەی لەتەکم بی.»

– «مسۆگەر هەر دەبێ لەتەکت بم.»

– «تۆ خەمخۆری منی. گازم بدێ. با هەندێ زیاتر بێ، ئیش ناکا.»

منیش زمانەکەیم بۆ نمرە سێ، پاشان بۆ چوار سووڕاند، حەزم دەکرد دکتۆرەکە بگەڕێتەوە. لە دوو نمرە بەسەرەوەتر ترسم هەبوو، لەدواییدا دکتۆرێکی تازە هات، دوو سستەری لەگەڵ بوون، (کاترین)یان بۆ سەر دەستەبەرەیەکی پێچکەدار بەرزکردەوە و بۆ هۆڵەکە چووین. بەخێرایی و کتوپڕی دەستەبەرەکەیان بردە ناو بەرزکەرەوە، ئەوانەی لەناو بەرزکەرەوە بوون، دەبوایە خۆیان بدەنە لایێ تا جێگەی دەستەبەرەکە ببێتەوە. بەرزکەرەوەکە بەرز بووەوە پاشان دەرگاکە کرایەوە و هاتینە دەرەوە. لە هۆڵەکەوە لەگەڵ دەستەبەرەکەوە کە پێچکەی لاستیکی هەبوو، بەرەو ژووری نەشتەرگەری چوون. دکتۆرەکەم لەبەر کڵاو دەمامکەکەی نەناسییەوە. دکتۆرێکی تر و چەند سستەرێکی تری لێ بوو.

کاترین گوتی: «دەبێ شتێکم بدەنێ، دەبێ شتێکم بدەنێ، ئۆه، تکایە دکتۆر

کەمێکی پێویستم بدەنێ تا ژانەکەی سووکتر بێ.»

دکتۆرێ دەمامکەکەی لەسەر دەموچاوی کاترین دانا، منیش لە دەرگاکەوە سەیرم کرد، سەکۆیەکی سپی پرشنگداری نەشتەرگەریم بینی، سستەرێ پێی گوتم:

– «دەتوانی لە دەرگاکەی ترەوە بچیتە ژوورەوە و لەوێ دانیشی.»

چەند ئەسکەملێ لەپشت ڕایەڵەکە هەبوون، کە بەسەر مێزێکی سپی و ڕووناکییەکی دادەڕوانی. سەیری کاترینم کرد دەمامکەکەی لەسەر ڕوو بوو، کپ و بێدەنگ بوو. دەستەبەرەکەیان بۆ پێشەوە پاڵ نا، منیش خۆم وەرسووڕاند و دوورکەوتمەوە بەهۆڵەکەدا پیاسەم کرد. دوو سستەر بەپەلە بەرەو دەروازەی بانێژەکە ڕایان کرد.

یەکێکیان گوتی: «نەشتەرگەری زگ هەڵدڕینە. نەشتەرگەری زگ هەڵدڕین دەکەن.»

ئەوی تریان پێکەنی و گوتی:

– «بە وەخت گەیشتین. ئەی بەختمان باش نییە؟»

لەدەرگا چوونە ژوورێکەوە کە بۆ بانێژەکەوە دەچوو. سستەرێکی تریش هەر بەڕاکردن هات، گوتی: «لێرەوە بڕۆ ژوورەوە، بڕۆ ژوورەوە.»

– «لە دەرەوە دەوەستم»

بەپەلە خۆی لە ژوورەکە کوتا، منیش لە هۆڵەکەدا هاتووچووم، نەوێرام بچمە ژوورەوە. لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەم کرد، دەرەوە تاریک بوو، بەڵام بەسایەی ڕووناکی پەنجەرەکەوە بینیم باران دەباری. لەبنەبانی هۆڵەکەوە چوومە ژوورێکەوە سەیری پارچە کاغەزی سەر چەند بوتڵێکی ناو سندووقێکی شووشەییم کرد. پاشان هاتمە دەرەوە، لە هۆڵە چۆل و هۆڵەکە ڕاوەستام و سەیری دەرگای نەشتەرگەرییەکەم کرد.

دکتۆرێ هاتە دەرەوە. سستەرێکی بەدواوە بوو شتێکی لە نێو هەردوو لە پانی هەڵگرتبوو، لە کەروێشکێکی کەوڵکراوی دەکرد. بەپەلە لە ڕاڕەوەکە تێپەڕی و خۆی لە دەرگایەکی تر کرد. چوومە لای دەرگاکەوە، لە ژوورێ بوون، بینیم لە ژوورێ شتێ لە کۆرپە لەدایکبووەکە دەکەن. دکتۆر بەرزی دەکردەوە تا من بیبینم؟! لە پاش پانیانەوە بەرزی دەکردەوە شەپی لێ دەدا.

– «منداڵەکە سەلامەتە؟»

«جێگەی سەرسوڕمانە. پێنج کیلۆ قورس دەبێ.»

هەستم بۆی نەجوولا. هەروەک شتێ بێ هیچ پەیوەندی بەمنەوە نەبێ، سۆزی باوکایەتیم بۆی نەجوولا.

سستەرەکە لێی پرسیم: «ئایا تۆ بەکوڕەکەت سەربەرز نی؟»

ئەوان مەلۆتکەکەیان دەشوشت و لەناو شتێکیان دەپێچا، دەموچاو و دەستە ڕەشتاڵەییەکانیم بینی، بەڵام نەمبینی بجوولێ یا بگریێ. جارێکی تریش هەندێ شتی تری لە منداڵەکە کرد دکتۆرەکەش شێواو دیار بوو، منیش لەوەڵامدا گوتم:

– «نەخێر، ئەوەندەی نەمابوو دایکی بکوژێ.»





– «خۆ ئەوە تاوانی ئەم منداڵە نییە. ئەی تۆ کوڕت ناوێ؟»

– «نەخێر»

دکتۆرەکە لەگەڵ منداڵەکەوە خەریک بوو، لە پێیەکانییەوە هەڵیگرتبوو، شەپی لێ دەدا. تەماشای ئەوم نەکرد. لە هۆڵەکە چوومە دەرەوە ئێستا دەتوانم بچمە ژوورەوە، لە دەرگاوە چوومە ژوورەوە کەمێکیش لە بانێژەکەوە نزیک بوومەوە، ئەو سستەرانەی لەسەر ڕیزە کورسییەکە دانیشتبوون هێمایەکیان بۆ کردم تا بچمە لایان دانیشم بەڵام سەری ناڕەزامەندیم لەقاند. لە شوێنی خۆم هەموو شتێکم کرد بەڵام دکتۆر زۆر ماندوو دیار بوو.

– «تۆم بینی برینەکەت دەدوورییەوە. برینەکە زۆر گەورە دیاربوو.»

– «تۆ لەو باوەڕەی؟»

– «بەڵێ، ئایا جێی برینەکە سارێژ دەبێتەوە؟»

– «ئا، بەڵێ.»

پاش بێنێ دەستەبەرە پێچکەدارەکەیان هێنایە دەرەوە زۆر بەپەلە بەناو داڵانەکە تێیان پەڕاند. بەرەو بەرزکەرەوەیان برد، منیش بەتەنیشتییەوە ڕۆیشتم، (کاترین) ناڵەناڵی بوو. لە نهۆمی خوارەوە لە ژوورەکەیان دانایەوە. منیش لەسەر کورسیێ لە پێڵینگانی قەروێلەکەی دانیشتم، ژوورەکە سستەرێکی تیابوو. هەستامەوە لە تەنیشت قەرەوێڵەکە ڕاوەستام، ژوورەکە تاریک بوو. (کاترین) دەستی خۆی دەرهێنا و گوتی:

– «ڕۆژباش خۆشەویستم.»

دەنگەکەی زۆر کز و لاواز و ماندوو بوو.

– «ڕۆژ باش شیرینەکەم.»

سستەرەکە گوتی: «بێ دەنگ. قسە مەکە.»

– «کوڕێکی درێژی پانی ڕەشتاڵەیە.»

باشی دەبینی.

وا هاتە خەیاڵم کە کاترین مردووە، بەمردووان دەچوو. ئەو لا ڕوومەتەی کە لێم دیاربوو، ڕەنگی مردووانی پەڕیبووێ، لە خوارەوە لەژێر ڕووناکییەوە دکتۆرەکە ئەو برینە گەورە لێوار ئەستوورە لێککراوەی دەدوورییەوە کە بۆ نەشتەرگەری شەقیان کردبوو.

دکتۆرێکی تر کە دەمامکی دابوو، سرکەری دەدایێ دوو سستەری تر دەمامکی خۆیان دابوو شتیان دەدایە دەست دکتۆرەکان. دەقاودەق لە وێنەی لێ پێچانەوەی دەکرد. هەر لە سەرەتاوە کە تەماشام کرد لە خۆم ڕابینی بتوانم کە تاکۆتایی سەیری ئەو دیمەنە بکەم.

بەڵام بەوە کەیفخۆش بووم کە تەماشام نەکرد. لەو باوەڕەدا نەبووم کە بتوانم

تەماشایان بکەم زگی شەق بکەن. بەڵام لە دوورینەوەی سەیری ئەو لێوارە بەرزبووەم کرد کە لە برینەکە پەیدا ببوو، هەر کە دکتۆرەکە چاپووکانە دەی دووریییەوە دەتگوت تەقەڵی پینەدۆزانە. لەو کاتەی برینەکەیان دەدوورییەوە چوومە هۆڵەکە. دەهاتم و دەچووم پاش ماوەیێ دکتۆرەکە هاتە دەرەوە.

– «تەندروستی چۆنە؟»

– «زۆر باشە، تۆ تەماشای نەشتەرگەرییەکەت کرد؟»

– «سەلامەتە؟»

گوتم: «بەڵێ، زۆر باشە.»

بینیم سستەرەکە بەسەیرەوە تەماشای کردم.

کاترین: «زۆر ماندوو و هیلاکم. برینەکە خەریکە پارچە پارچەم بکا. تۆ زۆر باشی، ئازیزم؟»

– «زۆر باشم، قسە مەکە.»

کاترین: «تۆ خەمخۆری منی، من ئازارێکی زۆر سەختم کێشا. منداڵەکە بەچی دەچێ؟»

– «بە کەروێشکێکی کەوڵکراو کە دەموچاوی لۆچاوی پیرەمێردێکی هەیە.»

سستەرەکە گوتی:

– «دەبێ بچینە دەرەوە، نابێ خانم هێنری قسە بکا.»

گوتم: «دەچمە دەرەوە.»

– «بڕۆ شتێ بخۆ.»

(کاترین)م ماچ کرد، ڕووی بۆر و سیس و ماندوو دیار بوو. بەسستەرەکەم گوت: «دەتوانم قسەیەکت لەگەڵ بکەم؟»

لەگەڵم هاتە دالانەکە. کەمێ چوومە ئەوسەری دالانەکەوە.

– «منداڵەکە چییەتی؟»

– «نازانی؟»

– «نەخێر.»

– «بێ گیان بوو.»

– «مردبوو.»

– «نەیانتوانی هەناسەی پێ بدەن. پەتی ناوکی لە هەوکی ئالا بوو، یان شتێکی دی لێ هاتبوو.»

– «کەوابێ مردووە؟»

– «بەڵێ، بەڵام مخابن، منداڵێکی لە ڕادەبەدەر گەورەبوو، وامزانی دەزانی مردووە.»





– «نەخێر.» پاشان گوتم: «وا چاکە بگەڕێیتەوە لای خانم بوەستی.»

لەسەر کورسییێ لە پێش ئەو مێزە دانیشتم کە سستەرەکان ڕاپۆرتیان لێ هەڵدەواسی، لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەم کرد، لە باران بترازێ کە بەهۆی ڕووناکی گلۆپەکانی پەنجەرەکەوە دیار بوو، لەبەر تاریکی هیچی ترم نەدەدی. بڵێ ئەوها بوو، منداڵەکە مردبوو. هەر لەبەرئەوەش بوو دکتۆرەکە ئەوەندە ماندوو دیاربوو. بەڵام بۆچی لە ژوورەکە وایان لێ دەکرد؟ لەوانەیە لەو باوەڕەیە بن بتوانن هەناسەی پێ بدەن. من فڕم بەهیچ ئاینێکەوە نییە بەڵام دەبوایە لە ئاوی پیرۆزدا هەڵێنرابایە. بەڵام چی دەبوو گەر هەرگیز هەناسەی نەدابایە. هەناسەی نەداوە، هەرگیز نەژیاوە، تەنیا ئەو ماوەیە نەبێ کە لە سکی (کاترین)دا بوو. بەڵام لە هەفتەی دوایی، جوولەی نەمابوو لەوانەیە لەو ماوەیە خنکابێ. ئەی کۆرپەڵەی بێ دەسەڵات.

خۆزیا منیش وەکو تۆ خنکابام، نا، بەو هیوایە نیم، نابێ بۆ مردن بەپەلە بین. (کاترین) وا لەسەرەمەرگایە، ئاوات لە خۆت کرد، تۆش دەمریت، تۆ نەتدەزانی لەبەرچی بوو. هەرگیز ماوەت نەبوو فێری هیچ ببی، تۆیان فڕێدایە ناو ئەم دونیایە و یاساکانیان پێ گوتیت و بۆ یەکەم جار لە ڕێسا دەرچوونت تۆیان گرت و بەمردنیان شاد کردی، یا هەروەکو (ئایمۆ) لە خت و خۆڕایی کوشتیان یا تۆش وەکو ڕینالدی نەخۆشی ئاتەشەکیان تووش کردی. هەر چۆنێ بێ سەرەنجام تۆیان کوشت، تۆش دەبێ ئەوەت لەبەرچاو بێت. کەمێ چاوەڕوان بە نۆرەی تۆش دێ.

جارێکیان لەسەربازگە کۆلکەدارێکم خستە سەر ئاگرێ، کۆلکەدارەکە، پڕ مێروو بوو، کە دەستی بەگڕگرتن کرد مێرووەکان لە کۆلکەکە دەرپەڕین، یەکەم جار کە ئاگری لێ بەربوو بەرەو ناوەڕاست دەچوون کە دەسووتا، پاشان بەرەو دوا گەڕانەوە سەرەکەی تر، هەر کە ژمارەیەکی زۆر لەسەر کۆلکەکە خڕبوونەوە کەوتنە ناو ئاگرەکەوە، هەندێ ڕزگاریان بوو، لەشیان سووتا و پان بوونەوە، دەرپەڕین و نەیاندەزانی بۆ کوێ دەچوون. بەڵام زۆربەیان بەرەو ئاگرەکە دەچوون پاشان دەگەڕانەوە دواوە بۆ لای سەرە ساردەکەوە. پاشان لە کۆتاییدا دەکەوتنە ناو ئاگرەکەوە و دەسووتان. لە بیرمە ئەو کاتە وا بیرم کردەوە. ئەمە کۆتایی ئەم دونیایەیە. ئەمەش دەرفەتێکی مەزنی بۆ ڕەخساندم تا ببم بەڕزگارکەر و کۆلکەدارەکە هەڵگرم و فڕێی بدەمە جێگایەک، بەڵکو مێرووەکان لە کۆڵکەکە دەرچن و بێنە سەر زەوی. من هیچم نەکرد تەنیا قۆغەیێ ئاوم بەسەرداکرد، تا قۆغەکە بەتاڵ بێ و ویسکی تێبکەم بەرلەوەی ئاوی تێکەڵ بکەم، چاکم لەبیرە کە ئەم قۆغە ئاوەی بەکۆلکەکەم داکرد تەنیا هەڵمی لە مێرووەکان هەڵساند. ئێستا من لە دالانی نەخۆشخانە دانیشتووم چاوەڕێی بیستنی هەواڵی (کاترین)م سستەرەکە هەر نەهاتە دەرەوە. پاش بەینێ بەهێواشی دەرگاکەم کردەوە، سەرم بەژوورەکە داگرت، لەسەرەتاوە نەمتوانی ببینم، چونکە ڕووناکییەکی زۆر بەشەوق لە دالانەکە هەبوو، ژوورەکەش تاریک بوو. پاشان بینیم سستەرەکە لە تەنیشت قەرەوێڵەکەی (کاترین) دانیشتووە، (کاترین) سەری لەسەر بالیفەوەیە، لەژێر چەرچەفێ لێ ڕاکشاوە.

سستەرەکە دەستی لەسەر لێوەکانی دانا، دوایی هەستایە سەرپێ و هاتە لای دەرگاوە.

– «ئەرێ چۆنە؟»

گوتی:

– «زۆر باشە پێویستە بچی نانی شێوانت بخۆی و پاشان بگەڕێیتەوە.»

چوومە دالآنەکە لە پێبلکەکە دابەزیم، لە دەرگای نەخۆشخانە چوومە دەرەوە، لەبەر باران لەو شەقامە تاریکەوە ڕێگەی چایخانەم گرتەبەر. ڕووناکییەکی کز لە ژوورەوە هەبوو، خەڵکێکی زۆر لە دەوری مێزەکان دانیشتبوون. شوێنێکی چۆڵم نەکەوتە بەرچاو تا دانیشم. خزمەتچی هاتە لام چاکەت و شەپقە تەڕبووەکانمی وەرگرت و جێگایەکی نیشاندام، جێگایەکە لە پێش پیاوێکی بەتەمەن بوو، بیرەی دەخواردەوە ڕۆژنامەیەکی ئێوارەی دەخوێندەوە. خزمەتچییەکە هات. پرسیم نانی ئیمڕۆیان چییە؟

گوتی: «گۆشتی جوانەگای کولآو، بەڵام تەواو بوو نەماوە.»

– «چ هەیە بیخۆم؟»

– «گۆشتی بەراز لەگەڵ هێلکە. هێلکە لەگەڵ پەنیر، شکرۆت.»

گوتم: «نیوەڕۆش شکرۆتم خواردووە.»

– «ڕاستە، ڕاستە خۆ نیوەڕۆش شکرۆتت خوارد.»

کابرای خزمەتچی پیاوێکی کاملّ بوو، تەوقی سەری ڕووت ببووەوە، چەند داوە موویێکی بەسەرە لووسەکەیەوە وەمابوو. پیاوێکی ڕووخۆش بوو.

– «چیت فەرموو؟ گۆشتی بەراز و هێلکە یا هێلکە لەگەڵ پەنیر؟»

گوتم: «گۆشت و هێلکە، لەگەڵ بیرە.»

– «خەست بێ؟»

گوتم: «بەڵێ، مەیلەو، ڕوون.»

گوتی: «هاتەوە بیرم، تۆ ئەو نیوەڕۆیەش بیرەی مەیلە و ڕوونت خواردەوە.» گۆشت و هێلکەم خوارد و بیرەم خواردەوە. گۆشت و هێلکەکە لەناو قاپێکی خڕدا بوو. گۆشتەکە لەژێرەوە بوو، هێلکەکەش لەسەرەوە، زۆر گەرم بوو، لەگەڵ پارووی یەکەم فرێ بیرەم هەڵقوڕاند تاوەکو نێو دەمم ساردکەمەوە.

برسیم بوو. بەخزمەتچییەکەم گوت هەندێکی ترم بۆ بێنێ. چەند پێکێ بیرەم خواردەوە، هەرگیز بیرم نەدەکردەوە. بەڵام ڕۆژنامەی ئەو پیاوەی بەرامبەرمم خوێندەوە. هەواڵی شکانی بەریتانیای تیابوو. کاتێ پێیزانی پشتی ڕۆژنامەکە دەخوێنمەوە خێرا ڕۆژنامەکەی لوول دایەوە ویستم داوا لە خزمەتچییەکە بکەم ڕۆژنامەیەکم بۆ پەیدا بکا. بەڵام نەمدەتوانی هەموو هۆشمی بخەمە سەر.

چایخانەکە گەرم بوو، هەوای دەرەوەش تەواو نەبوو. زۆربەی خەڵکەکەی سەر مێزەکە یەکتریان دەناسی، یاری قوماری هەمە چەشن لەسەر مێزەکان بەڕێوە بوو. کابرای خزمەتچی بەهێنانی بیرە بۆ سەر مێزەکان خەریک بوو. دوو پیاو هاتنە ژوورەوە بەڵام





جێگەیان نەدۆزییەوە، لە بەرامبەر ئەو مێزەی من لەسەری دانیشتبووم بەپێوە ڕاوەستان. داوای بیرەی ترم کرد. تا ئێستا مەیلی بەجێهێشتنم نەبوو، هێشتا زووە بگەڕێمەوە نەخۆشخانە، هەوڵم دا بیرنەکەمەوە و بەتەواوی بێدەنگ بم. پیاوەکان هەر بەپێوە وەستابوون. کەس بۆیان هەڵنەستا، بۆیە چوونە دەرەوە، بیرەی ترم خواردەوە. ئێستا کۆمەڵێ قاپی فەخفووری لەسەر مێزەکەی بەرامبەرم گردبۆتەوە. پیاوەکەی بەرامبەرم چاویلکەکانی لە چاوکردنەوە، لەناو بەرگەکەی دانایەوە خستییە گیرفانییەوە پێکی خۆی هەڵگرت و سەیری دەرەوەی کرد لەناکاو هەستم کرد دەبێ بگەڕێمەوە، بانگی خزمەتچییەکەم کرد، پارەی شتەکانم دایێ، شەپقەکەم لەسەر نا و چوومە دەرەوە، لەژێر باراندا گەڕامەوە نەخۆشخانە. لەنهۆمی سەرەوە چاوم بەسستەرەکە کەوت. دادەبەزی گوتی:

– «ئێستا تەلەفۆنم بۆ کردی.»

وای گوت و شتێ کەوتە دڵمەوە.

– «خێر، چ قەوماوە؟»

– «خانم هێنری تووشی خوێن بەربوون بووە.»

– «دەتوانم بچمە ژوورەوە؟»

– «نەخێر، ئێستا دکتۆری لایە.»

– «جێی مەترسییە؟»

– «زۆر مەترسی لێ دەکرێ.»

سستەرەکە چووە ژوورەوە دەرگاکەی داخست. لە دەرەوە لە دالآنەکە دانیشتم. هەموو شتێکم بەمێشکدا دەخولایەوە. توانام نەبوو بیر بکەمەوە. زانیم بەرەو مردن دەچێ، نزام دەکرد تا نەمرێ، نەهێڵێ بمرێ، ئۆ، خوایە، تکایە با نەمرێ. لە ڕاست سەرم پێوە نییە. هەرچییەکی داوا بکەی ئەنجامی دەدەم، تەنیا ئەو نەمرێ. تکایە، تکایە، تکایە، ئەی خوایە مەهێڵە بمرێ، تکایە خوایە وا بکە ئەو نەمرێ، گەر ئەو نەمرێ، هەرچییەکی داوام لێ بکەی، بۆتی ئەنجام دەدەم. منداڵەکەت بۆ بارەگای خۆت بردەوە. بەڵام وا بکە ئەو نەمرێ. مردن هەقە بەڵام ئەو نەمرێ. تکایە، تکایە خوای گەورە مەهێڵە بمرێ.

سستەرەکە دەرگای کردەوە بەپەنجەکانی هێمایەکی بۆ کردم تا بچمە ژوورەوە. بەدوایدا چوومە ژوورەوە کە چوومە ژوورەوە (کاترین) چاوی بەرز نەکردنەوە، چوومە تەنیشت جێگاکەی. دکتۆریش لە تەنیشتەکەی بەرامبەرم ڕاوەستابوو (کاترین) سەیری منی کرد و زەردەخەنەیەکی گرت. منیش خۆم داهێنایە سەر قەرەوێڵەکەی و دەستم بەگریان کرد. (کاترین) بەدەنگێکی نزم گوتی:

– «ئەی ئازیزی کەساسم.»

ڕەنگی مردووانی پەڕیبووێ.

گوتم: «تۆ زۆر باشی، (کات) ئێستا چاک دەبیتەوە.»

گوتی: «دەمرم.» کەمێ چاوەڕوانی کرد دوایی گوتی: «ڕقم لە مردنە.»

دەستیم گرت، گوتی: «دەستم لێ مەدە.»

ئەو وای گوت و، منیش دەستیم بەردا. زەردەخەنەیەکی گرت، گوتی: «ئەی ئازیزی هەژارم، هەرکاتێ بتەوێ دەتوانی دەستم لێ بدەی.»

– «چاک دەبیتەوە، (کات)، دەزانم چاک دەبیتەوە.»

ویستم نامەیەکت بۆ بنووسم، لە ترسی ئەوەی شتێ ڕووبدا، بەڵام نەمنووسی.»

– «دەتەوێ قەشە یا هەر کەسێ بانگ بکەم، تا بتبینێ؟»

گوتی: «تەنیا تۆم دەوێ، باکم نییە، ڕقم لە مردنە.»

دکتۆر گوتی: «نابێ ئەوەندە زۆر قسە بکەی.»

گوتی: «زۆر باشە.»

– «چیت دەوێ بیکەم کاترین؟ هەرڵ شتێ بتەوێ دەتوانم پەیدای بکەم.»

کاترین زەردەخەنەیەکی گرت و گوتی: «نەخێر.»

پاشان گوتی: «ئەوەی لەگەڵ منت کرد لەگەڵ کچی تریشی ناکەی؟ یان هەمان قسەیان لەگەڵ دەکەی، وایە؟»

– «هەرگیز وا نییە.»

– «دەمەوێ لەگەڵ کچانی تریش وا بکەی.»

– «من نامەوێ.»

دکتۆر گوتی:

– «ئێوە زۆر قسە دەکەن پێویستە، (هێنری)، بچیتە دەرەوە. پاشان دەتوانی بێیتە ژوورەوە. تۆ نامری خۆت گێل مەکە.»

کاترین گوتی:

– «زۆر چاکە، بەم زووانە، دێمەوە شەوان لەگەڵت دەمینێمەوە.»

زۆر بەزەحمەت دەیتوانی قسە بکا.

دکتۆر گوتی: «تکایە بڕۆ دەرەوە.»

کاترین چاوێکی لێ قووچاندم، دەموچاوی ڕەنگی مردووانی پەڕیبووێ.

گوتم: «وا دەچمە دەرەوە.»

کاترین: «نیگەران مەبە، ئازیزم، تۆزقاڵێ باکم نییە، ئەمە تەنیا فێڵێکی چەپەڵە.»

– «تۆی خۆشەویست و ئازیزم.»

لە دالانەکەوە زۆرم چاوەڕوان کرد، سستەرەکە هاتە لای دەرگا و هاتە لام و گوتی:

– «خانم (هێنری) حاڵی شڕە، زۆری لێ دەترسم.»

– «مرد؟!»





– «نەخێر، بەڵام لە هۆش خۆی چووە.»

لەوە دەچوو سەرلەنوێ خوێنی بەربووبێتەوە. نەیان دەتوانی ڕایبگرن. چوومە ژوورەوە لە تەکی وەستام تا گیانی دەرچوو.

ماوەیێ بێ هۆش مایەوە، زۆری نەخایاند گیانی سپارد. لە دەرەوە لە دالانەکە قسەم لەگەڵ دکتۆرەکە کرد:

– «هیچ شتێ هەیە ئەمشەو بیکەم؟»

– «نەخێر، هیچ نییە. بتگەیێنمە ئوتێلەکەت؟»

– «نەخێر، سوپاس. کەمێ لێرە دەمێنێم.»

– «دەزانی هیچ نییە بگوترێ، ناتوانم پێت بڵێم...»

گوتم:

– «نەخێر، سوپاس.»

– «ئەمە تاکە ڕێگەیێ بوو ئەنجام بدرێ. نەشتەرگەرییەکە وا دەرچوو کە...»

گوتم: «نامەوێ لەمەڕ ئەوەوە قسە بکەم.»

گوتی: «حەز دەکەم بتگەیێنمە ئوتێلەکەت.»

– «نەخێر سوپاست دەکەم.»

ئەو لە دالانەکە چووە خوارێ، منیش بەرەو دەرگای ژوورەکە چووم.

سستەرەکە گوتی:

– «ئێستا ناتوانی بێیتە ژوورەوە.»

گوتم: «بەڵێ، دەتوانم.»

– «ئێستا حەقی ئەوەت نییە پێ بنێیتە ژوورەوە.»

گوتم: «تۆ بڕۆ دەرەوە!، هەروەها سستەرەکەی تریش دەبێ بچێتە دەرەوە!»

پاش ئەوەی ئەوانم دەرکردە دەرەوە، دەرگاکەم داخست و گڵۆپەکانم کوژاندەوە. تازە داد نادا و هیچ سوودی نەمابوو وەکو ماڵئاوایی لە پەیکەرێ بکەی وابوو. پاش ماوەیێ هاتمە دەرەوە و نەخۆشخانەم بەجێهێشت و لەژێر باران بۆ ئوتێلەکە گەڕامەوە.

کۆتایی

## ناوی هەندێ لە کەسایەتییەکان

١- فریدریک هێنری: ئەفسەر. داوتەڵەب لەخاچی سوور. کوڕە پاڵەوانی ڕۆمان. ئەمریکییە.
٢- کاثرین بارکلی: سستەر. کچە پاڵەوانی ڕۆمان. بەریتانییە.
٣- هێلین فێرگسۆن: سکۆتلەندی. سستەر.
٤- گاج. سستەر.
٥- وۆکەر. سستەر.
٦- ڤان کامپن. سستەر.
٧- ڕینالدی: نژدار. هاوڕێی هێنری.
٨- بارتۆ لیمو: شوفێری فریاگوزاری. بەگوللەیەکی لابەلا دەکوژرێ.
٩- ئالدۆ بۆنیلۆ: شوفێری فریاگوزاری. سوسیالست خواز. لەکاتی کشانەوە خۆی دەدا بەدەست دوژمنەوە.
١٠- لووگی پیانی: شوفێری فریاگوزاری. سوسیالست خواز. هاوڕێی بۆنیلۆ.
١١- فرانکۆ گوردینی: شوفێر.
١٢- پاسینی: شوفێری فریاگوزاری لەکاتی بۆردومان دەکوژرێ.
١٣- گافۆزی: فیتەر (میکانیک).
١٤- مانێرا: فیتەر (میکانیک).
١٥- قەشە: داوتەڵەب لەخاچی سوور. ئیتاڵی. هاوڕێی هێنری و ڕینالدییە.
١٦- ڕالف سیمۆنز: گۆرانیبێژ. هاوڕێی هێنری. هێنری لەکاتی ڕاکردنیدا جلە مەدەنییەکانی ئەو لەبەر دەکا.

## ناوی هەندێ لە مەیەکانی ڕۆمانەکە

١- ئاستی
٢- ستریگا
٣- گراپا
٤- ئێک نۆگ
٥- ڕم
٦- شێری
٧- ڤێرمۆث
٨- ماربینی
٩- سیزانۆ
١٠- شانتی (چانتی)
١١- مێش
١٢- چیلکە (فریزا)
١٣- کاپری
١٤- مارگاوکس
١٥- باربیرا





## فەرهەنگۆک

### ئ

ئافتاوە: مەسینە
ئاتەشەک: نەخۆشی سفلس
ئامێرساز: میکانیک، فیتەر
ئاوزە: هاوزە، هاوتەمەن
ئاوە تەماتە: دۆشاوی تەماتە
ئێرەیی: حەسوودی
ئەنشۆفی: جۆرە ماسییەکە
ئەوئاسا: هەمان بابەت

### ب

باڵیۆز: سەفیر (سفیر)
بزگوڕ: جلوبەرگ و کەلوپەلی بێ کەڵکی مرۆڤ
بەردان: بەرەڵاکردن، ئازادکردن
بەرزکەرەوە: ئەسانسێر؛ مەسعەد (مصعد)
بەگۆڕێ وەرکردن: ڕژاندن
بەروانکە: بەرکۆشە
بەرەژان: ژانی بەر منداڵبوون
بەینێک: ماوەیەک
بیمەکاری: تأمین

### پ

پاڵەوانە: خەرپشتی دیوار، ئەو کۆڵەگەیەی لە تەنیشت دیواری لار دروست دەکرێ تا نەڕمێ.
پردی کەڵەک: پردەگەمی، ئەو پردەی کە لە ژمارەیێ گەمی دروست دەکرێ، بەشێوەیەکی کاتی، تاوەکو ئوتومبیل وەیا شتی تر بەسەردا تێپەڕ ببێت، بەتایبەتی لەکاتی شەڕ.
پشی: سانەوە، ماندووحەسانەوە، پشوودان.
پفکە: بلۆق، تلۆق
پێبلکە: پەیژە، قادرمە
پێڵاوی چەرمەگا: جۆرە پێڵاوێکی تایبەتییە لەناو بەفر و بەفراودا لە پێ دەکرێ.
پێ لێ هەڵبڕین: زۆر خوودان بە شتێک

### ت

تاخوڕک: جۆرە گالیسکەیەکی تایبەتی سەر بەفرە.
تاڵی سوور: خەتە داوی سوور.
تووج: مەفرەق، جۆرە کانزایەکی زەردە.
تەڕاتێن: غارغارێن.
تەزی: زۆر سارد.

تەک: تەنیشت
تەڵەزم: پرووشکی بۆمبا و کومپارە
تێنیتە: تێنیتا، ئەفسەر

ج

جل و بزگوڕ: پرۆپیتاڵ
جەنجاڵ: قەڵەباڵغ
جۆکی: ئەسپ سواری غارغارێن

چ

چاشت: نانی پاش بەیانی
چاوو: وشەیەکی ئیتاڵییە واتە خواحافیز
چەپارەدان: ڕزگاربوون
چێشتانان: کاتی چێشتەنگاو

ح

حەوت خەو: خەوێکی خۆش

خ

خۆت بەردەوە: خۆت فڕێدە
خوانچە: سنی، خوان
خوناو: شەونم
خەناوکە: ملوانکە

د

دانووساندن: خۆ ماتکردن بۆ گوێگرتن لە قسە
دایسابوو: داگیرسابوو
داوتەڵەب: (متطوع)
دژون: چڵکن
دکرێکی چاکیان...: کارێکی خراپیان...
دڵارا: خۆش و دڵکەرەوە
دڵڕفێن: دڵفرێن، دڵگر، بەرچاو
دڵەڕاوکێ: دوودڵی
دۆلاخ: بەلەک پێچ
دەردەکۆپان: تیتانۆس
دەستبەڵگە: مستمسک، دەستاوێژ

ز

زگ هەڵدڕین: نەشتەرگەری قەیسەری. ئەم نەشتەرگەرییە بۆ ئەو ئافرەتە دەکرێ کە منداڵەکەیان بەشێوەیەکی سروشتی نابێ. ترسی مردن لەم نەشتەرگەرییە گەلێ بەرزە.
زێلاق: چڵپاو





زەوی قڵیشا: فەرتەنە قەوما

س

ساپیتە: بنمێچ
ساختمان: خانووبەرەی گەورە و بەرز
ساماڵ: سایەقە
ساردی لێ دەڕژا: زۆر ساردبوو
ساوێنە: سێبەرە وێنە، ئەم جۆرە وێنەیە کە شێوەی مرۆڤ لەسەر کاغەز (بەزۆری کاغەزی ڕەش) بەمقەس دروست دەکرێ. سلیۆت
ستووڵ: کورسی بێ پشت
سۆزانی: ئافرەتی داوێن پیس، تیاترۆ، قەحپە
سۆزەنەک: (سیلان)، جۆرە نەخۆشییەکی کێماوییە تووشی زایەندام دەبێ.
سی قورینگ: جۆرە باڵندەیەکە، لەمراوی دەچێ.
سێ لەسەر: باڵندەیەکی ئاوییە.
سەرتۆپ: سەر لووتکە، سەرپۆپ
سەربازی تایبەتی: قوات خاصة
سەرشۆرک: حەمامی ماڵ
سەرلەبەر: بەردەوام
سەرمەست: سەرخۆش
سەریان دەکرد: نیشانەیان نەدەپێکا
سەیوان: چەتر

ش

شابەندەر: قنصل
شاش: (لەفاف)ی برین پێچان
شاقاو: شەقاو، هەنگاو، پێنگاڤ
شڵەژان: خورپە، صدمة
شووڵک: لقەداری تەڕ و ناسک و باریک
شەوی: کراسی شەو (هی ئافرەت)
شەتەکدەر: ئامێرێکە لە قوماش یا لە پەتک دروست بکرێ بۆ ڕاگرتنی خوێن.
شێو: شیو، نانی ئێوارە.

غ

غارغارێنێ سەر بەربەستان: سباق حواجز الخيل

ف

فراوین: فرەوین. نانی نیوەڕۆ؛ فراڤین

ق

قـان: لە خت و خـۆڕایی پێـدانی چەند خـاڵ بەکـەسێ لە یاریدا بۆ ئەوەی وەستـایی خـۆت بسەلمێنیت.

قەرەبینا: جۆرە تفەنگێکە
پۆلیسی قەرەبینا: ئەو سەربازانەی ئەم جۆرە تفەنگە هەڵبگرن بۆ مەبەستی هێمنی وەکو (انضباط العسکري) لای خۆمان.
قەعدە: لەجیاتی Panbed بەکارهاتووە. ئەو قوتووەی لە نەخۆشخانە لەژێر نەخۆش دادەندرێ بۆ میزکردن یا پیسایی کردن.
قەڵبەزە: نافوورە
قەوێدە: ئەو ئافرەتەی کۆمەڵێک سۆزانی (قەحپە)ی لەبەر دەستدایە، بۆ مەبەستی بێ ڕەوشتی.

**ک**

کڕ: بێدەنگ و خامۆش
کریسمس: جەژنی لەدایکبوونی عیسا
کلاوکورە: سۆفەقیتە. جۆرە باڵندەیەکە
کوڵم: ڕوومەت
کلۆت: کلێنجە
کوزکێشی: مەرایی
کو١٤٣میارە: بۆمب، گوللە تۆپ، (قنبلە)
کوێندەر: کوێ؟
کەپوو: لووت
کەچە: شتی خراپ
کەتە: چوارشانە
کەڵەباب: کەڵەشێر، دیکڵ
کیانتی: شیانتی، جۆرە شەرابێکە
کێها: کامە

**گ**

گڕنی گڕنی: گرنج گرنج و ددانەدار
گۆپاڵ: گۆچان
گونک: قۆڕ
گەوڕ: جێگای ئاژەڵ تیا حەوانەوە
گوێ ڕادێران: گوێ ڕاگرتن لەقسە بەتایبەتی بەسەرخەوەوە.
گوێیان سووکتر دەکا: وا دەکا زووتر گوێیان لە شت بێ

**ل**

لوولاق: خوارەوەی قاچ
لە خت و خۆڕایی: بێ هۆ
لایدە: غەریب، بیانی
لاتریزە: لاقوون، لاڕان

**م**

مگێز: ئارەزوو





مێردمنداڵ: کوڕێکی تازەلاو
مێرگوزار: باغ و باغات
مەلۆتکە: ساوای تازە لەدایکبوو
مۆڵەت: مادۆن، ئیجازە

**ن**

نژدار: جەراح
نەردەبان: پێبلکە (لە دار دروست کرابێ)
نەفڕەجا: گەورە

**و**

ویستریا: جۆرە دەوەنێکی خۆ هەڵواسە
وێندەر: ئەوێ
وێستگا: مستودع

**ه**

هەڵزووپاو: هەلاوساو
هەڵزڕاندن: دڕاندن
هێروە: بەرەوپێش
هەژک و بژاڵ: شولکە و چیلکە
هەڵەمووت: بەرز و دژوار
هەوک: گەروو
هەوکردن: التهاب

**ی**

یەک بەر: یەک لا، یەک ڕێ، یەک ساید